# هەولێر

**١٣**
**کۆتایی**
**٢٠٠١**

وەرزە گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی
سەربەخۆیە





وێنە: سەمیر ساڵح

هەولێری ئەمڕۆ

# هەولێر

وەرزە گۆڤارێکی رۆشنبیری سەربەخۆیە

* زنجیرە بابەتەکان پەیوەستە بەدەرهێنانی هونەریی گۆڤارەکە
* ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە، دەربڕی بیروڕای نووسەرەکانیانن.


خاوەن
فرەنسۆ هەریری

سەرنووسەر
فەیسەل دەبباغ

بەڕێوەبەری نووسین
فوئاد سدیق

# لەم ژمارەیەدا


| | | |
|---|---|---|
| بارزانی دە بیرەوەرییەکانی (پاول سودوپلاتف)دا | ئەحمەد شەریفی | ل٥ |
| گەلەکۆییکردن لەزانستییەك بەلگەی بێهێزیو | عەبدولخالیق سەرسام | ل١٤ |
| ئەگەر ڕێکبکەوێت حەزدەکەم لەهەولێر | محەمەد خدر مەولود | ل٤٥ |
| جوولەکەکانی ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر | هوشیار عەبدوڵلا | ل٥٩ |
| خۆگریی قەڵاتی هەولێر لەمێژوودا | د.محسین محەمەد | ل٦٦ |
| دارەبەنو مەدرەسەی فەقێیان | فاتیح دارەبەنی | ل٨٩ |
| شاعیرو ڕەچەلەکناس ناسح حەیدەری | نەزیرە حەویز سالح | ل٩٨ |
| هۆکارەکانی گەشانەوەی ژیانی زانستی | ئومێد جۆزەلی | ل١١٠ |
| کۆمەلگای سیبیرانو جیهانی کولتوور | عەباس سلێمان سمایل | ل١٢٥ |
| [redacted] | [redacted] | ل١٣٣ |
| هەولێری لەسەردەمی زێڕینیدا | سلێوە جەننا | ل١٤٠ |
| هەولێری دێرین لەنێوان تایبەتمەندیو | مەسعود پەرێشان | ل١٤٥ |
| (عەلی کۆر) مەلودخوێنو مەقامزان | جەلال خدر | ل١٥١ |
| هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا | خ/گۆڤاری هەولێر | ل١٥٧ |
| هەولێر لەیادەوەری گەڕیدەکاندا | نوری پەترۆس | ل١٦٥ |
| مەلا سەعید ئاومالێ | ئا: ئومێد ئاومالێ | ل١٧٢ |
| شاعیری دەشتی هەولێر | جەلال سجاوی | ل١٧٧ |
| کردنەوەی پەنجەرەیەك لەبەردەم | ڕۆستەم باجەلان | ل١٨٢ |
| حەیران لەنێوان چەمكو | ئەحمەد حەیران | ل١٨٦ |
| چەپکێ لە سەربردەکانی سەعید سەلیم | ئا: جەمال گردەسوری | ل١٩٥ |

## سەروتار

# تەعریب جینۆسایدێکی بەردەوام

ئەگەر ساڵی ١٩٦٣ ساڵی مەینەتی‌و نەهامەتی بێت بۆ سەرجەم گەلانی عێراق، ئەوا دەکرێ بڵێین ئەو ساڵە مەینەتی‌و نەهامەتییەکەی بۆ شاری هەولێر زیاتر چڕکرابووەوە، چونکە بەتاڵانبردنی موڵک‌و ماڵی دانیشتوانی خەڵکی هەولێرو بەعەرەبکردنی ناوچەی قەراج‌و کەندێناوە لەو ساڵەدا نەك هەر نەخشەی بۆکێشرابوو، بەڵکو ئەو نەخشەیە خرایە پراکتیکیشەوە، ئەوەبوو بەهێرشکردنی سەربازی بۆسەر هەندێ گوندو ناوچە دەستپێکرد کە ڕێك دەکرێ بڵێین لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەچیای قەرەچوغ (کلکەی دارەبزمارە)و گوندی دارەخورما، شەڕێکی توندی دەستەویەخە لەنێوان پیاوانی ڕژێم‌و هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و خەڵکی ناوچەکە ڕوویدا، کەتیایدا ڕژێم بەتێکشکاوی پاشەکشەیکرد، بەڵام ڕژێم وازی نەهێناو هەردوای نسکۆکەی یەکسەرکەوتە بەرتۆپبارانکردن‌و تاڵانکردن‌و سووتاندنی گوندەکانی قەراج‌و بەشێك لەگوندەکانی شەمامك‌و ڕێگای دووبز-کەرکووك‌و هەروەها ڕێگای پردێ-کەرکووکی گرتەوە. ئەوەبوو ئەنجام ئەو ساڵە (١٩٦٣) توانی (٢٧)گوند تەعریب بکات‌و بەدووەکانی عەشیرەتی جبوور، ئەلعبێد، لهێب، تەی، تەمیم...هتد لێنیشتەجێکرد. کە ئەمەیان دەکرێ بەیەکەم قۆناغی تەعریبی ناوچەی‌قەراج‌و کەندێنانەوەی دابنێین، کەپۆلێك شەهیدیش بەسەرەتای شەهیدانی دژ بە کاری تەعریب ناونووسکران‌و دەکرێ لەدەرفەتێکی دیکەدا باسیان بکەین. دوای شکستەکەی شۆڕشی ئەیلولی مەزن، ڕژێم بەهەلی زانی قۆناغی دووەم

پیادەبكات، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٧٦رژێم لە حەوت گوندی بەرامبەر بەشارۆچكەی دوبز قۆچانی زەوییەكانی لە دانیشتوانە كوردەكان سەندووەو گونـدی (سـەرگەڕان)یشـی چۆلكـردو عـەرەبی لەجێگەدانانو ئیتر لەگەڵ چەند گوندێكی دەوروبـەری كردییـە مەڵبـەندی ناحییەیـەك بـەناوی ناحیەی قودسو خستییە سەرقەزای دوبز، كە سەرجەم ئەو گوندانەی خرانە سـەر ئـەو ناحیـەی (قودس)ە، ژمارەیان (٣١)سـیو یـەك گوندبـوو كـە رژێـم لـە سـەرخاكی گونـدی سـەرگەڕان دایمەزراندبوو.

بەڵام رژێم هەر بەو ناحیەیەش نەوەستاو لەناو گوندی مەلاقەرەی پێشوو ناحیەی عەدنانییەشی دروستكرد، كە ئەمجارەیان (٤٦) گوندی خستەسـەر ئـەو ناحیەیـەو هـەموو ناوچەكـەی چۆلكـردو خانووبـەرەكانی لێتێكوپێكـدانو خەڵكەكەشـی سـەرگەردانو ئـاوارەكرد. بـەكورتی ئـەنجامی دروستكردنی ناحیەی قودس خـاپوركردنی (٣١) گونـدو (٢٤) قوتابخانـەو (٣٢) مزگـەوتو (٤) بنكەی تەندروستی بوو، بۆ دروستكردنی ناحیەی عەدنانییەش (٤٦) گوندو(٤٩) قوتابخانەو (٤٨) مزگەوتو (٥) بنكەی تەندروستی خاپوورو وێرانكرد.

دیارە هەمووشمان ئەوە باش دەزانین كە لەدوای وەستانی شەڕی عێراق لەگەڵ ئێران، چـۆن رژێـم بەرەنگاری هێزی پێشمەرگەی كوردستان بووەوەو چۆن هەرچی گونـد هـەبوو لەكوردسـتان وێـرانو خاپووری كرد، كەهەموو گوندەكانی ناوچەی كەندێناوەو قـەراج (ئەوانـەی مـابوون)و گوندەكـانی ناوچەی دەشتی هەولێری لەگەڵ زەوی تـەختكردو زۆر بێشـەرمانە ئەوسـاو تەنانـەت ئێسـتاكەش لێرەو لەوێ دەڵێن شەمامك خاكێكی عەرەبییە!!!.

مایەوە بڵێین رژێم توانی گوندەكان تـەختبكاو خەڵكـە بێگونـاحو بێدیفاعەكـەش دەربـەدەرو سەرگەردان بكات، بەتایبەتی ئێستا تەعریب گەیشتۆتە چڵەپۆپەو خەریكە پرۆسەكە لە دەوروبەری هەولێر پیادە دەكرێو هەڕەشە لە شـاری قـەڵاو منـارەش دەكـات. بـەڵام نەئەوسـاو نەئێسـتاش نەیتوانیو ناتوانێ لەكوردبوونی نەتەوەییان داشۆرێ، بگرە هەستی نەتەوەییو تێكۆشان لـەپێناوی گەڕانەوە بۆسەر موڵكـو زەویو زاری خۆیـانو بـڕوا پتـەوبوون بەئاوەدانكردنـەوەی گوندەكانیـان، ئێستا لەهەر كـاتێكی دی زیـاتر پێگـەییوەو رۆژێكیـش هـەردادێ گوندەكـانی دەشـتی قـەراجو شەمامكو كەندێناوە ئاوەدان بكرێنەوەو دارچنارەكان لە دەوبیرەكان سەوز سەوز ببنەوە.

# بارزانی دەبیرەوەرییەكانی (پاول ئاناتۆلیفیچ سودوپلاتف)دا

**كورتە سەرەتایەك**

بیرەوەرییەكانی پاول سودوپلاتف، لەساڵی١٩٩٤ بەزمانی ئینگلیزی لەئەمریكا چاپو بڵاوبۆتەوە. هەرئەوێ ساڵێ وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی سوێیدیو لە سوێیدیش دەوەشێ.

بیرەوەرییەكانی سودوپلاتف، ئەندامی دایرەی سیاسی سۆڤیەتی پێشوو سەرجەم ٥٢٥ لاپەڕەیەو سودوپلاتف لەلاپەڕەكانی ٣٧٧-٣٨٢ دا باسی سەرۆكی نەمرو جاویدان مەلا مستەفا بارزانیو دۆزی كورد دەكا. ئەم بەشە لەكتێبەكە لەلایەن رێزدار كاك س. بنگین وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی كوردیو بەزاراوەی كرمانجی لە ژمارەگەلی١٥٢-١٥٤ ی مانگنامەی ئارمانج Armanc دا مانگی ئوكتۆبەرو نوامبەری ١٩٩٤دا، بڵاوبۆتەوە. ئەز ئەو دوو بەشەم لە پیتی لاتینیڕا وەرگێڕاوەتە سەر پیتی كوردی لای خۆمانو پێشكەش بە رێڕەوانی بارزانی وەرجاوەندی دەكەم.

ئەحمەد شەریفی

هاوینی ٢٠٠١ مەهاباد

## چوونا بارزانی بۆ سۆڤیەتستانێ

سالا ١٩٤٦- ئان، سەرۆکێ کوردان مەلا مستەفا بارزانی ل سینۆرێ ئێرانێ خستو کەت ئازەربایجانێ.

پەیێن بارزانی دۆر دووهەزار کەسان بوون، چەکێن وان ژی، چەکێن دەستانو هنەك تۆپ بوون. ژماڵباتێن وان ژی دۆر هەزار کەسان ب وان رەبوون. حوکومەتا سۆڤیەتان ئەو دکامپەکێ دە ب جیکرنو من جارا پێشی ئەو ل وردیتن.

سالا ١٩٤٧- ئان، ئابا کومۆف، ئەز ب ئارمانجا کوژ بۆ وی لێشکەرێ ویو ماڵباتێن ب وان رە، حەقێ پەنابەریا سیاسی پێشنیاری وی بکم، شاندم باکو. من دێ پێشنیار بکرا کو ئەم د فکرن وان ل ئۆزبەکستانێ ل جیێن نەدووری تاشکەنت، د ماڵێن مووەقەت دە ب جی بکن. من ب ناڤێ ماتڤەیەڤ، وەك مودیرێ دوێم ێ (تاس)و بەردەڤکێ حکومەتا سۆڤیەتێ پێ دان ناس کرن.

من جارا یەکەم سەرۆك عەشیرەکی خاس ددیت. من تێدەرخست کو بارزانی سیاسەتڤانو سەرۆك لەشکەرەکی شارەزایە ژی. ژمن رەگوت کو ژ وان هەشتێ سەرهلدانێن کوردان یێن د ڤان سەد سالێن داوین دە ل هەمبەر سەر دەستێن ئیرانی، عیراقیو تورکیی، مە د شێست سەرهلدانان ژ وان دە ئالیکاری ژ رووسیا خوەستییەو مە هەردەم هنەك ئالیکاری ب ئاوایێ چەكو فیشەکان گرتییە. لۆما ژی ل گۆر وی پر تەبیعی بوو کورد د دەمەکە ولۆ خەراپ وەك ئا (وەکا) کو هاتبوون با مە دە، دەما کو کۆمارا دەمۆکراتیکا کوردان ژ هێلا لەشکەرێ شاهێ ئێرانێ موحەمەد رەزا پەهلەوی ڤە هاتبوو هلوەشاندن، ئالیکارێ ژ مە بخوازن.

ئەو کەسێن ژ ماڵباتا بارزانی کو ب سۆزا دانو ستاندنان هاتبوون خاپاندنو چووبوون باشاە، هەموو هاتبوون دالقاندن دەما شاە شاندبوو دوو بارزانی ب خوە، بارزانی لێ ڤەگەراندبوو گۆت بوو هەوگەر شاە قاسدان ژ ماڵباتا خوە بشینە با من، ئەز وان ل ڤر ل بەندی خۆ بگرم، ئەز تێم تەهرانێ. دەما بارزانی ب شاە رە کاتبوو ناڤ ڤان دانوستاندن، پرانیا لەشکەرێن وی کەتبوون ناڤ ئاخا سۆڤیەتستانێ ژی. مە دخوەست، ئەم کوردان، ژ بۆ سست کرنا دەست هلاتیا وەلاتێن دنیا رۆژئاڤا ئا لەرۆژهلاتیا ناڤین بکاربینن. دوورە مە ل هەڤدوو کر کو وێ بارزانیو هنەك ژ سەربازێن وی خوە دئاکادمیێن لەشکەریێن سۆڤیەتان دە بگەهینن و کو وێ ب چی کرنا وانا ئا ل ئاسی ناڤێن د رێویتیا وان هەو ببە بێنڤەدانەکا خوە ئامادەکرنێ ژ بۆ د پێشەرۆژێ دە ل هەمبەر ئێرانو ئیراقێ شەرەکی چەکداری ل دارخنو کوردستانێ ئازاد بکن.

ئابا کومۆڤ ل من قەدەغەکرو گۆت، کو دڤێ ئەز ئاگاهدارییێ د دەرهەقا ناڤەرۆکا پەیمانا خوەئا ب بارزانی رە نەدم سەرۆکێ پارتیا کۆمونیست ئا (کمونیستا) هەرێمێ. م باقرۆڤو بەتایبەتی ژی ژ تو کەسان رە قەت قالا سۆزا کوستالین د دەرهەقا پەروەردە کرنا وان ئا لەشکەری دە دایە. نەکم، هنەك ژ پەیێن بارزانی، ژ بۆ ئاڤاکرنا ئێستا سیۆنەك رادوکە کوردی ژ ئازەربێجانێ بارکرن ئەرمەنستانێ. دەما ئەز ڤەگەریام مۆسکۆڤا بارزانی ژ ب پەیێن خوەێن ژ چەك کریو ب

مانباتێن وان رە چوو ئۆزبەکستانێ. پشتی پەنج سالان، ١٩٥٢ ئان، ئەز دیسا ب فەرمانا کو بارزانی ببینم چووم ئۆزبەکیستانێ. نێزیکی تاشکەنت، جهێ کو بارزانی لێ هاتبوو ب جیکرن. بارزانی، ژ مەقامێن هەرێمی پڕ ب گازن بوو؛ خوەست کو دەست هلاتا ناڤەندی ئا ل موسکۆڤا دەست باڤێژە پرسگریکێن وی‌و چارەسەربکە. عەشیرا وی ل کۆلخوزێن تاشکەنت د خەبتین. بارزانی د خوەست کو ل سەرسەرێ سێ هەزار کەسێن ژ عەشیرا خوە خوەدیێ دەست هلاتا خوە ئا سەربخۆ بە. بارزانی کەتبوو ترسا کو کۆنترۆلا خوەئا ل سەر عەشیرێ وندا بکە. من و وی ل داچاکە حوکوومەتێ هەڤدوو دیت. سەردار نیکۆلای زەمسکۆف. تەرجومانێ من ێ کو وەك بارزانی خوەش ب ئینگلیزی زان بوو ب من رە بوو.

بارزانی، د ڤێ هەڤدوو دیتنا مە ئا دوویەم دە گۆت کو ئەمریکاو بەریتانیا ژ بۆ کو کاربن نەتەوە پەروەرێن کوردان ب خوە ڤە گرێ بدن، بەرتیلان ددن وان. بارزانی دوێ جڤینێ دە پێوەندیێن خوەێن ب ئاژانێن بریتانیا رە ژی ژ من رە ئەشکەرەکرن. ژ بۆ کوکاربن تەسیرێ ل رەوشا ترکیێ، ئێراقێ‌و ئێرانێ بکن‌و دەستێن خوە بگرن، د خوەستن ژ پەیێن وی فێدە بکن.

وەزیرێ ئەو لەکاریێ ئیگناتف، پلانێ من ب خوە قەبوول کر. من پێشنیارکر بوو کو ئەم تیپەکی (بریگاد) ژ ١٥٠٠ مێرێن کوردان د تەکنیکا سابۆتاژان (Sabotajan)دە پەروەردە بکن. مە یێ ب دەستێ وان کاری بوویا حوکوومەتا بەغدایێ ئا نوری سەعید بخستا. وێ تشتەکی ولۆ دەست هلاتا بریتانیا ئا ل سەر عێراقێ هلوەشاندا. کورد، د پلانێ من دە، ژ بۆ کارەکی دن ژی بکێر دهاتن. مە کاری بوو ئەو ژ بۆ هەولدانێن خوەێن د دەرهەڤا کۆنترولێ لسەر پەترۆلا کو ژ رۆژهلاتا ناڤین د چوو ژ ئەورووپاو ئەمریکا رە و خوەدی گرنگییەکە ستراتەژیك بوو ژی بکار ب ئانینا. هەگەر کو کوردان کاری بوویا خەتێن پەترولا ژ ئیران‌و عێراقێ د چوون قوت بکرانا، وێ پەترۆلا کو د چوو ژ وان رە پڕکێم بکرانا.

بارزانی ب بازارا کو وێ د نابێرا سنورێن ترکیێ، عێراقێ‌و ئێرانێ دە ژ بۆ ئاڤاکرنا کۆمارەکە کوردان ئا سەربخوە پشت گریەکە خورت بستینە، هەڤالبەندییا پۆلیتیك ئا ب حوکوومەتا سۆڤیەتان رە قەبوول کر. بارزانی گۆت کو راستترو هەسانترە گەر پێشی ل باکورە ئێراقێ کۆمارەکە کوردان بێ ئاڤاکرن. ل گۆر هێڤیا وی هەرێمێن کوردان یێن ل تورکیەیێ‌و ئێرانێ ژ سەرخوەبوونا خوە دوورە دەستەندن‌و ئەو ژی تەڤلی کۆمارێ د بوون.

من وێ چاخێ ژ بارزانی رە گۆت، ئەمرێ کو ئەز کارێم دوورو درێژ د دەرهەڤا پەیمانەکا ولۆ دە ب تەرە ب ئاخڤم، نەدانە من، لی ئەم ئامادەنە کو رێ بدن تە کو حوکوومەتەکا کوردان ئا ل دەرڤە وەلێت ئاڤابکی. ئالیکارێ من نیکۆلای مانتژکا (مانتژکا) ئاسیستانێ بۆریس بۆنۆماریۆف. دیرەکتۆرێ کۆمیتا ناڤەندی بەشا ناڤ نەتەوەیی بوو. مانتژکا ژ بۆ ڤێ ئارمانجێ، سۆزا کو ل جییەکی هەو دۆر دە پازدە کیلۆمەترە دووری تاشکەنت، د بۆرۆیا کۆلخۆزیکێ دەئالیکاریا ئاڤاکرنا پارتیا دەمۆکرات ئا کوردستانێ پێ بکە دا بارزانی. مانتژکا ژ بارزانی رە ئەشکەرە کر بێ ئیدارەکرنا کوردان ئا دەولەتی چاوا دکارە دبن

کۆمیتا ناڤەندی ئا پارتیا نوو دە بێ ئاڤاکرن‌و لێ زێدەکر کو وێ سەرۆکێ پارتیێ بارزانی بە.

من خوە نەخست ناڤ ڤێ ئاخفتنێ. لێ من ب بالداری گوهداری کر. پشتی کو ئاخاڤتن خەلاس بوو. د دوو سەعاتان دە ژ من رە ئەشکەرە بوو کو ئەڤ پلان ب ئارمانجەکە ئیدەئۆلوژیك ل سەر خەیالێن کۆمیتا ناڤەندی ئە پارتیا مە ل ستاراژا پلۆشیاد (Staraja Plo:yad) هاتیە ئاڤاکرن. بارزانی ژ من رە گۆت کو دخوازە مەڤەرێ سەربازێن خوە شانی من بدە. ئەم چووین ئۆدەیەکێ (هۆدەیەکی) کو دۆر سی هە (٣٠) کەسان د رەوشا ئامادە دە راوەستیا بوون. دەما ئەم نێزیکی وان بوون هەموو ب هەڤدوو رە داکەتن سەر لنگ‌و کابۆکان‌و ب چار لەپکان هاتن بەر ب بارزانی دە، ژێ تکا دکرن کو کاربن بێن دەست‌و گوهکێن قاپووتێ وی‌و گیزما (Gizma) وی بدن‌و ماچ بکن. وێ دمێ تەمامێ سوورەتێن د دەرهەقا کوردستانەکە دەمۆکراتیك دە ژ ئاقلێ من دەرکەتن‌و چوون.

١ی نیسان ١٩٥٢ بارزانی ب مالباتا خوە‌و هەڤ ولاتێن خوە رەل نێزیکێ تاشکەنت، د کۆلخۆزەکە مەزن دە ب جی بوو. دەما ئەزو مانتژکا هاتن مۆسکۆڤایێ بریارا کو وێ کورد ل ور ببن خوەدیێ ئۆتۆنۆمییەکە خوە ئیدارەکرنێ هات دان.

وێ وەزارەتا ئەولەکاریێ ئالیکاریا پەروەردەکرنا وان ئا لەشکەری پەیوەندیێن وان کوردێن ل دەرڤەیی وەلێت رەبکرا. مە دکر کو ئەم کاربن هنەك ژ پەیێن بارزانی بکن ئاژانێن خوە و ب ڤێ ئاوایی چەند کوردان ژ ناڤ وان ب خوە ڤەگرێ بدن، لێ هەولدانێن مە ژ هێلا حەزا ئەولەکاریا بارزانی ڤە دهات خراکرن. زمسکۆڤ ێ کو کورد هینا بەرێ ل ئێرانێ ناس دکرن، سەربازەکی بارزانی یێ نزم کو ل ئاکادەمیا لەشکەری د خوەند، کر زلامێ مە، لێ دەما ئەو زلام جارەکێ ڤەگەریا، تاشکەنت، بێ شۆپ وەندا بوو. مە تو جارێن دن نەمانە ئەو دیت‌و نە ژی تشتەك ژێ بهیست. ئەم گهان باوەرییا کو هاتیە کوشتن.

جارا یەکەم پرسا کوردان ب هەوجەدا ریا بریارا پولیت بۆرۆ بوو ئو ئەز کەتم ناڤ کارێن بۆرۆکراتیك. وێ چاخێ ئیگناتف گۆت بوو من هەتا کو ئەوراڤێن پێشنیارێن مە تێ دە نە بێن قەبوول کرن، دڤێ تو ل بۆرویا مانتژکا روونی. درەوشێن نۆرمال دە ئیگناتف نەرم‌و جرخوەش بوو، لێ وێ رۆژێ، دەما من ژێ رەگوت کو جڤینەکا منا عەجەلە ل ئۆتەکە (Oteke) مۆسکۆڤا ب بارزانی رە هەیە، ئیگناتف ژ بەر کو من گرینگیا ڤێ بوویەرێ کو کۆمیتا ناڤەندی بریارەکێ ل سەربگرە نەدیت بوو ب ئاوایەکی خشك ئەرزا من شکاند. ژ بۆ کو پێشنیارا مە د جڤینا خوە دە قەبوول بکن. ئیگناتف ژ بۆ تکاییێ ب من و مانتژکا رە هات باملۆتف‌و ڤیشینسکی (Vi:nski). ئەز بەرێ ژی گەلەك جاران ب مۆلۆتف‌و ڤیشینسکی رە روونیشت بووم. لێ ڤێ جارێ ئەز پێ هەسیام کو هەر دوو ژی ئێدی ئەختیار ببوون، سست ببون‌و وەستیایی خویادکرن، لێ دیسا ژی کەتێن ئەکسێ‌و خەت ل سەر بەشەکی ژ پێشنیارا مە خستن. نە د بوو کو ئەم دپێشنیارێ دە بێژن وەزارەتا دەرڤە، د دانوستەندنێن د دەرهەقا پرسا کوردن دە، ژ هنەك ڤاتینیان (Vatiniyan) بەرپرسیارە. هەر

دوویـن ژی دخوەستن کو پۆلیت بورۆ، نە ب داخوازەکە هەڤبەش ئا ل سەر ناڤێ وەزارەتا دەرەڤەو وەزارەتا ئەولەکاریێ، لێ هەو لسەر داخوازا وەزارەتا ئەولەکاریێ تەنێ پرسا کوردان بگرە رۆژەڤا خوە. ب ڤێ داخوازا گوهەرتنا نوو کو دڤییا یوو نەم د ئەوراقاندا بکن. ئەم کەتن پێشیا پەرێزگەرەکی کو راهشتبوو چەنتێ مەیێ ئەوراقان ژی. ئەم ژ با وان دەرکەتین. من ژ مانتژکا رە گۆت ئا باش کو ئەم هەرن بورۆیا من ئا ل لوبیانکا (Lubyanaka)و ئەوراقان ژ نوو دە ل ور بنڤیسن. ئیگناتف پێشنیارا من راست دیت.

کۆمەدیێ ژ ڤر و پێ دە دەست پێکر. مە پێشنیارا خوە بر دا ئیگناتف و وی ب خوە قەبوول کر. ئەوناما فەرمی کو وێ ب پێشنیارێ رە بهاتارێ کرن، ژ بۆوی گرینگ بوو. دڤیا ژ بۆ دەما قەبول بکنو ئیمزا بکن، ناڤێن ئەندامێن پولیت بورۆ لسەر هەبە. ئیگناتف سێ جاران ئەمر دا من و سەکرەتەران، ئەم رێزا ناڤێن ئەندامێن پۆلت بورۆ لسەر ناما ب ئەوراقان رە بگوهەرن. ژ مانتژکا پرسی بێ ما گەلۆ دڤێ ناڤان ل گۆرا رێزا ئەلفباییێ بنڤیسە، یا ژی پێشی ناڤێن ئەندامێن کۆمسیۆنا ئەکستەرن (Ekstern) بنڤیسە. هەگەر کو ولۆ بکرا ناڤێ هەڤرێ کرۆشچۆف بەریێ بولگانین دهات نڤیساندن، گەلۆ نە دڤییا بوو ناڤێ هەڤرێ (بەریا) بەری ناڤێ هەڤرێ مالنکۆڤ بوویا؟ ڤان رتشتن دن وەك ڤان تشتێن کو سەدەما تەڤ لهەڤیانە ئەز شاش هیشتم، لێ دیارە مانتژکا د دەرهەقا ئامادەکرنا ناڤان دە ئەکسپەرت بوو، دەست پێکرو چەند شیرەتێن باش د دەرهەقا رێزکرنا ناڤان دە ل ئیگناتف کرن. سەکرەتەرێن ئیگناتف ب خوە ژی شاش ببوون کو ولۆ گەلەك جاران نامێ ژ نوو دە دنڤیسنو گوهەرتنا کو دکن هەو رێزا ناڤێن ئەندامێن پۆلیت بورۆیە.

بوهارا ١٩٥٣ ئان، دەما من و بارزانی هینا جارێ هەڤدوود دیت سوجەکی گرینگێ ئەولەکاریێ قەومی. بارزانی ل مۆسکوڤا د ئاکادەمیا لەشکەری دە کورسەك د خوند. من ژی وێ دەمێ ل ور دخوەند. رۆژەکێ ئەز ل ور ب کنجێن ئامر هێز (ماژۆر) دیتم. ب ئالیکاریا سەرپەلەکی جوان کو وەکو تەرجومان پێ رە بوو، چاڤ دا منو ژ من رە گۆت، ژ بۆ کو ئەو کەسێ ل سەر ناڤێ حوکوومەتا سۆڤیەتان ب من رە ددانوستەندنێ دەیە ژی لەشکەرەکی بلندە، ئەز گەلەکی کێف خوەشم. من ژ بۆ خوەندنا وی، یا کو مابوو داخوازێن خوەێن سەرکەتنی پێکەش کرن.

جارا داوین دەما من بارزانی دیت، نەگەلەکی بەری ئەز بێم گرتن بوو، بارزانی ئەز ل کووچا گورکی دیتمو بەر ب من دەهات. بێگومان دەخوست د دەرهەقا پرس گرێکێن خوە دە ب من رە ب ئاخڤە لێ من دەنگ نەکر خوە و من نەخوەست پێ رە تێکەڤمە، بەری ئەو بگهە من، من خود د ناڤ خەلکێ دە ژ بەرچاڤێن وی وەنداکر.

بارزانی باش زانی بوو کو پێشە رۆژا کوردان مایە لسەر شارەزا بوونا وان کو کاربن وەلاتێن مەزن د دەرهەقا رۆژهلاتا ناڤین دە بخاپانو بالا وان بکشینن سەر خوە. د ڤێ مرۆڤ قەبوول بکە کو چارەسەرکرنا پرسا کوردان، ب ئاوایەکی هەقانە، نە دبیرا تو وەلاتێن مەزن دەیە. نە ل کرەملین، نە ل لۆندۆنو نە ژی ل واشنتۆن، ژ بەر سەدەمێن مرۆڤانە پرسا کوردان نە دبیرا تو کەسان دەبوو.

سەدەما سیاسەتا بێ بەخت د دەرهەقا كوردان دە پەترۆلا وان بوو. ئەڤ ژ بۆمە ژی ولۆ بوو ئـو ژ بـۆ وەلاتێن رۆژئاڤا ژی. میخائیل سۆسـلۆڤ كـت بـوو دەوسا (Dewsea) من و ب بارزانی رەپەیوەندی داتانین. ل گۆر پەیمانا كو مە بارزانی رەگری دابـوو، هەگەر كو ل عێراقـێ حوكومـەتا نـوری سـەعید بهاتا خستن، مەێ پشت گریەكە بێ داوی د دەرهەقا سەرخوەبوونا كوردستانێ دە بدا بـارزانی. لێ ئـەم د سالێن ١٩٧٠ یـی دە ل كـوردان قـول پیتـین‌و مـە شەری وان بێ پشتگری هشت، ژ بۆ خـستنا رەژێمـا بەغدایێ ئەمەریكایان ژی دوورە سـۆزا ئالیكاریـێ دا بوو بارزانی، لێ دە رۆژێـن تـەنگ دە سـۆزا خـوە نەئانین جـی‌و پشـتگری نـەدان كـوردان. كـورد ب ئاوایەكی خراپ هاتن خاپاندن. سـالێن ١٩٥٠ دە ب ئارمانجا كو ئەمێ د شەرێ سار دە كـارین فێداكـە سیاسی ل خوە بكن ئەز ب كـوردان رە كـەت بـووم پـەیوەندیان. وێ وەختـێ دەمـا مـە گـۆت ئـەم پشـتگریا، ئاڤاكرنـا كۆمـارا كوردسـتانێ دكـن، ئاوایەكی ئاخاڤتنا مـە بـوو، مـە د خوەسـت ئـەم ئینترەسا (Intresa) خوە یا سیاسـی د دەرهـەقا رۆژهلاتا نـاڤین دە ئەشـكەرەبكن. ئـەڤ ئاوایـەكی شـەر، كـو مـە د خوەسـت ئـەم كـارین بریتانیـاو ئەمەریكا پێ د هەرێمێ دە بشكینن بوو، ژ بـەركو قەوەت نە ل گۆر دلـێ مە بوون.

سالێن ١٩٦٠، دەما حوكوومەتا نوری سـەعید ب دەستێ لەشكەران هـات خستن ئـەم ژی د نـاڤ دەبـوون، سۆڤیەتسـتانێ د هـەرێمی دە دۆسـتێن ژ كوردان هین خورتر پـەیداكرن. تراژەدیـا كـو هـات سـەرێ بـارزانی‌و كـوردان، ژ بـەر ئینترەسـا (Intresa) سیاسـی ئـا وەلاتێـن رۆژئاڤـاو یێـن رۆژهلات بوو. وەك كـو هنـەك وەلاتێـن عـەرەبان‌و ئێران ژی دكن، مە دخوەست ئەم كوردان د هەرێمێ دە ژ بۆترساندنا یێن ل هەمبـەر خـوە ب كـاربینن، كورد لیستك بوون، ژ بۆ هەرێما دنـابێرا توركیـێ، ئێرانی‌و ئێراقێ دە لیستك بـوون، سالـێ ١٩٥٠ ل هەرێمی كوردان تەنێ هەڤالبەندێن سۆڤیەتسـتانی بوو، لـێ دووە هـەڤال بـەندیا مـەیا ب ئێراقـێ‌و سـوریەیێ رە بـوو بنگـەهێ سیاسـەتا مـەیا ستراتەژیك ئا رۆژهلاتا ناڤین. ب باوەریا من ئـیرۆ ژ بۆ كوردان چارەیەكە نێزیكی ئـاقلان د كـارە دبـن گرانتیەكە ناڤ نەتەوەیی دە بابەتەكی سەرخوەبوونا ب سینۆر بە. نە وەلاتێن رۆژهلات، نـەئێن رۆژئاڤـا ئـو نـەوەلاتێن عـەرەبان د خـوازن كـو كـورد ب ئاوایەكی كوكارین پەترۆلا مووسلێ كۆنترۆل بكـن، بێن خوەدیێ كۆمارەكە كوردان ئا سەربخوە.

١٩٦٣ ئان، دەما ئەز دزیندانـێ دە بـووم، مـن پێشـنیارەك نڤیسـاند. مـن دپێشـنیارا خـوەدە ئەشكەرەكر كو رەوشا مە ل رۆژهلاتا ناڤین نەباشەو دڤێ ئەم دیسا پـەیوەنیان ب بـارزانی رە دەینـین. ل گۆر ئاگاهداریا كو دان من، پێشنیارا من هـاتبوو قەبوول كرن‌و گۆتن كو ژ بۆ كو كورد كـارین خـوە دوارێ خوە دە ل هەمبەر ئێریشـێن جـەزەكرنێ یێـن لەشكەرێن عێراقی بپـارێزن، مـە چـەك‌و فیشـەك گهاندنە وان. ئەڤ جار ب خوە ژی تێ دە ئەشـكەرە بوو كو مە ب هەولدانێن خوە دخوەست ئەم كوردان بكن هەڤال بەندێن سـتراتەژیك‌و ب ئالیكاریـا وان سەردەستێن عێراقی كۆنترۆل بكن. ئـەڤ سیاسـەت ب سەرنەكەت.

Belgeyên ku nû çap dibin

### Çûna Barzanî bo Sovyetistanê -II-

# " Barzanî li Moskovayê di akademiya leşkerî de dixwend "

**Çiriya Pêşin 1994**

kolay Zemskov, tercumanê min ê ku wek Barzani xweş bi Ingilîzî zanîbû bi min re bû. Barzani, di vê hevdûditina me a duyem de got ku Emerika û Brîtanya ji bo ku karibin neteweperwerên Kurdan bi xwe ve girêbidin, bertîlan didin wan. Barzani di wê civînê de pêwendiyên xwe ên bi ajanên Brîtanya re ji ji min re eşkere kirin. Ji bo ku karibin tesîrê li rewşa Tirkiyeyê, Iraqê û Îranê bikin û di destên xwe de bigirin, dixwestin ji peyên wî fêde bikin.

Wezîrê Ewlekariyê Îgnatiev, planê min bi xwe qebûl kir. Min pêşniyar kiribû ku em tîpekê (Brigad=Tugay) ji 1500 mêrên Kurdan di teknîka sabotajan de perwerde bikin. Me ê bi destê wan karibûya hukûmeta Bexdê a Nurî Seîd bixista. Wê tişteki wilo, desthilatiya Brîtanya a li ser Iraqê hilweşanda. Kurd, di planê min de, ji bo kareki din ji bikêr dihatin: Me karibû ew ji bo hewldanên xwe ên di derheqa kontrola li ser petrola ku ji rojhilata navîn diçû ji Ewrûpa û Emerîka re û xwedî grîn-giyeke stratejik bû ji bikar bianîna. Heger ku Kurdan karîbûya xetên petrola ji Îran û Iraqê diçûn qut bikirana, wê petrola ku diçû ji wan re pirr kêm bikirana.

Barzanî, bi bazara ku wê di nabêra sinorên Tirkiyeyê, Iraqê û Îranê de, ji bo avakirina komareke Kurdan a serbixwe pişt-giriyeke xurt bistine, hevalbendiya politîk a bi hukû-meta Sovyetan re qebûl kir. Barzani got ku rasttir û hesantir e ger pêşî li bakure Iraqê komareke Kurdan bê avakirin. Li gor hêviya wî herêmên Kurdan ên li



Mustafa Barzanî

Min wê çaxê ji Barzani re got emrê ku ez karibim dûr û dirêj di derheqa peymaneka wilo de bi te re biaxivim, nedane min, lê em amade ne ku rê bidin te tu hukûmeteka Kurdan a li derve welêt ava bikî. Alîkarê min Nîkolay Mantjka, asîstanê Boris Ponomaryov, dîrektorê Komîta Navendî beşa navneteweyî bû. Mantjka ji bo vê armancê, soza ku li ciyekî hew dor dehpanzdeh kilometre dûrî Taşkent, di buroya kolhozekê de alîkariya avakirina partiya demokrat a Kudistanê pê bike da Barzani. Mantjka ji Barzani re eşkere kir bê îdarekirina Kurdan a dewletî çawa dikare di bin komîta navendi a partiya nû de bê avakirin û lê zêde kir ku wê serokê partiyê Barzani be



*General Mustefa Barzanî*

cekî girîng ê ewlekariyê qewimî. Barzanî li Moskova di akademiya leşkerî de kursek dixwend. Min jî wê demê li wir dixwend. Rojekê ez li wir bi kincên amirhêz (major= albay) dîtim. Bi alîkariya serpelekî (löjtnant= teymen) ciwan ku wek tercuman pê re bû, çav da min û ji min re got: "Ji bo

çareserkirina pirsa Kurdan, bi awayekî heqane, ne di bîra tu welatên mezin de ye. Ne li Kremlin, ne li London û ne jî li Washington-ji ber sedemên mirovane pirsa Kurdan ne di bîra tu kesan de bû; sedema siyaseta bêbext di derheqa Kurdan de petrola wan bû. Ev ji bo me jî wilo bû û ji bo welatên

di derheqa Rojhilata Navîn de eşkere bikin. Ev awayekî şer, ku me dixwest em karibin Brîtanya û Emerîka pê di herêmê de bişkînin bû. Ji ber ku qewet ne li gor dilê me bûn.

Salên 1960, dema hukûmeta Nurî Seîd bi destê leşkeran hat xistin em jî di nav de bûn, Sovyetistanê di herêmê de dostên ji Kurdan hîn xurttir peyda kirin. Trajediya ku hat serê Barzanî û Kurdan, ji ber intresa siyasî a welatên rojava û ên rojhilat bû. Wek ku hinek welatên Ereban û Îran jî dikin, me dixwest em Kurdan di herêmê de ji bo tirsandina ên li hember xwe bi (kar) bînin, Kurd lîstik bûn, ji bo herêma di nabêra Tirkiyeyê, Îranê û Iraqê de lîstik bûn. Salên 1950, li herêmê Kurd tenê hevalbendên Sovyetistanê bûn, lê dûre hevalbendiya me ya bi Iraqê û Suriyeyê re bû bingehê siyaseta me ya stratejîk a rojhilata navîn. Bi baweriya min, îro ji bo Kurdan çareyeke nêzîkî aqilan, dikare di bin garantiyeke navneteweyî de, babetekî serxwebûna bi sînor be. Ne welatên rojhilat, ne ên rojava û ne jî welatên Ereban dixwazin ku Kurd bi awayekî ku karibin petrola Mûsilê kontrol bikin, bibin xwediyê komareke Kurdan a serbixwe.

1963-an, dema ez di zindanê de bûm, min pêşniyarek nivîsand. Min di pêşniyara xwe de eşkere kir ku rewşa me li Rojhilata Navîn ne baş e û divê em dîsa pêweniyan bi Barzanî re deynin. Li gor agahdariya ku dan min, pêşniyara min hatibû qebûlkirin û gotin ku ji bo ku Kurd karibin xwe di warê xwe de li hember êrîşên eezekirinê ên lêşkerên Iraqê biparêzin, me çek û fîşek gihandine wan. Ev car bi xwe jî tê de, eşkere bû ku me bi hewldanên xwe dixwest em Kurdan bikin hevalbendên stratejîk û bi alîkariya wan serdestên Iraqê kontrol bikin. Ev siyaset bi ser neket.

# Çûna Barzanî bo Sovyetistaı

## Lêkolîn

## JI BELGEYÊN KU NÛ ÇAP DIBIN

Serê sala 1994-an, bi navê Direktoratet (**Direktorya**) pirtûkek li Swêd çap bû. Eslê pirtûkê sala 1994-an bi Inglîzî li Emerîka hatiye çapkirin. Ji ber balkêşiya naveroka wê pirr zû hatiye wergerandin. Belkî ji ber ku beşek jê di derheqa R. Wallenberg de ye û Swed ji nezîk ve eleqedar dike, zû hatiye wergerandin.

Pirtûk bîranînên **Pavel Anatoliyeviç Sudoplatov** e. Sudoplatov sala 1907-an li Ukrayna li bajarê Melitopol hatiye dine. 1919 bi dilxwaziya xwe ketiye nav Çekan (dûre GPU û OGPU jê tê avakirin). Wek nefer û telefonist kar dike. Hîna di xortaniya xwe de, sala 1927-an fermî dikeve nav OGPU (daîra siyasî a dewleta yekgirtî). 1928-an dibe berendamê partiyê. 1933-an dema V A Balîtskî bû direktorê OGPU ya Ukrayna û direktorê duyemîn ê OGPU ya hemû Sovyetistanê, Sudoplatov jî ji Ukrayna bi xwe re dibe Moskova. Di beşa OGPU a karê derve, (dûre navê NKVD, daîra bilind a ewlekariya dewletê lê kirinê) direktoriya yekem de bû mifetiş. Karê vê daîrê bi bingehîn îspiyon û sabotaj in. 1941 bûye direktorê Buroya ji bo karên taybetî ya NKVD. Sala 1953-an ev nav hemû radibin û dibin KGB.

Sudoplatov pirr li derve xebitîye. Salên 1937-38 di keştiyeke baran de li pirraniya welatên rojava bi navekî ne rast wek operatorê radio geriyaye. Ewî li Almanya çekdarên li hember Nazîyan organîzekirine. Yek ji wan kesên ku projeya bomba atomê dizîne. Di şerê Îspanya ê navxwe de wek yekî Polonî beşdar bûye. Ramon Mercader, ê ku Troçkî kuştiye, li wir hevalê wî bû. Ewî kuştina Troçkî organîze kiriye. Lê Sudoplatov ji kuştin û wendakirinên di salên 1930 û 1940-an de bûne, ne pak e.

Sudopkatov 1953 hatiye girtin, 1958-an 15 sal ceza xwariye, 1968-an ji hepsê derdikeve, lê li hember dewletê di bin tawanbariyê de dimîne. 1991 jî tawanbariyan pak dibe. Lawê Sudoplatov, Anatolî Pavloviç, li Universiteya Moskova Profesor e. Ji bo berdan û dûre jî ji bo pak derxistina bavê xwe gelekî xebitiye. Li gor baweriya wî, bavê wî, tiştên ku kirine ji bo dewletê, bi emrê ku jê re hatine kirine.

Xwest ku bîrînên wî bên çapkirin. Navê rojnamevanê TIME Jerrold Schecter bi munasebeta bîranînên Krûşçov bihîstibû. Û bihîstibû ku Leona Schecter ji li tiştên wilo digere. Pêwendiyan bi wan re datîne û hevdû dibînin. Pêşniyareke balkêş bû, lê gelek ewraqên ku pêwîst bûn hîna bidizzî bûn. Sala 1992-an mumkun dibe ku xwedî û rojnamevan li ewraqên ku berê bidizzî bûn binerin. Ew jî wê çaxê dest pê dikin. Ji bîranînên wî û ewraqên di derheqa wî û kar…
pirtûkek 525 rûpel têr ç…

Pirtûk, dema nû derk…
stê min, wan rûpelan …
kişandin, lê ji ber hi…
min, ez dereng lêv…
Rûpelên 277 û 282 he…
rheqa Berzanî û Kurd…
Min ew rûpel wergera…
Armanca min ne ku ez …
derheqa Berzanî de eşk…
ya ji piştgiriya rastbi…
dijî sosyalîzme bikim. …
qa bûyereke giring …
giring hatine gotin, be…
tişt ji Kurdan re ji eşker…

Di demeke ku Kurd …
giran li ber hevdû rûdin…
û bajarên "hevdû" hilû…
belki nivîseke wilo hişt…
hinekî bine serê wan …
wan ku xelk di derheqa K…
ne wek ku soz didin dij…

S. B…

Armanc ئەلمانی

ژمارە ١٥٣ ئۆکتۆبەری ١٩٩٤ چاپی سوید

ژمارە ١٥٤ نۆڤامبەری ١٩٩٤

# گەلەکۆیی کردن لە زانستیەك بەڵگەی بێ هێزیو نازانستییە

عەبدولخالیق سەرسام

**(-ئەوەی مێژوو نەیوتووە شوێنەوار تەواوی دەکا) وەڵامی ژمارە (١٢)**

ئاشکرایە، بەدواداچوونو رەخنەگرتن، ئاسانترین شێوەی نووسینو خۆدەرخستنە چونکە لەکاتێکدا داهێنەرانو توێژەوان، چەندین ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەیەك دەبن بۆ دۆزینەوەی راستییەکان، کەچی دواتر رەخنەگرێك دەتوانێ قەڵەمێکی سوور بگرێتە دەستو، بەناوی سەربەستی بیروبۆچوون بڵێو بنووسێ، خۆی بکات بە مامۆستا، لەکاتێکدا کە یەك دێڕیش هەوڵی لەم بابەتەی نەبووە تا بتوانێ زۆر بە ئاسانی بڵێ (ئەمە وانییە ئەمە هەڵەیە)، (ئەگەر ئەمە بەجۆرێکی دیکە بوایە باشتر بوو) نووسەر (داهێنەر) نەزانە، وردبین نییە، بۆ بەرژەوەندی رەخنە وایکردووە، ئەمەو دەیان وشەو دەستەواژەی ناشیرین بەناوی ئاراستەی داهێنەر دەکا. بە کەمترین ماوە خۆی لە سەرووی ماندووبوونو دۆزینەوەکە دابنێ. کە لەراستیدا تەنیا تۆزێك کاروانەکە بەدوادەخا.. بۆیە دەبێ پسپۆری ئەم بابەتە زانستییە گفتوگۆ لەگەڵ رایە تازەکە بکا تا ئەنجامی کۆتاییو راستی بەدیارخستن وەك حاکمو قازییەك ئاشکرا بۆ گەڕاندنەوەی هەق بۆ لایەنی خاوەن هەق، خۆ ئەگەر پسپۆرێك ئەم بڕیارەیدا، دەبێ وەك یاسا رێزی لێ بکات ئەگینا هەر کەسێك دەتوانێ لەکاتی بێ یاساییدا خۆی بکا بە حاکمو یاسا، ئەمەش ئاژاوەو شێوانکاری دروست دەکا بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم، چونکە وردە وردە مەبەستەکانو ئەوەی لە پشت مەبەستەکانە ئاشکرا دەبێ. ناراستییەکان رسوا دەکا. منیش سەرەڕای رێزگرتنی پرۆفیسۆر موحسن محەمەد موحسین لەسەردەمو مێژووی سەلاحەدین بۆ دۆزینەوەکەم لەگەڵ بەڕێزان سەرۆکی بەشی مێژوو د. ئارسن موسا رەشیدو دکتۆر ئەحمەد عەبدولعەزیزو دکتۆر ئەحمەد میرزا، حەزم کرد مامۆستایانی بەشی مێژوو دەربارەی لێکۆڵینەوەکەم لە نزیکەوە ئاگاداری وردەکاری زانیارییە تازەکانم بن بۆ چەسپاندنی شوێنەوارەکە گرنگیی پێدانی. بۆیە لە بەشی مێژوو داوای بەستنی سیمینارو کۆڕم کرد، بەڵام پشتگوێ خرا، بۆیە چوار جار پەیوەندیم بە بەڕێز سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین پ.د. سەعدی بەرزنجی کرد ئەویش بە دەوری خۆی هەر جارێ نامەی تایبەتیو کیتابی رەسمی ئاراستەکردن بۆ بەستنی کۆڕ وەك لەم بەڵگەنامەیەد

بڵاوی دەکەمەوە، بەڵام هەندێك هەر لە پێشە مەن ئەرەزاییان بۆ کوڕ بەستن پیشاندا، چونکە بە پێچەوانەی هەندێ زانیاری هەڵەی نێو ماجستێرەکانیان بوو. کە ئەمەش دوورە لە هەڵسوکەوتی شارستانیانەو دڵسۆزی بۆ راستیو زانست، لاوازی بەرامبەر رووبەڕووبوونەوە، هەر جارەو یەکێکیان دەدایە پێشەخۆیان بۆ کەلەن دۆزینەوە لە دۆزینەوەکەم ئەویش بە نووسینێکی لاواز لە گۆڤارو رۆژنامەکان.

من مەبەستم نە شەهادە بوو نە بەرژەوەندی تایبەت بەڵکو تەنیا گرینگیدان بوو بەو شوێنەوارە گرینگەی کە زۆر نهێنی ئاشکرا دەکاو سامانێکی شوێنەواریو گەشتوگوزارە لە داهاتوودا، جگە لە گەڕانەوەی سەلاحەدینو سیمبولەکان بۆ نێو هۆزو زێدو گۆڕستانی باپیرانی. کە دەوڵەتی ئەیوبی درێژەدانی دەوڵەتی هۆزەبانی هەولێر بوو، سەرکردەکانیشی نەوەی هەمان سەرکردەن، بۆ نموونە زەرزارییەکان کە ئەیوبییەکانن لە حوکمی بابەکری هەولێر، ابو تلیلی هەزەبانی[٢] کوڕی خوشکی ئەبولمسا کوردی هەزەبانی[٣] ئەمیری پێشووی هەولێر. کە لە سەرەتادا هاوپەیمانی بوو لە میسر عیسا الهکاری[٤] کوڕی ئەمیری پێشووی ئامێدی هەکاری... هەروەها میرەکانی سوریاو تورکیا، کەواتە کوردەکانی کوردستانی عێراق سەرکردایەتی ئەم دەوڵەتەیان دەکرد، هەولێر پایتەختی قووڵایی دەوڵەتی ئەیوبی بوو، کەواتە هەر هەوڵدانێك بۆ لە رەگو لە (دوین) لە خاك دوورخستنەوە سەلاحەدین بێ کەس کردنو بێ هۆزکردنی ئەم بنەماڵەیە، تا بڵێین تاکە کەسێك بووە بە رێککەوتو وەزیفە سەلاحەدین بە خوێنو هێزی کورد بووە بە سەرکردە، چونکە هیچ پاشماوەیەکی ئارکۆلۆجیو هۆزو رەگەزی لە (دبیل)نییە لە نووسینەکانیش گەیشتم دڵسۆزیو راستی پەروەری مەبەستیان نییە بە قەدەر گەلەکۆیی کردنو پشت لە عەردی دانو هەندێ مەبەستی گومان لێکراوو پاڵپشتی مەبەستدار.

ئەمجارەیان وەڵامی سێزدەمین کەس دەدەمەوە کە لەسەر دۆزینەوەکەمی نووسیوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە بڕوای بە وەڵامو بەدواداچوونەکانی پێش خۆی نەبووە، بۆیە هاتووە یارمەتی دوانزە کەسەکەی پێشخۆی بداتو پاش هەستکردنی بە نەڕووخانو پتەوی دۆزینەوەکە، هاتووە شانسو توانای خۆی تاقی بکاتەوەو ئەو راستییە مێژوویيو زانستیانەی بە چەندین ساڵ لەسەر ئەیوبییان کۆم کردۆتەوە ئەو خۆی ببێتە خاوەنیان. من باسی هەندێ رستەی ئەدەبیو پڕکردنەوە وەلاوە دەنێمو یەکسەر دێمە سەر ئەو خاڵانەی ورووژاندوویەتی یا تیشکی خستۆتە سەر.

*باسی ئەدمونز دەکا دەیەوێ بڵێ لە داننان بە (دوین) پەشیمان بۆتەوە بەبێ هێنانەوەی بەڵگە.. کە من ئاگاداری ئەدمونزو راکانی ئەوم بەرامبەر (دوین) کە دەڵێ زێدی باپیرانی سەلاحەدینە **پێویستە (دوین) بکرێتە پایتەختو سەرکردەکانی کورد بچنە ئەوێ حوکمی کوردستان بەڕێوە ببەن**، وەك نامیلکەکە ناوی (المشکله الکردیه، س. ج. ئەدمونز)[٥] بەرێز (د.لەتیف مەحمود بەرزنجی) چاپو بڵاوی کردۆتەوە کە موحازەرەیەکە لە ساڵی ١٩٦٥ ئەدمونز لە جەمعییەی مەلەکی لە لەندەن وتوویەتییەوە.

لە وەڵامدا دەڵێم من لە ئەدمۆنزو مینۆرسکی ئاگادارم کە مینۆرسکی نەیتوانی گوندی (ئەجدانقان)

بەرامبەر (دبیل) بدۆزێتەوە کە یەکێکە لە شەرتەکانی ئیبن خەلەکان-بەرامبەر باب دوین ئەجدانقان هەبێ یا شوێنی یا کۆنە ناوی بەڵام لە هەولێر دۆزیمانەوە گۆڕی (مەڕوان)یشی لێیە راکانیانم بە وردی دیوە، کە لەلای من بە قەد رای مێژوونووسانی سەردەمی سەلاحەدین گرینگ نییە.

پاشان خۆم بە لە پێشترو شارەزاتر دەزانم. خەڵکی ناوچەکەم، بەرد بەرد شارەزام، زمانی کوردی دەزانم ئەوان (دوین)ی هەولێریان نەدیوە من لێکۆڵینەوەم لەسەرکردووە، من خاوەن ماڵم دەزانم چی لەماڵەکەمدا هەیە من بە ئەرکی سەرشانو کوردایەتی دەزانم، ئەگەر راستییەك بۆ میللەتەکەم ئاشکرا بکەم، بۆیە خۆم بە شارەزاتر دەزانم بۆ ئەوەی بە دڵسۆزیو زانستییانە بگەمە ئەنجام، شێوانکاری ریسوا بکەم دۆزینەوەی زێدی باپیرانی هەر کەسێك، پێویستی بە دەستنیشانکردنی شوێنو پشکنینی گۆڕستانو شوێنەوار هەیەو بەڵگەی جوگرافیو مێژوویی دەوێ، بە شارەزابوون لە هەلکەوتی سروشتیو سەرچاوە مێژووییەکان.

بەبێ لەیەکتر نامۆبوونی بەڵگەکان، رابردوو وەك فۆتۆکۆپی ئێستا بێ بە دۆزینەوەی جیاوازی گۆڕانکارییەکان کە رووی داوە بە درێژایی مێژوو، چ لە زمان بێ، چ لە خاكو چ لەنێو میللەت.

*ناونیشانی کتێبەکەم وەڵامی ناونیشانی ئەو نووسینەیە کە لە گۆڤاری هەزار مێرد(٧) کاك عەبدولرەقیب یوسف لەسەر منو دۆزینەوەکەم بڵاوی کردەوە، بەڵام بە داخەوە لەسەدەی بیستەم، وەڵامەکەی منیان بڵاو نەکردەوە کە بە کاك حەمید رێبواری نووسەر بۆم ردوانە کردبوون، سەرەڕای چەندین تەئکید بۆ بەرپرسەکانی گۆڤارەکە، ناچار بە کتێب وەڵامەکەم بڵاوکردەوە، کە ناونیشانی وتارەکەی ئەو (سەلاحەدین ئەیوبی خەڵکی ئەرمینیایە نەك (دوین)ی هەولێر. بە ئەنقەست ناوی هەولێری هێناوە تا شارچیاتی بورووژێنێ، وا لە خەڵك بگەیەنێ من شارچیاتی دەکەم. پاش ئەوەی یاداشتی بۆ وەزیری رۆشنبیریش نووسی کەوا کتێبەکەم لە هەولێر بۆ چاپ نەکەن لە گۆڤاری هەزار مێردیش کە لە سلێمانی دەردەچێ نەیهێشت وەڵامەکەم بڵاو ببێتەوە، زوڵم لەوە گەورەتر لە چەرخی دیموکراتییەت کە ئەمە خۆی لەخۆیدا پلەو ئاستی رۆشنبیری ئەو کەسە لە مەحەك دەدا، منیش پێچەوانەی ناونیشانەکەم دایەوە هەر لەوکاتەداشدا لە گۆڤاری (هەولێر) بڵاوم کردەوە.

دەپرسم: لەجیاتی لایەنگری کردن لە راستی بۆ لا لایانێ بۆتە پیشەی هەندێ کەس لەم وڵاتەدا، ئایا وەڵامێك بۆ نووسینێك لە نووسینەکان بەس نییە بۆ راستی. ئایا وەڵامی لایەنگیری بەڵگە نییە بۆ لاوازی وەڵامی یەکەمو دووەمو سێهەمی لایەنگیرکراو...هتد؟ کە لەسەریم نووسی؟! ئەم هەموو هێرشە بەڵگەی نازانستی نییە؟ وەڵامی پسپۆڕێك یا پشتگیری کردنی پسپۆڕێك کیفایەت نەبوو؟

* من قسەی مێژوونووسان بە هەودس لێك نادەمەوە زمانەوانمو لە بیرت چوو هەموو ئەوانەی لەسەریان نووسیم وتیان شاعیرە چی لە مێژووو لێکۆڵینەوە. یان بەڕێزتان بە هەوەسی خۆتان (صدیان) بە (هژبان) لێك دەدەیتەوە کە لەلای من (هژبان) (هزبان) بە زەممەکردنی (ه) (هوزەبان)ە لێك نزیکتر نییە، کە عەرەبەکان بە هەڵە تۆماریان کردووە (الهژبانیە) (الهوزەبانیە)یەو ئێستاش هۆزەکانی

...ـورچی) (سەرچیا) هۆزەبانی هەولێرن. (دەچمە ...ـەربانی) واتا بڵندایی (دەچمە سەرێ) جێگای هۆزەبانەکانە.

* چۆن پێنە بۆ کاك عەبدولرەقیب دەکەیت کە ...عو بە هۆزی (صدیان)ی لێك دەداتەوە (کە صدیان، ...ێ صدیدی شەممەری عەرەبیە).

ئایا (زەراری) لە (زراریەوە) نزیك نییە؟

ئایا (رەوادی) کە عەرەبەکان ویستیان بیکەنە (رودا بن الازدی) عەرەبی (راهندە) (رەوەندی)ی دوینی هەولێر نییە؟ وشەکان لێکنزیك نین (ئەجدانکان)- لە (ئەجدانقان) (کانی ئەجندان)ە. یان کللكو گوێم بۆ کردووە ئەمانە هەموو کوردی زانێك بە دڵو بە عەقڵو هۆش وشەو کۆرپەی زمانی کوردی دەناسێتەوە نەك وەك بەرێزتان کلكو گوێو حەیکەلیشتان بۆ (صدیان) کردووە نەبووتە (هۆبان).

هەموو زانکۆو زاناکانی دونیاش ناتوانن راستییەك بشێوێنن، ئەگەر مرۆڤ تۆزێك بزانێ زانست مانای چییە لەم وتەیەم دەگا (گالیلۆ) رستەیەکی وت هەموو دونیا دژی وەستان بەڵام ئێستا هەموو دونیا رستەکەی دەڵێتەوە.

*دەڵێ سەرسام زانیاری فەرامۆش کردووە!! من یان بەرێزتان باسی زۆر بەڵگەی گرینگتان نەکردووە لە کتێبەکەم باسم کردووە ئەمەش نا ئەمانەتی عیلمییە خیانەتە لە بەڵگەنامەو زانکۆ، بۆ نموونە:-

١-ج.س. بکنگهام کە دەڵێ: (سەلاحەدین خەڵکی یەکی لە چیاکانی کوردستان ١٨٢٧م یان ص٣٥ خطط الموصل(٨) دەڵێ (کردستان القریبە)

٢-یان شەرەفخانی بەتلیسی کە دەڵێ: (دوین) ئێستا وێرانە کە لە ساڵی ١٠٠٥ کۆچییە ئایا وەڵامت دامەوە بڵێی یا بیسەلمێنی ئەوکاتە (دبیل)ی ئەرمینیا وێران بووە وەك چۆن ئێستاو لە سەردەمی ئوغز بەگ وەك لەمیرانی سۆران باس دەکا (دوین)ی هەولێر هەر وێران بووەو شوێنەوارەکەش هەورا پێشان دەدا.

*باسی محەمەد حوسێن دیاربەکەری قازی مەکە ١٥٨٢-٩٩٠ کۆچی هەر ناکەی کە دەڵێ ·دوین في آخر اعمال اذربیجان من جهة ایران وبلاد الکورد وهم اکراد روادیة)(١٠) ئایا نێوان ئێرانو کوردستان ئەرمێنیایە؟ مرۆڤ تۆزێ بەزەیی بە مێژووی میللەتەکەی بێتەوە ئەم دووزاتە بەتلیسیو دیاربەکری هەردووکیان زانای کورد بوون باش دەزانن چی دەڵێن.

چیت لە یاقوت الحموی ئەرمەنییە کاك ئەشکەنەیی؟! ئەی هەر خۆت نالێی (تۆژەری مێژوویی دەبێ راستگۆبێ لەگەڵ خۆییو خەڵکی) راستگۆیی چۆن بەم جۆرە دەبێ.

کە بەمن دەڵێی (سەرسام راستگۆ نییە) ئایا کەمن (دوین)و گۆڕی مەروانو هەموو ناوچەکانم دیوە، بەڵگەی راستگۆییە، یا راستگۆیی ئەوەیە نەچیە (دوین)و باسی بکەیو رەتی زانیارییەکانی یەکێ بکەی کە (١٥) جار (دوین)ی دیوە، راستگۆیی لەوەدایە بچیتە ئەوێ بەرد لە بەرد بدەیت نەك خەیاڵ لەبەرد، کە هیچ لە وەزعی بەردی هەقیقەت ناگۆڕێ، کورد لە کۆنەوە دەڵێ تفەنگ بە تاریکییەوە مەنێ، واتا باسی شتێ نەکەیت دیار نییە باسی مێژوویەك مەکە لێی نازانی.

من وتم ناوی پیر (مەروان)ە یەکەم جار بەر لەپێنج ساڵ کاك محەمەد هەرکی کە بەرپرسی ناوچەی پارتی بوو لە شارۆچکەی صلاح الدین وتی ئەمەش (پیر مەروان)ە بەرامبەر دوین لەلای هەولێر-کە دواتر

هــەموو هــەرکیو زراریو خــەڵکی ناوچەکــە وایـــان دەگوت تۆ (شێخی ماوەران)ت لــە کــوێ هێنــا چــۆن وەلامــی میللــەتی کــورد دەدەیتــەوە لــەکاتێکا شوێنەوارەکانو مەزاری گۆڕستان ناو گۆڕدەکەی، هیچ گۆڕێك بە (ناوی شێخی ماوەران) لە ناوچـەی (دویـن) نییە. بەڵکو پیر (مــەروان) لــە گونـدی (ئـەجدانکان) ئەجندەکان-قەڵاتی (ئەجندەکان) (قەلاتەجن) هەیە کە گۆڕی باپیرە گەورەی سەلاحەدینە.

ئایـا چویتـە سـەر گـۆڕی (پیرمـەروان) وێنـــەت گرتووە؟ کە تا چوومە ئەو شوێنە سەختە بـێ رێگایـە دوو رۆژی خایاند.

ئەگەر دڵسۆزی من نەبێ بــۆ راســتیو قەناعــەتی زانستیانەم وەك تۆ لێرەوە دەمووت (شێخی ماوەران)ە. کە سەرجەم نووسینەکەت دەخاتە ژێر پرسیارو گومان. گۆڕێکی مەلیکانە تانج لەسەری خاوەن کێلێکی بــەرد ئاسنین لەو دۆڵە بەتەنیا چی دەکا کــە هیــچ گۆڕێکـی دیکەی لەم جۆرە لەهەموو زرارەتی نییە ئایــا مانــای ئەوە نییە (مەروان) باپیری مەلیکەکانی ئەیوبی بــووە چونکە لە هەمان گوندو (مقابل باب دوین)ە وەك ئیبن خەلەکان باسی گوندەکەیان دەکا، هە رئەم (مەروانــە) بەم جۆرە ئەم گۆڕەی لە (شەقلاوە بوایە) نــەمدەتوانی بڵێم گۆڕی باپیری سەلاحەدینە چونکە (شــەقلاوە) نــە ناوەکــەی (ئەجندەکانــە) نــە (مقــابل بـــاب دویـــن) بەرامبــەر دەرگــای (دویــن)ە، نــە خــەڵکی شــەقلاوە زەرزاری (زراری)ین، یان ئەگەر ئەم گۆڕە مەلیکانەیــە ناوی پیر (حوسین) بوایە نەم دەتوانی بڵێم گۆڕی باپیری سەلاحەدینە هەر چەندە(مقابل باب دوین)یش بێت کە شـــوێنی گوندەکەیانــە چونکــە ناوەکــەی باپـــیری مێژوونووسان باســیان کــردووە (مــەروان)ە وشــە یــان زاراوەی (پیر) وەك سەلماندمان لەسەردەمی سەلاحەدین بەکار هاتووە، وەك-پیر حسین الزرزاری(١١) بگــەڕێوە بابەتی دۆزینەوەی باپیری ئیبن خەلەکان لە کتێبەکــەم، پــاش ئــەوەی ســەلماندمان زەرزاری، زرارەتییــە کــە گوندەکە لەوێ (دوین) شوێنی باپــیرانی ســەلاحەدین-گوندەکەیان بە هەمان ناو کێلەکەش دەســکە خەنجــەر سەرتانجی چوار رۆژی بێ تیشك لێکــراوە کــە رۆژ بــە مانای زەرد دێت زەرزارییــەتی پیر مــەروان دەســەلمێنێ ماوە (نامێر) کێ دەڵێ جۆرێك لــە ئــامێرم نییــە یــا بەکارم نەهێناوە-ئایا تۆ چویت نامێری تەمەن بــەکار بهێنی تا بزانی کێلەکە هی سەردەمێکی دیکەیــە کــە لە ژووری پیلانو کۆبوونەوەی ئــەم وەلام نووســینە لــە زانکۆ دەڵێی هی چەند ساڵێك دوای ئەیوبییانە لەگــەڵ رایەکەی کاك عەبدولرەقیب بیگونجێنی؟ ئایا دەتانەوێ بــە رســتەیەکی بــێ مــاندوو بــوون ئـــەم زانیارییـــە مەیدانیانــەو مــاندووبوونی چــوار پێنــج ســاڵەم بـــە قوملێدانی جگەرەیەك بڵێن چــش؟ بــەمجۆرە پاداشــتی داهێنانو دۆزینەوە دەدەنەوە مامۆستای مێژوو پێــش ئەوەی من باسی سەلاحەدین بکــەم دێرێکتــان لەســەر نەنووســیوەو هێنــدە بــە پــەرۆش نــەبوون ســـەفەری ئەرمێنیای پێ بکەن؟ یان (ئەمانەش رێککەوتن) ئــەم رێککەوتانە بۆ لە (ئەشکەنە) نــەبوو لــە دەوروپشــتی (دوین)ی هەولێرە.

*بەداخەوە دەڵێی راکانی ئیبن خەلــەکانی لەگــەڵ بەلێکدانەوە نادروستەکانی لەگەڵ بۆچوونەکانی خــۆی گونجــاندووە) ل٣١ هــەولێر ئــاخر پێــم نــاڵێی نــاوێکم گونجاند دوو ناو سێ ناو نەخشەیەکم گونجاند شــوێنێك دوو شوێن ئەم دەیەها بەڵگانە چۆن لەگەڵ یەك گونجان لەشوێنێك ئەگەر راستی نەبێ.

باشە دەپرسم کە (دبیــل)ی ئــەرمێنیاتان نــەدیوە، چووی بزانی رەوەندو زەرزاری گۆڕی مــەروان‌و دیــواری ســنوورو گوندێکــی مقــابل (بــاب دویــن)ی بــەناوی ئەجدانقانی لێیە؟ حەتــەن دەڵێــی نــەخێر ئــەی چۆن چۆلەکەیەکی لە دەست بە هــەزار چۆلەکــەی ســەردار دەگۆڕییەوە، چۆن ماسی لەنێو ئــاو مامەڵــە دەکــرێ؟ کەی ئەمانەت لە (دبیل) دیت دەتوانی بڵێی بەڵگــەی (دویــن)ی هــەولێر لاوازە، دەڵێــی (دبیــل) زۆر دوورە ئایگەمێ..

پێت دەڵێم دەتکەمــە بەڕێوبــەری ناحیــەی ئــەوێ دەڵێی بە پاشایەتیش ناچم، باشە ئەدی چۆن (شــادی‌و ئــەیوب) لــەوێوە بــۆ وەزیفەیــەك بەســەر هــەولێریش تێپەڕین تا لە تکریت وەزیفەیەك وەرگرن... ئەم ڕێگــا دوورە کە گەڕانەوەی تێدا نەبووە؟

دکتــۆر موحســین لــە کتێبەکــەی لەســەر ژیــانی ســەلاحەدین دەڵێ بە بەهروزیان گوت دەست لەشــێرکۆ مەدە واتا سزایان مەدە هۆزێکی گەورەیان لــە پشــتە ئایــا بــەهروز لــە بــەغداوە لــە هۆزێــك دەترســێ لــە ئــەرمێنیا بــن، یــان ئــەو هــۆزە هــۆزی (هۆزەبــانی) (دویــن)ی هــەولێرو زەرزاری لــە بــەغدا نزیکــن وەك ئێستاش بەغدا حیسابێك بۆ هەولێر دەکا بــەڵام هیــچ حیسابێك بۆ ئەرمێنیا ناکا ئەوەش بزانە ئەم هۆزە بــە سەرۆکایەتی (ابو الموصل الكردي الهذباني) هــەولێریان حوکم دەکرد بۆیــە شــارەزا نــەبوون لــە مێژوویــەکی سەردەم تووشی ســەدان هەڵــەت دەکــا ئەگــەرچی بــە کۆمەڵێش یارمــەتی دراوی، زۆر بــە وردی وەڵامەکــە ریزکراوە بەڵکو وەڵامــی چــەندین وەڵامــی خــەڵکانی دیکەن کە وەڵامم داونەتەوەو لە گۆڤــارو ڕۆژنامــەکان یەکیان گرتۆتەوە.

بۆیە تەنیا پرسیار دەکەم. ئیبن خەلەکان کە دەڵێ:

١-(دوین اهلها رەوندیە) یــان وەك خۆتــان دەڵێــن (دوبیــل) شــارێکی گەورەیــەو لەگــەڵ پایتــەختی ئەرمــەنیان یــەك دەگرێتــەوە، چ جــۆرە گونجــاندنێکی نــامۆو نــا مــەنتیقی پــێ دەڵێــن، مــن گونجاندومــە (دوین)ی هەولێر هەموویان رەوەند بن زێدە لە هــەموو کوردستانی گەورە تەنیا رەوەند لە ناوچــەی (دویــن)ی هەولێر هەیە کە پێیان بڵێن رەوەنــد... بەمــە دەڵێــی گونجاندن (وەك خۆتان وتتان مرۆڤ دەبێ لەگەڵ خۆی‌و میللەتەکەی راستگۆ بێ). ئایا دەتوانی ئینکاری ئەوە بکــەی (دبیــل واهلــها کلــهم مــن الارمنیــە) ئایــا-ئەجنداقان بەرامبەر (دبیــل) هەیــە ســنووری بــەردین هتد کە باسمان کرد.

ئایا ئیبن خەلەکان خۆی نالێ (قال لی رجل عــارف بما یقول وهو من اهل (دوین) ان علی باب دوین قریــە یقال لها اجدانقان وجمیع اهلها اکراد روادیە)(١٢) ئایا ئەمە لە دبیل هەیە، کەواتە ئیبن خەلــەکان (دویــن)ی نەدیوە وەك ئێوەش نەتاندیوە، چونکە لە پــانزە ســاڵی هەولێری بەجێهێشتووەو لــە شــام‌و میســر ژیــاوە بــا خەڵکی هەولێریش بێ وەك تۆ ئەمە لەگەڵ گوندەکــەی زراریان بەرامــبەر دوین ناگونجێ کە ســەرباریش گــۆڕی مەڕوانی لــێیە دەتەوێ ناوەکە گۆڕانکــاری نەکەوێتــە ســەر بــەڵام هــەر دەناســرێتەوە (جــن) ئــەجندەکان ئەدانەکان-ئەجدانقان مقابل باب دوین.

دەمێنێتەوە (ئاران)و (کــەرەج) کــە دەڵــێ لــەلای ئاران‌و کەرەج دەپرسم بۆ دوو ناوی هێناوە بــۆ نــەیوت لەلای ئاران‌و ئەرمێنیا کە راســتتربوو وتــی (کــەرەج) ناوی (کەرەج) لە نزیك تارانیش هەیە، بەڵام (دویــن)و رەوەندی لــێ نییە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین-پاشــان

کەرەج دەکەوێتە پشت ئەرمێنیا سەر دەریای ڕەش، ئەگەر ئەم دوو ناوە لە نزیك (دوین)ی هەولێر هەبوون مانای ئەوە نییە بە دەوڵەتی ئاران و گورجستانی تێگەیشتبن جا یان ئیبن خەلەکان یا ئەوانەی کتێبەکەیان نووسیوەتەوە کە بەبێ شك (ئاران)و (قەراج) هەولێریان پێ نەزانیوە تا دەگاتە (دوین)دکەش. (ئاران)(١٣) وشەیەکی ڕەسەنی کوردییە بە مانای زستان هەوار دێت عەرەبەکان ئەلف لامی موعەرەفەیان بۆ زیاد کردووە (وەك لیسترینگ) دەڵێ (کتبوا العرب) (الران) بتشدید الراى ليجعلوا منه اسما عربيا(١٤) ص٢١١ بلاد الخلافه الشرقيه).

هەروەها دەربارەی (کەرەج) (گورجستان) دەڵێ (کرجستان ويقال) (ابخازية) لم تدخلا في عداد الولايات الاسلامية الا بعد فتح تيمور هذه النواحي في ختام المئة الرابعة عشرة)(١٥) ١٤٠٠ م وتفليس قصبة کرجستان وهي في اعالي نهر الكر) نەك نهر الكرد ص٢١٦ بلدان الخلافة الشرقية کەواتە (ئاران)ی کۆنە شارو دۆڵی ئاران بچووکی ناوچەیەکی ونبوو لەگەڵ (قەراج)ی لای تکریت و خوار (دوین) بە (ئاران)و کرەج)ی دوو وڵاتی گەورە تێگەیشتوون (دبیل)یش بە (دوین). بۆی هەیە ئیبن خەلەکانیش لەمەدا بلێ تەنیا لە مەندە هەڵەی کردبێ ئەویش ئاران و قەراجی پێ زانیوە وەك ئێستاش سەدان کەس لەناو هەولێر ناویانی نەبیستووە، مامۆستای بەڕێزی زانکۆ هەڵەی مێژوو ئاوا دەکرێ لەنێوان دووناو لە بەرژەوەندی ناوە مەشهورەکان، ئەی چۆن هەموو وتەکانی ئیبن خەلەکان لەگەڵ شوێنەوارەکە گونجا، بۆ لەگەڵ (دبیل) ناگونجێ، ڕاستە بۆی هەیە مانایەك دوومانا بگونجێ ناوێك سێ ناو بەڵام کە لێکۆڵینەوە کرا ناوەکان زۆربوون وەك ناوی باوك و باپیر و باپیرەگەورە شوێنەکان لێکجیا دەکرێنەوە ڕاستییەکان بەدیار دەکەون پاشان دەپرسم بۆ ڕازی نی (کەرەج) (قەراج) بێ بەڵام ڕازی (کەرەج) گورجستان و (ابخازیە)و (جورجیا)بێ کە سێ ناوی هەیە وەك (دبیل)ی لەنەزانینەوە سێ ناوی لێنراوە بەڵام قەراج هەر تەنیا (ك) کراوەتە (ق).

ئایا دوینی هەولێر ئەگەر لە تکریتەوە سەیری بکەیت جێگای یەکەمی ئەیوبییانە (دوین) ناکەوێتە نێوان دۆڵی ناران و کۆنەشاری ئاران و الرانیەو دەشتی (قەراج) بێ کە (کەرەج)بووبێ وەك چۆن (کاشان) کراوەتە (قاشان)، کرمنشاه کراوەتە (قرمسین) ئاکرە (عقرە) موگان (موقان)، ئەگەر لە مێژووی ئەیوبییان شارەزا بوایت دەتزانی لە سەردەمی ئەیوبییان (قەراجا الساقی)(١٧) ناوچەی قەراج و کەرکوکی گرتەدەست و عیماد الدینی زەنگی شکاند ناچار عیماد الدین خۆی هاوێشتە دەخالەتی ئەیوب لە قەڵای تکریت برینداریش بوو تیمارکرا بۆی هەیە ئەو کاتە ئەم وڵاتە (بلاد الکرج) (بلاد القراجا) بووبێ.. کەواتە ئێمە لە ٩٩٪ لەگەڵ ئیبن خەلەکانین.

هەڵەکە لەپێکچوونی دوو ناوەکە ڕوویداوە، چونکە بەڵگەکان هەموویان پێکەوەن و لێکجیا ناکرێنەوە، جیاکردنەوەیان لە یەك وەك بە ئەنقەست واتانکردووە بۆ شێواندنی خوێنەر، وێنەیەك پارچە پارچەکراوە کۆبکەیتەوە چەند پارچەیەکی لێ بگۆڕی یا دەرهێنی وەك خۆی نامێنێ میللەتی کوردیش ئەم فێڵەی زانی ناتوانن دووبارەی بکەنەوە. باشە دواپرسیارم لەمە ئایا ئەگەر موسڵمانەتی لە سەدەی چوارەم لە سەردەمی تەیمورلەنگ چوبێتە جۆرجیا چۆن لە سەدەی دوانزەهەم عەشیرەتێکی موسڵمانی ئەیوبییان لەوێ بووینە،؟

ئەمەش کۆسپێکی دیکەیە چۆن کافرەکان لە (قرب تفلیس) پارچە پارچەیان نەکردوون ئای چەندی دەکەم ڕێکناکەوێ تا بێمە سەر ئەو قەناعەتە بێ ماندی بوونو بەشێك لە پشتی ئەوانە پشتدەگرن.

فەرموو ئەوەی لەلامە دوبیل+ ئاران+ کورجستان کرج+ ئەرمینیا+ واهلها ارمنیە. بەڵام (دوین) هەولێر دوین+ئاران+ قەراج(کرج)+ ڕەوادی (ڕەوەندی)+ گودی پیر مەروان+ کێلەکانی کۆپالو ڕۆژ (ڕەوەند)و زەرزا +شێرکوین الزرزاری (شێرەسوار) شێرکۆ الفارس (فورسان)+ سنووری ئازەربەیجانو پاشماوەکەی+ تغری بردی + دیاربەکر+ شەرەفخان+ شوێنەواری عێراقی+ شمس کردستان).

ئایا ئەمانە هەموویان بە ڕێککەوت کەوتوونەتە تەك یەك لە (دوین)ی هەولێر-هیچ بەڵگەش لە دبیل نییە چۆن داکۆکی لە دبیلی ڕەقو تەقی ئەرمەنیان دەکەی بۆ شێواندنی مێژووی کورد فەرموو لە گولانی عەرەبی دەڵێ تا ئێستا گوندی ئەجدانقان لە دبیل نەدۆزراوەتەوە.

بۆیە هەر گەڕاینەوە سەر وتەی کاتیبەکانی سەلاحەدین کە دەڵێن (دوین من اخر اعمال اذربیجان مایلي الروم). یەکسەر گەیشتینە قەناعەت وەك ئیبن خەلەکان دەڵێ (من اخر اعمال اذربیجان) بە واتای سەر بە ئازەربەیجان بووە بەڵام نەیانوتووە (مما یلی ارمینیا) کە وتوویانە الروم مەبەستیان ئەو ئاخر ئەعمالەی لەلای (ڕۆم) کە سنووری ئازەربیجان لە سەر ڕووی عیمادییەوە دەستی پێکرد بە لێواری زاب دەهاتە خوار تا جبل کوری دوین لەوێوە بە سەری ڕەش دەربەندی گۆمەسپان باواجی هەیبەت سوڵتان تا نزیك سولەیانی هەموویەرامبەر (الروم) ولاتی ڕۆمە. کە ئەوکاتە شام لە دەست ڕۆمەکانو سەلجوقیو پاشان سەلاحەدین ڕزگاری کرد، زۆربەی شەڕی ئەیوبیان لەگەڵ ئەرمەن بوو کە لە ساڵی ٥٨١ کۆچی (میافارقین)ی لە دەست ئەرمەن دەرهێنا ئەمەش دەقێکە دەسەڵاتی ڕۆم لەسەر جەزیرەو شام پیشان دەدا (قد علمت انت والسلطان ان دیار الجزیرة والشام قد تمکن الفرنج منها وقویت شوکتهم بها واستولوا علی اکثرها وقد اصبحت ولایتهم من حدود ماردین الی عرش مصر ما عدا البلاد الباقیة بید المسلمین) ص٣٢٤ سنة ٥٢١ه البدایة والنهایة الجزء الثامن. کە ئەو ساڵە بوو باوکی سەلاحەدین (دوین)ی هەولێر بەجێدەهێڵێ تا بچێتە بەغدا پاشان بۆ تکریت تا لە ولاتی خۆی نزیك بێتەوە. بەڵێ بحر الابیض المتوسط (بحر الروم)(١٩)یان پێ دەگوت.

کەواتە مما یلی الروم بە مانای مما یلی الشام دێت، دەیانتوانی بڵێن مما یلی (بحر الروم) هە ڕدەکا سنووری غەربی ئازربیجان کە (دوین)ی هەولێری لەسەر بوو وەك (خانە) (پرانشەهر)ی ئێستا بەرامبەر حاجی ئۆمەران کە ئازربیجانی غەربییە یان غەربی ئازەربیجانە. پێشتر تا (دوین)بوو. بەڵام پایتەختی ئەرمێنیا لە ناوەڕاستی ئەرمێنیایەو قەت لەسەر سنووری ئازربێجان نەبووە بۆ زانیاریش غەربی ئەنادۆل پێی دەوترا الروم السلجوقیه یان نزیك الروم. تکایە بگەڕێوە سەر نەخشە کۆنەکان. دوای ئەمە هەموو فەرموو ئیبن خەلەکان خۆی دەڵێ (فمن وقف علیه من اهل الدرایة بهذا الشأن ورای فیه خللا فهو المثابر في اصلاحه بعد التثبت فیه) ص٣ ج١ وفیات، دەڵێ ئەگەر ناراستییەك هەبوو با شارەزایان چاکەنەوە کەواتە بۆ کوچك لە ئاگر گەرمترە.

*دەڵێ نیپور(٢٠) بە خەڵکەکەی وتووە ئێرە جێگای زێدی باپیرانی سەلاحەدینە ئەویش لە ساڵانی (١٨٠٠) بفەرموو پاشان دەڵێ سەرسام لە نقل ئەمین نەبووە بفەرموون هەر خۆشی وتەکەی نیپوری بڵاوکردۆتەوەو تێی ناگا کە نیپور دەڵێ خەڵکی رۆژگەو ماوەرانو دوین پێیان گوتم (ولقد عرفت من القرى الواقعة في منطقة قرية روش كه (رەزگە) وماوەرانو (دوين) ربما كانت مسقط راس ايوب والد البطل المشهور صلاح الدين الايوبي) دەپرسم کامان ئەمین بوین لە نەقلکردنو عەرەبی زانینو وەرگێڕانی.

*بە نیسبەت مینۆرسکی هەمان راو لێکۆڵینەوەم لەسەر هەیە کە تەنیا ئیبن خەلەکانی کردۆتە بەڵگەو لێکۆڵینەوە لەسەر (دوین)ی هەولێر نەکردووەو نەیدیوە زۆر لایەنی مێژووییش ئاگادار نەبووە.(٢١)

* لە ل٢٨ی ژمارە (١٢) هەولێر دەڵێ: بۆ یاقوت الحموی ناوی (دوین)ی هەولێری نەهێناوە هاتووەتە هەولێر، منیش دەڵێم ئەگەر یەکێ شارەزای مێژوو نەبێ تووشی هەڵە دێو مێژووی میللەتێکیش دەشێوێنێ. فەرموو کاك ئەشکەنەیی نازانی یاقوت الحموی باسی (دوین) کردووەو (دوین)ی دیوە بەڵام وەك خۆشی دەزانێ زۆر گۆڕانکاری دێتە سەر ناویانو دەبێتە ناوێکی دیکە یان چەند ناوێکی دی یان چەند جارێك ناوی دەگۆڕی لەسەردەمی سەلاحەدین (دوین) وەك خۆی بە دەوە سنوور نەمایەوە بەڵکو کەوتە ژێر دەستی زەرزارییە کوردەکانو دەوڵەتی ئەیوبی ناوی ببووە (باب خفتیدکان ابی علی الزرزاری)و (باب نخیش) (بابغاش) بووە سنوور وەك یاقوت هەر خۆی باسی دەکا-ئێستا پێی دەڵێن بابچیچك کە وێنەی دوو چۆلەکە لەسەر کێلەکەی دەرگای بابچیچك هەیە لەسەر کێلی دیکەش چۆلەکەیەك لەسەر قەفەسێکە وەك دەرگا بغاش- فارسیو بە عەرەبی بە مانای چۆلەکەی رەنگاڵە دێت بۆیە تەنیا بەناوی (باب چیچك) دەرگای چۆلەکە ماوەتەوە) بۆ زێدە زانیاری بڕوانە (صلاح الدين الايوبي من جديد). بەڵام چۆنمان زانی ئەوا هەر بە وەسفەکەی یاقوت الحموی بەڵام ئێستا هەمان شوێن هەر (دوین)ە قەڵاتەکەش ماوە لەگەڵ دەرگاکە (دوین) لە دۆڵەکەیە باب قلعه خفتیدکان (خفتیده) دەکانووستن (کان) کانی، کانی نووستنەکەش ماوە لە خوار قەڵاتەکە ئایا ئەمانەش هەر لێك دانەوەو رێککەوتە وەك ئەو هەموو دەها ناوەی یەك لە دوای یەکە حوکمی ئەیوبیان سەد ساڵێکی خایاند هۆلاکۆ هات دوامەلیکی ئەیوبی ملك سالحی کردە چوارپارچە، دیارە قەڵاتی خفتیان الزرزاری یان (باب خفتیدکا ابی علی زەرزاری) بە واتای قەڵاتی سەلاحەدین وێران کراوەو تێك دراوە، کە واتە لەو مێژووە (١٢٣٢ز) قەڵای خفتیدکان وێران بووە وردە وردە کە ترسو حوکمی زەرزاریان نەما لەسەر ناوچەکە دووبارە (دوین) بەناوە کۆنەکەی سنووری کە کەلاوە بووە ناونراوەتەوە، جا بۆی هەیە یاقوت الحموی بە خێرایی تێپەڕی بێ ئەوکاتە هەستی بەوە نەکردبێ یا نەیپرسیبێ یان خەڵکەکە وەك نەهێنی نەیاندرکاندبێ (دوین)ی هەر بە ناوەکەی ئەوکاتەی خفتیان الزرزاری تۆمار کردبێ. ئایا ئەم هارمۆنییەتە لە هیچ شوێنێکی دیکە دووبارە دەبێتەوە لە دوین زێتر ئای بۆ ناوی قەڵاتی زەرزاریان بووە لەو ساڵە کە ئەگەر لەبیرم مابێ لە دەوری ساڵانی ١٢١٧م بێرە تێپەڕیوە کە هێشتا دەوڵەتی ئەیوبی مابوو دواتر لە ساڵی ١٨١٢م نیپۆر ناوی دەهێنێ (دوین) دیارە گوندێکی لێ ئاوەدان کراوەتەوە. بەڵێ کاك قادر بەم جۆرە وردەکارییەوە لێکۆڵینەوەم کردووە تەنیا لەسەر ئەو

ئەمانە کتێبێك دەنووسرێتەوە کە خۆی لە خۆیدا مێژوویەکە بەندیخانەکەی هەر وەك شوێنەوار ماوە.

باب+ خفتیدەکان+ ابی علی+ زەرزاری= شوێنەوارەکانی دەرگای دوین+ کانی خلوە کە کەنیسەك و شوێنی نووستنە لە ئەشکەوتێکی بچووك صلاح الدین +زەرزاری کە هۆزی سەلاحەدینە.

کەواتە هەموو شوێنەوارەکە تا دەگاتە بازاڕگە کە یاقوت باسی دەکا ماوە. یاقوت دەڵێ (باب خفتیان موضعان وهکذا یتلفظ بها عامة الناس والکتاب یکتبونها (خفتیدکان) وهما قلعتان من اعمال اربل في جبلنا هذه في ایالة مظفر الدین کوکبیري یقال لاحدهما (خفتیان ابي علي الزرزاري وهي بین اربیل والمراغة(٢٢) کاك ئەشکەنەیی دەڵێ ئەم قسەیەی کاك عبدالله فڕی بەسەر بابەتەکە نییە؟ بەڵێ لە رستەکە کۆمەڵێك قین هەست پێ دەکەم کە ناشیناسم. ئایا ئەم قسەی یاقوت الحموی دیوە کە وەسفی دوینی هەولێر دەکا؟! ئایا دەزانی کوڕی گەورەی سەلاحەدین ناوی ملك الافضل (علیه)(٢٣) بوو لە (١٧) کوڕان نەخێر ئەمە وتمان ئیبن کپیر راست ناکا-سەلاحەدین زەرزاریە شیعرەکان راست ناکەن (بنی الاصفر)(٢٤) زەرزارن سەرکردەکانو قازییەکان زەرزارن زەردی لەبەر دەکرد ئاڵای زەرد بوو خۆ دەبێ ئەوە بزانی کورد بە سەرۆکی خۆی یان گەورەی دەڵێ لەزۆر لاوك و گۆرانی فلکلۆری هەیە. بەڵام لە هیچ نووسینێکی مێژوویی ئەمە نانووسرێ، چونکە ناوی خۆشەویستی ناو میللەتە ئەگینا دەزانین ناوی یوسف بوو الخگگ بصلاح الدین و پێشی خۆش نەبوو پێ بوترێ صلاح الدین وەك دەزانی ئەمر پێی خۆش نەبوو پێی بوترێ (سیادە الرئیس) کەواتە ئەمجۆرە ناو گۆڕینانەش بە درێژایی مێژوو هەیە وەك موسڵ کاتی (نواردشیر) بوو لەسەردەمی ساسانیان، بووە موسڵ ئێستا نەینەوایە، کەرکوك پێشتر باگەرمی بوو، دواتر بووە کرخینی و دوای ئەوەش بووە کەرکوك ئێستا (تأمیم)ە، گوندی دیانە بووە قەزای سدیق ئێستا لەسەردەمی فیدرالی بووە قەزای سۆران هتد، ئایا دەتوانێ بڵێی وانییە خەفتیان نییە نەخێر (وانییە) لەخۆڕا نابێ بە تاوانباریشت دەزانم بەڵام دەتوانی بچییە دوین بەرد بەرد دیوار دیوار وێنەی شوێنەوارەکان بگری کە بزانی لەگەڵ وتەی یاقوت الحموی دەگونجێ یا نا ئەگەر نەگونجا دەتوانی تەنیا بۆ ساغکردنەوەی ئەم قەڵاتە بنووسی (فێڵ و هەڵەشی تێدا بکەی وەڵامت دەدەمەوە)، نووسینی زانستییانە وادەبێ کە نایزانی تا ئێستا (دوین)ی هەولێرت نەدیوە رێگاش بەخۆت دەدەی باسی بکەی.

*باسی ناوی سەعیدی کردووە کە بەسەری زمانم داهاتووە وتوومە رێککەوت نییە دوای ئەم هەموو بەڵگانە ناوی ئاغای زراریان سەعید بێت تیشکی خستۆتە سەر، دووبارە دەڵێم یەکێ شارەزای مێژووی ئەیوبیان نەبێت باسکردنیان نامەکروفە.. (شادی) باپیریان بوو لەتکریت نێژراوە کە شێرکۆ بووە (ئەسفسالاری) میسر ناوەکە دەوڵەتی شادی بوو کە ناوی باوکیەتی کە ئەو نەما سەلاحەدین بووە ئەسفسالار ناوی دەوڵەتەکە بووە الدولە الصلاحیە پاشان الایوبیە. کورد پاشاکان ناوی باوك و باپیرانیان لە منداڵەکانیان دەنێن ئایا کوڕی سەلاحەدین بۆ ناوی الجواد ابو سعید ایوب رکن الدین بوو زاواکەیان کە کوڕیشی نەبوو ناوی خۆی نابوو (ابو سعید کوکبری) کە ئەمە لە ژنەکەیەوە خوشکی سەلاحەدین دیارە

کوردەکانی زەرزاری شـانازیان بـە شـادییەوە کـردووە بەڵام بۆ ناوەکە شادی کە لە سەعیدەوە هـاتووە بـووە (سعید) بە عەرەبی چونکە شادی بە مانای نەشـیدبێژ (مەیمون) دێت بۆیە کرایـە سـەعید (شـێرکۆ) کرایـە (اسدالدین)و بەڵگەی راست ئەوەیە کە ئەو بنەماڵەیـە لەوانن بەخۆیان نازانن ناویان ناونراوە یوسـف سـەعید یوسـف چونکـە تـەنیا سـەلاحەدین وەك وتم نـاوی (یوسف) بوو المخگگ بصلاح الدین بە واتای تەنیا لـە نووسین دەنووسرا صلاح الدیـن کـە خـەڵکی هـەولێرو زەرزاری نـەخوێندەوار بـوو بـە بەڵگـەی وێنـەی سەرکێلەکان بۆ زەرزاری وێنـەی رۆژیـان کـردووە کـە نیشانەی زەرد گۆپال بۆ (رەوەندان) کە شوانن، کەواتە ئـەوان هـەر بـە (یوسـف) ناسـیویانەو خوشـکی سەلاحەدین لە هەولێر بوو خێزانی (ابو سعید کوکبری) بوو ئایا ئەمەندەت بەس نییە کە نەتدەزانی؟ سـەعید لەلایان گەورە بووە جگە لەوەی ئەم بنەماڵەیە کتلـەو گروپ گروپیشیان هەبوو، کاتی نییە باسی بکەم.

ئایا ئەمجارە سەعیدو یوسفو مـەروانو زەرزاریو زراریو رەوەندو (دوین)و سنوور خفتیان الزرزاری رێك کەوتن لەگەڵ بەڵگـەکانی دیکـە-ئەگـەر ئەمانـە لـە (دبیل)ی ئەرمێنیا هەبوو کتێبخانەکەشم دەسـووتێنم. یان دەتانەوێ سـەلاحەدین لـەم هـەموو شـوێنەوارەی بکەنو، کوردستانیش لە شوێنەوارەکە دابڕێنینو بیدەن بە ئەرمەنیان. بڕوا بکە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا کە بزانـن شوێنەواری سەلاحەدین لە هـەولێر دۆزراوەتـەوە زێـتر رێزمان لـێ دەگرن چونکە دەزانن دەتوانین بـە هـەمان هێز دۆستایەتی بکـەین. ئەگـەر سـەلاحەدین بـە زۆر بکەنـە ئەرمـەنی ئـەوە مانـای ئەوەیـە دەوڵەتەکـەی کوردی نییەو کوردیش بەشداری نەکردووە چونکـە لـە (دبیل) نە کەسی لـێ نییە لـە کـوردو هۆزەکـەی نـە شـوێنەوار ئەوکاتـە دەبێتـە (مقگـوع مـن الشـجرە) خەڵکی دەتوانن بڵێن لە دەوڵەتی ئێمە موچەخۆر بـوو بەرێککەوت بوو بە سەرۆك نەك بەهێزی کورد.

## (یاقوت الحموی سەرلێشێواوە)

ئەم برادەرانە گرەو لەسەر یـاقوت الحمـوی دەکـەن دووجار قین لەدڵ لە ئەیوبیانو کـورد ١-کـە رۆمـیو ئەرمەنییە ٢-حەمەوی خەڵکی بەغدایـە، وتەکەشـی دەربارەی (دوین) بێ سەرو بەرو بێ مانایە من تـەنیا داوا لـە رۆشـنبیرانو مێژووناسـان دەکـەم لێـی ورد ببنەوە، بزانن چەند بە پێچەوانەی خۆی قسەی کردووە چەند ناشارەزایە. کە دەڵێ: دویـن بلـدە مـن نواحـی ئاران في آخر حدود اذربیجان بالقرب من تفلیس منـها ملوك الشام بني ایوب)(٢٧) کە مانای بەمجۆرەیە:

١-دوین شارۆچکەیەکە لەلای ئـاران-کەواتـە لـە ئاران وڵاتی ئاران

٢-لە دواسنووری ئازربیجـان-کەواتـە مەبەسـتی ئازربیجانە

٣-لـەنزیك (تـەفلیس)-کەواتـە لـە کـەرەج (جۆرجیایە).

پاشان لە (المشترك وضعا والمفترق صفعا) کە باسی ناوە دووبارە کراوەکانو پێکچووەکـانی دونیـا دەکـاو دەڵێ.

(دبیـل فی ارمینیـا و(بـاب دویـن) فی ارمینیـا ص١٧٦ ص١٨٨ ص ١٧٥ زبیر بلال الاکراد ٩٤(٢٨) کەواتە (دبیل) جیایە لەگەڵ (باب دوین).

دەپرسم: تەنیا دەپرسم لەکاك نەشکەنەییو یاقوت سەرسام بـوو (دیـون) لـەکام شـوێنە؟ چۆن دەبـێ

تێنیکی فۆریمەری کوردی نزیك هــەولێر لــە چـوار دەوڵەت بێت نە یەك کاتدا ١-ئاران ٢-ئازربێجان ٣-ئەرەج ٤-ئەرمینیا؟ ئەمە یاقوت الحمویەکەتان یاری حەمیەتی کورد دەکا، من بڕوا بــەچیو بــەکام شـوێن حکم کە دوینی لێیە! چـوار دەوڵـەت کـە ئێسـتا ١-ئازربێجنی سۆڤیەتی پێ دەڵێن ٢-ئازربێجانی ئێرانــە ٣-جۆرجیای روسی پێ دەڵێـــن ٤-(ئـەرمینیای) پــێ تعیق. من خۆم یەکەم بەرهەمی چاپکراوی شیعریم لــە ساڵی ١٩٦٩ بەستەی گومان بوو گومان لەوە ناکــەم. جا ئەگەر ئیبن خەلەکان کە مەبەســتی (اهـل التـاریخ یاقوت الحموي) بێ چونکە بــە ئیـبن الاثـیری دەگـوت دەڵێم (کـل مبــني علــى البــاطل بــاطل) لـــــە دەستنیشانکردنی (دوین) لەسەر ســنووری ئازربێجـان بۆیە هەر ئاران‌و قەراجەکــەی (کــەراج) خۆمانــە بــەو ئاران‌و گورجستانە تێگەیشتوون.

وەسفەکانی دیکەی (رجل عارف)ی ئیبن خەلــەکان هەمووی بەگوێرەی شوێنەواری (دوین) هەولێر هەموو تەواوە تەنیا پرسیارێکەم ماوە لــەکاك قـادر دەپرسم ئەگــەر یــاقوت ســوور دەیزانــی (دویــن) دبیـــل لـــە ئەرمینیایە بۆ یەکەم جار نەی دەوت (دویــن مــن آخـر اعمال ارمینیا من جهة اذربیجان) یەکسەر (دبیـــل)ی دەگرتەوە... ئایا بەڕێزتان چــۆن گــرەو لەســەر وتــەی مێژوونووسی واشــێواو دەکــەن، باشــە مانــای (قـرب تفلیس) کە پایتەختی جۆرجیایە مانای چی-کەواتە بە وردی بەدوای لێکۆڵینــەوە مەیدانییەکــەم بکــەون جـا دەزانن لێکۆڵینەوە بۆ میللەت‌و جیهان‌و زانیاری تــازە زۆر جیایە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەنێو چوار دیــواردا بــۆ شەهادەو مووچە.

*کاك قادر دەڵێ: شەرت نییە گۆڕی مەروان) هی مەروان بێ چونکە گۆڕی سوڵتان موزەرفــەر هــی ابـو السعید کوکبری کوڕی دەرچوو.. توخوا ئەمە مەنتیقی مامۆستای زانکۆیە کەواتە گۆڕی (پیر مەروان) بەمــە بێ گــۆڕی شــادییە گــۆڕی شــادی هــی ئەیوبــە کەلــە حیجازە گۆڕی سەلاحەدین هی ئەیوبە گــۆڕی باپــیرت هی باوکمە.

*دەڵێ: سەرسام زۆرشتی بەلاوە ناوە دەپرسم کــێ ئەم بەڵگە بەهێزەی هەر باس نەکردووە کە ئەمانـــەتی عیلمـی ئــەوە دەخــوازێ موناقەشـــە لەگـــەڵ خاڵـــە بەهێزەکان بکرێ پاش ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی (دبیــل) بە تەنیا بەبێ من کەوا بزانــە مــن هیچم نەنووسـیوە ئینجا بڵێ خاڵەکانی (دبیــل) لــەو خــاڵ‌و شـوێنەواری (دوین)ی هەولێر ئاشکراترو زانستی ترە.

١-تــەغری بــەردی لــەکتێبی النجـوم الزاهــرە فی ملوك مصر والقاهرە ١٤١٠-١٤٦٩ کە دەڵێ (دوین- بلدە صغیرە فی العجم وهو من الاکراد الروادیــە-وهــو الاصــح)(٢٩) ئایــــا وشــــەی (وهــــو الاصــــح) بەرپەرچدانەوەی بلدە صغیرە فی ارمینیا نییە ئایا کەی کورد بە ئەرمەنی وتووە عجم باشە نەیدەزانی بڵــێ فی ارمینیا کە هەمیشە ئەرمێنیا هەر هەبوو. باشە لـــەم شیعرە عیماد الدین الاصفهانی کاتبی صلاح الدین کە وشەی عجم بەکار دەهێنێ مەبەستی ئەرمەنییە؟

**ارجو بابي اليكم ظـافرا عجلا فقـد ظفـرت بنجـم الدين ايوب**

**موفق الرأي ماضي العزم مرتفـع علـى الاعـاجم مجدا والاعاريب**(٣٠)

کە دەکا عارەب‌و عەجەم لە موسڵمانەکان.

*ئەم خاڵەی لەلام زۆر گرینگە وتەکانی خۆی لەبیر دەکا کە بەمنی وتووە ئایا سەرسام ئامێری تەمەن پیوانی کێلەکانی بەکار هێناوە؟ دەڵێ هی سەردەمی ئەیوبییانە بەڵێ کورد پەروەران سیاسەتمەداران رۆشنبیران پاش ئەوەی (١٥) جار دوینم دیوە ئەو هەر دوینی نەدیوە نەك ئامێر بەکارهێنان لەلاپەڕە (٤٠)ی هەولێر دەڵێ:

(بۆ دۆزینەوەو دیاریکردنی سەردەمی ئەو کێلو گۆڕانەی کە هی چەند ساڵێك دوای ئەیوبیانن) کاك ئەشکەنەیی مامۆستای زانستپەروەر چۆنت زانی هی دوای ئەیوبیانن-پێشتر نەتوت هی سەردەمی ئەیوبیانە ئایەتی قورئانی لێ نووسراوە میللەت خوێندەوارتر دەبێ یان نەخوێندەوار بەلام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە وەك ئەو برادەرە خەڵکی کوردستان نەبێ وایە گوندی نەدیوە کە لە هەموو گۆڕستانی گوندەکانی کوردستان ناو لەسەر کێل نەنووسراوە زۆر کەم ئەگەر لەسەردەمی ئێستا بنووسرێ بەلام نەخشی خەنجەرو کەرستەی مردووی لەسەر کراوە.

بۆ مەسەلەی گۆڕی مەروان گۆڕستانەکەشی بەناوکراوە بەڵگەیە وەك گۆڕستانی شێخ مارف (شێخ ئەحمەد) ئاواش ناوە کوردییەکە لەو سەردەمە (پیر مەروان) ناونراوە.

*باسی نەخشەی ئازەربێجانی کۆن دەکا دەڵێ لسترنك دروستی کردووە کە سنووری ئازربێجان لە بەیەك گەیشتنی هێڵی ٣٦,٥×٤٤ دایە هەروەها (دوین) هەولێریش لە هەمان شوێنی بەیەك گەیشتنی هێڵی ٣٦,٥×٤٤ دایە. ئایا ئەمە بەڵگە نییە کە (دوین) لەسەر سنوورە، جگە لەمانەش بەڵگەی مادی هەیە وەکو دیواری سەرچیاو هەبوونی (باب چیچك) کە ئەوەش سنوور بووە، ئەمە هەزار بەڵگەی مەیدانی (بەلام (دبیل) سێ بەڵگەی مەیدانیشی نییە)و لەسەرەتای دۆزینەوەکەمداو بەر لە شەش ساڵ وتوومە، بەلام ئەم مامۆستایە کە دەرچووی زانکۆیە تا ئێستا (اطلس التاریخ الاسلامي)د. هاری د. هازاردی نەدیوە کە سنووری ئازربێجانی تێدایە یان (الاطلس التاریخي) شرکە مکملان المحدودە-لندن)و دەها ئەتلەسو نەخشەی دیکەی سەردەمە کۆنەکان دەڵێ خەریتە کە لترنگ دروستی کردوو کە لە زانکۆکانی جیهان دەخوێندرێو لێی کۆڵراوەتەوە کاکی برا ئەم دۆزینەوە زۆر کەس فێرە مێژوونووسینەوەو لێکۆڵینەوە دەکا-ئینقلابێکە لە مێژوونووسینەوەی کورد ئەم وتانەشم کاتو شوێنی خۆی هەیە. چونکە مێژووییە.

*کاك ئەشکەنەیی دەڵێ هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن (دبیل) لە ئەرمێنیایە هەندێکیش دەڵێن لە ئازربێجانە) کەواتە دەبێ ئێمە گومان لەوە بکەین دوو (دبیل) یا (دوین)و (دبیل) هەیە چونکە نابێ شارێك لە دوو دەوڵەتو دوو شوێن بێ ئەگەر شارێکی دیکە نەبێ لەو حاڵەتە دەبێ یەك لای بکەینەوە وەك کردم.

*بۆ مەسەلەی زەرزاری بوونی سەلاحەدینیش بەدرێژی باسم کردووەو هیچ گومانی تێدانەماوە وتەکەی ئیبن کپیر کە دەڵێ شێرکۆ زەرزارییە- شیعرەکان-سەرکردەکانی زەرزاری-بەشداری هۆزی زەرزاری لە جەنگ هەبوونی (دوین) لەنێو زەرزاریان- ئالای زەردیان کێلی (رۆژ) لەسەر (دوین) کە رەمزی زەردە. تۆ ناتوانی لە خۆتەوە بڵێی وا نییە (نە مەرجەعی) نە منیش قوتابی تۆم، نە پسپۆڕی سەردەمی ئەیوبیانی نە خاوەن وتارو کتێبی لەسەر

ـەوییان نە (دوین) نە (دبیل)ت دیوە نە ـێکۆڵینەوەت پێشی من کردووە!!

*زەرزارییەتی سەلاحەدین بەمجۆرەی خوارەوەی

١-ئبن کثیر کە دەڵێ ناوی سەلاحەدین شێرکۆ الکردی الزرزاری وهم اشرف شعوب الاکراد)(٣١)

٢-یارمەتی زەرزارییەکان لە قەڵاتی سنجار بۆ سەرخستنی سەلاحەدین.

٣-بەشداری هۆزی زەرزاری لەگەڵ هۆزەکانی تیکە.

٤-قازییەکانی سمساط(٣٢) دمشق(٣٣) میسر(٣٤) زەرزاری بوون.

٥-لەکاتی مردنی سەلاحەدین، یەکەم کەس تەمەدبوو نوشیروان الزرزاری بوو.

٦-پاڵەوانەکان أ-شێرکۆ بن باخل الزرزاری ب-جمال الدین شروین الزرزاری کە شەڕی قودس لەسەر شەرزوو کرا.

عالمەکانی هەولێر ابو العباس الزرزاری.

٧-شیعرەکانی ئەیوبییە بە زەرزاری لە قەڵەم دەدا بە عەرەبی وەك:

**زارت (بني الاصفر البيض التي لقيت**

**حمر المنايا بها مرفوعة الحجب[٣٥]**

**بـاري الراية الصفراء يرمي اصطفاقها**

**(بني صفر) بالراعفات الهاذم.**

**يان: راياته صفراء تودو تنثني**

**حمراء تميج نجيع (ال الاصفر)[٣٦]**

٨-ئاڵای سەلاحەدین زەرد بوو ئەوشیعرەی سەرەوە بەڵگەیە

٩-بەشێك لە جلکی سەلاحەدین زەرد بوو[٣٧] ص٢٠٥ ج٦ وفيات

١٠-زەرزارییەکان سەر بە هەولێر بوون(٣٨) ص٦٠ ج٢ الروچتين

١١-زرارییەکان پاشماوەیان لە تەك (دوین)ی هەولێرە

١٢-کێلی گۆڕی (دوین) هەندێکیان وێنەی (ڕۆژی) لەسەرە بە مانا زەرد دێت. لەگەڵ کێلی (مەروان) لە ئەجندانکان قەڵاتە (جن).

ئایا ئەمانە لە مەنتیقو لەلای مامۆستای مێژووو پسپۆڕ ڕێککەوتن؟!

سەلاحەدین زەرزاری نییەو خەڵکی ئەو دوینەی لای زراریانیش نییە؟!.

بۆ بەختی کورد دەگرییم مامۆستای مێژووی کوردو کوردستانی سەد خۆزگەم بە یاقوت الحموی‌و داگیرکەران، یان ئەمانەش هەموو ڕێککەوتن ئایا لە گوندی ئەشکەنە بۆ ئەم هەموو ڕێککەوتە نییە؟ (یان کێلێك رۆژی لەسەر بێ) یان لە (دبیل) ئەم هەموو پاشماوەیە لە هۆزو شوێنەوارو گۆڕستان) بەڵام دبیل هەوە حوکمی عەسکەرییە بێ لێکۆڵینەوە کیتابەکەشم دەبێ قەدەغە بکرێ. نەهێڵن وەلامیش بدەمەوە. بەمجۆرە دەتانەوێ سەلاحەدین پاش دۆزینەوە لە ڕەگوریشەی دەربهێنن‌و وشکی بکەن‌و فڕێیدەنە ئەرمێنیا و لە خزم‌و کەسی هەولێرو کوردی بکەن، خەیاڵتان خاوە ناوکەکە لەلای زۆر کەسە.

*دەڵێ (دوین) لە (دوین) سوغری سنووری نەهاتووە کە بەمانای دەرگای سنووری دێت باب دوین (باب چیچك) کە لەسەر هێڵی ٣٦,٥×٤٤و سنووری ئازربێجانی کۆن بوو[٣٩]

*دەڵێ شوێنەواری عێراقی بە عاتیفەی نیشتمانی وای وتووە-دەپرسم زانیمان وەك ئەوان عاتیفەت نەبوو بەڵام ئەم دڵدارییە بۆ لەگەڵ ئەرمێنیا دەکەی، کە

سەلاحەدین بە دوژمن دەزانیٚ‌و نایەویٚ-بەڵام کەچوویە میسر نەڵێی لە نەوەی سەلاحەدینم. سەیری فایلی شوێنەواری ٥١٣ کە لە رۆژنامەی ژمارە (٣٠٣٣) ١٩٥٢/١١/١٥[٤٠] بڵاو کراوەتەوە، لە دلیل الاثار العراقیة ئاماژەی پێکراوە.

*شەرەفخانی بەلاوە ناوە بەڵگەیەکی زۆر گرینگە شەرەفخانی بەتلیسی کە دەڵیٚ (دوین) ئێستا ویرانە کە دەکا ساڵی (١٠٠٥)ی کۆچی[٤١] زیاتر لە چوارسەد ساڵ بەر لە ئێستا، ئێستاش ویرانە لەسەردەمی ئوغز بەگی میرانی سۆرانیش ویرانبوو ئایا دبیل رۆژێك ویران بووە دەتوانی بیسەلمێنی؟ ئەگەر سەلماندتان شەرەفخان راست ناکا... بەمجۆرە دەتوانی بڵێی ئیبن کثیر راست ناکا!!

*ئەگەر باسی من‌و شوێنەوار دەکەن لە منداڵییەوە عاشقی شوێنەوارم‌و گۆڤاری سۆمەرو مێژووی ئاشووری‌و بابلی‌و سۆمەری‌و میدی‌و ئەشکانی‌و زەردەشتی شوێنەوارەکانیان گەڕاوم. کە (٣٥) ساڵە وابزانم ئەم دۆزینەوانەش بەرهەمی ئەودەمە بەردو ئەخشی سەردەمەکان بەچاو دەناسمەوە ئەمەش جیاوازییەکی دیکە لە خزمەتی مێژووی کوردم داناوە.

بۆ نموونە لە شەستەکان لە سیٚ مەوسمی شوێنەواری قالنج ئاغا ئامادە بووم کە چۆن دەیانپشکنی* وەکو پیشەی رۆژانە.

٣-باسمانکرد، هەولێر مەشهور نەبوو بەقەدەر رۆم لەپێش ٥٢١ ساڵی کۆچی وەك چۆن (ئاران)ی (دوین) هەولێر مەشهور نەبوو پاشان نەیاندەزانی (دوین) دەکەوێتە کام شوێن لە سنووره دوورو درێژەکەی ئازربێجان کە لە سەرووی ئامێدییەوە هەتا نزیك سلێمانیەی ئێستا بوو (مجمع باینجان)، بۆیە وتیان مما یلی الروم لەسەر ئەم سنووره دوورو درێژە، سنووری ئەرمێنیاش هەتا نزیك خوار دەریاچەی وان‌و (خلاط) بوو چۆن (دبیل) کە لە سەرووی رووباری (رس)ە لە روسیا کردە وەك (خوا کورك)‌و سنووری سیٚ دەوڵەتانی رۆم‌و ئازربێجان‌و ئەرمێنیا کوا ئەخشەکەت‌و کوا بەڵگەو سەرچاوەت مامۆستای بەرێزی زانکۆ.

٤-بەڵیٚ باسمان کرد (دوین) ناوی قلعە خفتیدکان ابی علی الزرزاری بوو لەسەردەمی سەلاحەدین، هەر ئەمەش بوو (دوبیل) کە (و) لەلای هەندیٚ شێوە دەبێتە (ڤ) بووە دڤین دوین، دبیل، بە (دوین) هەولێری نەزانراوو نامەشهورو نەناسراو بزانن وەك بەدرێژی باسمانکرد (پاشان هەر ئەو (دبیل)ە بە زێدی باپیرانی سەلاحەدین تێبگەن).

بۆیە ئێمە پشتمان بە شوێنەوارەکە بەست هەردوو (دبیل)‌و (دوین)م خستە بەر باس‌و لێکۆڵینەوە گەیشتمە ئەنجام (دوین)ی هەولێر هەوە ئینجا چوومە سەردانی لێکۆڵینەوەی ئارکولۆجی‌و مەیدانیم کرد-سەرسام بووم کە ئەم دەها بەڵگەیەی لێیەو کەس هەستی پێنەکردووە. خۆ ئەگەر ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەم (دبیل) بوایە بەلامەوە گرینگ نەبوو زۆر بەراستگۆیی بە میللەتم رادەگەیاند هەمان سەرکەوتن‌و بە هەمان خزمەتم دەزانی کە (دوین) هەولێر دەرچوو چونکە لە (دبیل) بوایە ئەم سەلاحەدینە نەدەبوو کە خزم‌و عەشیرەت‌و کوردی لەپشت بوو چونکە هەر سەرۆك هۆز بوو بۆیە لە هەموو جەنگەکانی دژی فاتیمی‌و ئەتابەکە سەلجوقییەکان سەرکەوت‌و حوکمی کوردانەی گرتە دەست. چونکە خەڵکی (دوین) هەولێر بوو بە هێزترین

ەوڵەتی کوردی هۆزەبانی بوو دەوڵەتەکەش
هێنانی دەوڵەتی باوك و باپیرانیەتی،
یەکانیش هەتا زرارانی بارزان و (٢٤) گوند لە
ە باسی سورچیان و تا دەگاتە شنۆو قاسملو
گرتەوە کە کۆنە زەردەشتی بوون و دوا
کۆتینەوەمە کاتی نییە، ئەوەشم لەبیر نەچێ
یەکان پێیان دەڵێن (توخمی باسی) کە دەکاتە
خمی عەباسی) کە بەڵگەیەکی دیکە بە(جێگری
حوکمی عەباسیان) بوون کە سەلاحەدین لەسەر لاشەی
تی عەباسی و بە ناوی مەزهەبی سوننی عەباسی
تی رووخاند، بۆیە ئەمەش بەرێککەوت مەزانە(٩)
گوند لە زراریان ماڵە باس بن کە ئەبو سەعید
کوکبەری و ئەبو سەعیدی کوڕی سەلاحەدین و سەعید
یوسف خۆیان بە نەوەی شادی و ماڵە باس بزانن یا
خۆیان پێ هەڵبدەنەوە، چونکە (توخمی باس)
ی تاخمی عەباسی، (وەك عەباسی) خۆیان
جێگرو میراتگری عەباسیان دەزانی.. ئەویش کە
حوکمی فاتیمان لە میسر لەناو برد (خوتبەی
عەباسیان) خوێندەوە دەوڵەتی میسریان کردە عەباسی
ئەو کوردە زەرزارییانە بوون کە ببونە جێگری
عەباسییەکان هەتا ئێستاش ناوەکەیان هەڵگرتووە،
نەوەی مانای بزانن وەك مانای یوسف و سەعید
نەدەزانی ناوی ئاغاکەیان بوو خاوەنی قەڵاتە جن
شوێنی ... (مەروان) باپیرە گەورەی سەلاحەدین نەڵێ
لەخۆیەوە دەڵێ (باس) (عەباسە) ئەگەر بڕوا
هەموو کوردێك بپرسە کە کورد بە عەباس
(باس) کە وتت توخمی (باسی) بە مانای توخمی
عەباسی دێت رێك جێگرو تاخمی عەباسیان
گرتەوە، سەیری ترسناکترین بەڵگەمان دۆزییەوە کە
مێژوو لە هیچ کتێبێك تۆماری نەکردووە ئایا دەتەوێ
راوەستم نهێنییەکان نەدۆزمەوە دۆزینەوەکە هەروا
بەرەو پێشەوە دەڕواو هەڵە قەبول ناکا وەك نەخشەو
ستێنسل ئەگەر هی یەك بن لەسەر یەك چەشن دەبن.
واز بێنن هەڵەتان بەهەڵەی دیکە بە هەڵە داوانتان
دەبا، هەڵە بە هەڵە لەناو ناچێ راستیش راستی
لەدوایە ئێستا زانینتان شوێنەوار چەند گرینگە.

*کاك قادر دەڵێ دەزگاکان مامە حەمەییان
کردووە، لە بلاوکردنەوە) کە مەبەستی ئەوەیە گوایە
بۆمن) منیش دەڵێم (ئایا وات پێ باشە کە
وەلامدانەوەم لێ قەدەغە بکەن)و بۆم بلاو نەکەنەوەو
ئەوە مەبەستی تۆیە؟ بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەگەر
وایان بکردبایە پاش شەش ساڵ وەلامی تۆیان بلاو
نەدەکردەوە کە درێژکم لەسەر تۆ نەنووسیوە،
گەلەکۆیی دەکەن باشە عەبدولرەقیب پێویستی بە تۆ
نییەو ئەگەر مامە حەمەییان بکردبوایە وەلامی
ژمارە (١٣) بەرتۆ نەدەکەوت. شەش ساڵە کۆتایی بە
نووسین و رەخنە نەهات کە ئەمە بەڵگەی بەهێزی و
نەڕووخانی دۆزینەوەکەیە. کاکە چۆن راستی دەڕووخێ
خۆ من وەك هەندێك کاغەز رەشکەرەوە نیم، پێ لە
تەختەی چرووك نانێم.

## وەلامی پرسیارەکان

١-٢= دەڵێ گرینگ نییە سەلاحەدین خەڵکی کام
شوێن بێ گرینگ ئەوەیە کوردە، دەپرسم ئەی ئەم
هەموو رەخنەو نووسینەتان لەپای چی؟! بۆ دەتەوێ
شوێنی زێدی باپیرانی ببەیتەوە ئەرمێنیا؟ خۆ من
نەموتووە کورد نییە هێندە لەسەری بە وەلامی، ئەمە
یەکەم نووسینی تۆیە لەسەر سەلاحەدین چۆن بویت بە
پسپۆر بەڵکو یەکەم نووسینی بەرێزتان کە لەسەر

لاپەڕەی گۆڤار دەبینم باسی تەنقیبات دەکەی، کەچی بە بەڵگەی شوێنەواری عێراقی رازی نی کە دەڵێ (دوین) قەڵاتی سەلاحەدینە دەپرسم بۆ تەنیا لە (دوین)ی هەولێر زێدە لە هەموو عێراق قەڵاتی سەلاحەدین هەیە کاکە برا شوێنەوار زۆر گرینگە مەبەستەکە (شوێنەوارە) چونکە بەهۆی شوێنەوار زۆر نهێنی ئاشکرا دەبێ، مرۆڤ ئەوکاتە لە مێژووی سەلاحەدینو هاتووچۆی هۆزەکانو نهێنی سەربازی دەگا، وەك بەهۆی دۆزینەوەکەم سەدان نهێنیم ئاشکرا کرد.

بۆیە کاکی برا (دوین)ی هەولێر (دوین)ی زێدی باپیرانی سەلاحەدینە (دبیل) بە هەڵە پێی وتراوە (دوین) (دوین) نییە پەیوەندیشی بە سەلاحەدینو هۆزو نەتەوەکەیەوە نییە. شوێنەواریشی لێ نییە؟ تەواو. لەبەر ئەوەی (دوین) هەولێر کەس پێی نەزانیوە بچووك بووە، وەك (دبیل) مەشهور نەبووە هەندێ لە مێژوونووسان بە (دوین)ی زێدی باپیرانی سەلاحەدین ناویان بردووە، چونکە ئارانو (کەرەج)یش هەر لەولای هەبووە، کە لە (دوین)ی هەولێریش (ئاران)و (کەرەج) (قەراج) هەبوو.

بۆیە کاتی باسی (دوین)ێك کراوە کەرەجەکان هێرشیان هێناوەتە سەر مەبەستیان ئەو (دبیل)ە بووە کە ناوی (دوین)یش بووە، کەواتە ئەو (دبیل)ە یان (دوین)ە هەبووە دەبێ تێکەڵ نەکرێ لەگەڵ (دوین)ی هەولێر کە ناوی نەبووە، وەك هەموو گوندێکی کوردستان بەڵام (دبیل) (توین) (دوبیل) پایتەختی ئەرمەنیانو شارێکی مەشهور بووە.

٩-ئیبن ئەزرەق ئەلفارقی ٥٧٢ کۆچی/ ١١٧٦ کۆچی دوایی کردووە پێش ئەوەی حوکمی سەلاحەدین ببینێ وەفاتی کردووە، (دوین) بەلایەوە ئەم مانایە نابەخشێ کە ئێمە مەبەستمانە وەك زێدی باپیرانی سەلاحەدین، باسی (دوین)ی کردووە کە مەبەستی (دبیل) بوو کە سەردەمێك بە هەڵە ناوی (دوین)یشی لێ بووە بەڵێ مامۆستا کە باسی ئەو فارقیە زۆر دەکەن خۆ نەیوتووە ئەو دوینە زێدی باپیرانی سەلاحەدینە جا یاخوا سەد شارو دێهاتی دیکەش ناوی (دوین) دەبوو.

بەڵام خەڵکی (دوین) هەولێر هەر زانیویانە شوێنی سەلاحەدینە هەتا ساڵی ١٨٠٠و دەوروبەری کە بە (نیپوریان) گوتووە یا ساڵی ١٩٧٠ کە بەگۆڤاری رۆژی کوردستانیان گوتووە.

١٠-بەڵێ فارقی راست دەکا زۆر ئاساییە (شادی) میرێکی رەوەندو زەرزاری کە زستان هەواریان (دوین) بووبێ هاوینە هەواریان لەلای هەڵگوردو شنۆو تەرگەوەرو ناوچەی ورمێ نزیك (دبیل) کە پەیوەندی لەگەڵ (منوچهر)ی شەدادی هەبوو بێ ئەمەش مانای کوردپەروەری شادیو بنەماڵەکەیەتی-ئێستاش خەڵکی (دوین)ی هەلێر کە رەوەندن دەچنە هەمان شوێن بۆ کوێستانان، بەڵام مانای ئەوە نییە کە پیاوی (منوچهری) شەدادی خەڵکی ئەرمێنیا بووە لەوێش دانیشتوون یا خەڵکی ئەوێ بووبن. زۆر کەس ئێستا خەڵکی هەولێرە سەر بە ئەنقەرەیە یا سەر بە (روسیا) کە لە سەرووی هەرە سەرووی ئەرمێنیایە، میری شەدادی چووە لای شێرکۆ، بەڵام ئەوکاتە شێرکۆ پیاوی زەنگی بوو، (شادی) سەردەمێکیش لە تکریت پیاوی بەهروز بوو کە قەڵای (تکریت)ی بۆ بەڕێوەدەبرد ئایا لە (تکریت) هەر پیاوی (منوچهر) بوو-نەخێر... ئایا فارقی دەڵێ دوین-دبیل)ی ئەرمێنیا زێدی شادییە-

...حێر- کەواتە ئەمە نابێتە بەڵگە، مامۆستا ئەگەر ...ویە بەنگە حیسابێکم بۆ دەکرد، دیارە مێژوو هەڵە ...ێ هەر چەندە هەندێ کەس هەوڵ بدەن تەفسیر بە ...هەڵبکەن بۆ مەبەستی تایبەتی. دەستکاری (دەقی) ...یەتی (فارقی)یان کردووە لە گوڵانی عەرەبی کە ...دەقەکەی بەم جۆرەیە (وكان ابوه شادي من اتباع هؤا ...تيت وهو بيت قديم ويعرف ببيت ابوا الاسوار بن ...منوچهر وكان يهم جميع ولايه (اران) من جنزي و درز ...وجميع البلاد التي حولهم)[٤٢] ص٣١٦ ژێل تاريخ دمشق، کەواتە ناڵی لە (بلاط)یان ئیشی کردووە کە ئەم دەستکارییە کارێکی ترسناکە لە مێژوونووسینەوە چونکە ماناکەی (من اتباع) ئاشکرایە وەك وتان زۆر کەس خەڵکی هەولێرە لە ئەتباع و تەبەعییە ...عوێتێکە یان شێخێکە یان سەرکردەیەك مانای ...ئیشتی نییە لەگەڵی. باسی ئەوەش ناکا بڵێ خەڵکی ...دوین)ە ئا ئەم دەقەو... هەر بە دەستکاریکردنی ...حەقی ئیبن خەلەکان و ئەم خاڵە ویستوویەتی بڵێ سەلاحەدین خەڵکی (دبیل)ی ئەرمێنیایە بەمجۆرەش ...حەقی ئیبن خەلەکانی دەستکاری کردووە (كما ان اصل الايوبيين يعود الى قرية اجدانقان الواقعة على باب دوين بأرمينيا التي كان جل اهلها من الكرد الروادية وفيات الاعيان ١٣٩٧-١٤١)دا وەك سەرچاوە بەڵێ ئەم بعریتزە لە گوڵانی عەرەبی ژمارە (٦٢)ی تەممووزی ٢٠٠٠)[٤٣] وای کردووە تەنیا بۆ شێواندنی زێدی ...یەتی سەلاحەدین دژ بە من تکایە برۆن بزانن ئیبن خەلەکان وای وتووە. یان هەر لەو نووسینە من زۆر جار باسمانکردووە کە دەڵێ (من اخر اعمال اذربیجان)، ئەم دوو شێوانکارییەش دەخەمە بەر دادگای مێژووو ئەمانەتی عیلمی لەدوارۆژدا.

١١-کاك قادر دەڵێ (حدود العالم) دەڵێ (دبیل) پایتەختی ئەرمێنیاو شارێکی گەورە بووە.

مامۆستای بەرێز ئەم خاڵە لە نووسینە دوورو درێژەکەت راسترین بەڵگەیە کەوا (دبیل) من (اخر اعمال اذربیجان) نەبوو ئەم وتەیەش لەگەڵ رای (ئیبن خەلەکان ناکۆکە کە ئیبن خەلەکان دەڵێ (دوین) لە ئازربێجانە. بەڵێ (حدود العالم) زۆر راست دەکات (دبیل) شارێکی گەورەی ئەرمەنیان بووە کەواتە کە (دوین)ی ونبووی بێ ناوو شوهرەتی هەولێر کە کەس هەستی بە بوونی نەکردووە لەم شوێنە سەختەی کوردستان. بۆیە ناچار دوای گەڕان لە کتێبەکانو سەرچاوەکانی ئەوکاتە وایان زانیوە (دبیل)ە کە جار بەجار (دوین)یان پێ وتووە-ئەمە هەقیقەتەکەیە مامۆستا (كانت (دبيل) في المئة الرابعة اكبر من اردبيل وهي ناحية وبلدة بارمينيا الداخلية)[٤٤] ص٢١٦ بلدان الخلافة الشرقية.

١٢-ابو الفداء کە دەڵێ (وادیارە لە ئەرمێنیایە) بە بەڵگە ناڕوا چونکە گومان لە رستەکەی دایە کە دەڵێ (وادیارە) کە بەخۆی نەیزانیوە هەر لە شام گەورە بووە باوکیشی هەر (دوین)ی نەدیوە باپیریشی با هەر نەیوبی بووبێ.

منیش لە کۆتاییدا سوپاست دەکەم واتکرد زۆر زانیاری دیکە بە ناچاری باس بکەم کەوام دەزانی پێویست نییە بۆیە نەمخستە دووتوێی کتێبەکەم (صلاح الدين الايوبي من جديد) هیوادارم ئێستا بزانی ئەوەی مێژوونووسان مەبەستیان بووە (دوین)ی هەولێرە ئەوەی باسیان کردووە بە هەڵە (دبیل)ی ئەرمێنیایە لە جیاتی (دوین) هەولێریان داناوە-بەبێ ئەوەی هەست بە بوونو شوێنی (دوین)ی هەولێر بکەن، کە لەوکاتەی

سەلاحەدین لەسەر حوکم بوو (دوین) سەر بە ئازربێجان نەبوو ناونیشان گۆڕی بوو (خفتیان الزرزاری)یان پێ دەگوت کە لەو سەردەمە مێژوونووسان لە (دوین) دەگەڕان، لە هەمان کاتدا گومانیان هەر لە (دبیل) کردووە هەو نەبێ وەك یاقوت دەڵێ (دبیل) فی ارمینیا (باب دوین) فی ارمینیا، لەوکاتەی کە (دوین) بەدیلی نەبووە، یا گومانیان لەوە کردووە دبیل لە ئازربێجانە دواسنووریش پاشان لەکام شوێنی ئازربێجان (آخر اعمال) روو لە رۆمی بێزەنتی-یان روو لە ئاران و کەرەج، لە وتەکانیش بەدیار دەکەوێ لەسەردەمی ئیبن خەلەکان موناقەشەی (ابي طي) دەکا.... یا تغری بردی دەڵێ (دوین بلده صغیره فی العجم (مەبەستی وڵاتی عەجەمە نەك ئەرمێنیا) پاشان دەڵێ وهو من الاکراد الروادیه، پاشان دەڵێ (وهو الاصح) کە ئەمەش بەرپەرچی (دبیل)ی ئەرمێنیایە، بۆیە باسی (دوین)و پایتەختی رەوەندان کە ئێستاش لە ناوەندی رەوەندانە (دوین)ی هەولێر (دوین)ی خفتیان الزرزاری (زرزاریانە) بەڵام ئەوان نەیان زانیوە لەکام سنووری ئازربێجانە-سەرەوە خوارەوە یان رۆژهەلات یا رۆژئاوا و جیهەتی (روم)، کە زانیویانە لەسەر سنووری ئازربێجانە لە جیهەتی (روم) نەیانزانیوە لەکام شوێن لەو سنوورە دوورو درێژە بۆیە بە ناچاری وتوویانە لەلای رۆم دواتر (ئاران و قەراج)ی هەولێر کە (دوین) لەناوەڕاستیانە دووبارە گرفتی پەیدا کردووە بە (ئاران)و (کەرەج)ی لا ئەرمێنیا تێکەیشتوون، لە ئەنجامی کۆتاییش هەر سوودمان لە ئیبن خەلەکان وەرگرت بەرد بەرد دار بەدار دێ بە دێ (دوین)ی هەولێرو شوێنەوارەکانی لەگەڵ راکانی گونجاو راستەو دروست بوو، شوێنەواریش بەڵێ هەموو نهێنییەکان ئاشکرا دەکا زۆر لاپەڕە هەڵدەداتەوە لەو رووداوە تایبەتمەندییانەی، مێژوو لەسەر هۆزو بنەماڵەکەی ئەیوبیانی نەنووسیوەتەوە. بەردوو دارو گۆڕستانەکەو خەڵکی ناوچەکەش دەبن بە شوێنەواری بیرەوەرییەکانی ناوچەکەو مێژوومان بۆ دەگێڕنەوە، سەلاحەدین چونکە شوێنەکەی نەدۆزرابووەوە بۆیە هەستمان بە بوونی نەدەکرد وەك کوردو رەگەکانی رەسەن بەمە گیانی سەلاحەدین ئاسوودە دەبێ جارێك کە کورد یارمەتیاندا، وەك سەرکردەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جارێك وەك مێژووی جولانەوەی میللەتی کورد لە سەردەمەکانی رابردوودا...

## سەرچاوەکان


١-لە وەڵامی ژمارە (١٣) مەبەستم سێزدەمین کەسە کە وەڵامی دەدەمەوە.

٢-شهاب الدین ابی محمد عبدالرحمن اسماعیل ابن ابراهیم المقدسی

-الروضتین في اخبار الدولتین ص١٦١ ج١ ص٢٣٥ نفس المصدر وکذلك ص٣٦ من کتاب اربیل في العهد الاتابکي وشاکر الکبتی عیون التواریخ ص٢٤٢-ص٣٨٥ ج٢٠ وکذلك ص١٤٩ ج٢-اخبار وفات الامیر عزالدین موسك بن جکر (جقر) (جیَطر) وهو ابن خال السلطان وکذلك ص٢٣٥ ج١ من الروضین في اخبار الدولتین-عزالدین موسك بن خاله.

٢-شهاب الدین المقدسي-الروضتین في اخبار الدولتین ص١٤٩ وانظر الی ص٢٤٢ (الامیر عز الدین بن ابي الهیجاء بن محمد عز الدین الهذباني الاربلي والی دمشق توفي ٧٠٠ه وشاکر الکبتي ج٢٠ وابن المستوفي ص٢٠٦.

٣-دكتور محسن محمد حسين اربيل في العهد الاتابكي ص٣٣-٣٧ والتاريخ الباهر في الدولة الاتابكية ص٣٠ لابن الاثير.

٤-س. ج ادمونز-المشكلة الكردية ١٩٦٥ منشورات د/ عفيف حامد برزنجي.

٥-س.جـ ادمونز

٦-شهاب الدين المقدسي الروضتين ص١٦١ مطبعة وادي النيل ١٢٨٧.

٧-گۆڤاری هەزار مێرد ژمارە ١١ ساڵی ٢٠٠٠.

٨-احمد الصوفي خطط الوصل ص١٣٤.

٩-شەرفخانی بەتلیسی-شەرەفنامە-هەژار موکریانی.

١٠-محمد حسين دياربكري-تاريخ الخميس في احوال انفس نفيس.

١١-ابن المستوفي ص٢٧٤ يان زبير بلال-تاريخ اربيل ٧٢.

١٢-ابن خلكان-وفيات الاعيان من ابنا و انبا و الزمان ص١٣٩ ج(٦).

١٣-هەژار موکریانی-هەمبانە بۆرینە.

١٤-لسترنك-بلدان الخلافه الشرقيه ص٢١١

١٥-نفس المصدر السابق ص٢١٦.

١٦-نفس المصدر السابق ص٢١٦.

١٧-ابن خلكان-وفيات الاعيان ص١٤٢.

١٨-گولان العربي العدد (٦٢) فلاديمير مينورسكي.

١٩-اطلس التاريخ الاسلامي. هاري/د/ هازارد ١٩٥٤.

٢٠-نيبور-رحلة نيبور في القرن الثامن عشر ص٧٥.

٢١-طارق محمد عبدالرحمن-طولان العربي-مينورسكي ص٦٠-٦١.

٢٢-ياقوت الحموي-المشترك وضعا..ص١٥٧-١٥٨ زبير بلال ص١٢٤ ص٩٥.

٢٣-المقدسي-الروضتين ص٢٧٦ ج٢.

٢٤-المقدسي-الروضتين ص١١٦-١١٨ ج٢.

٢٥-المقدسي الروضتين ص٢٧٧.

٢٦-ابن المستوفي-تاريخ اربيل-هەموو کتابەکە.

٢٧-ياقوت الحموي معجم البلدان ص٤٩٠ طبعة طهران ١٩٦٥.

٢٨-٦٣/.

٢٩-تغري بردي الاتابكي-النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة مادة صلاح الدين الايوبي.

٣٠-المقدسي-الروضتين ص٣٦٦-طبعة ١٢٨٧ز.

٣١-ابن كثير-البداية والنهاية ص٢٥٩ ج١١-١٢ مادة شيركو ١٣٠٠م-١٣٧٢م.

٣٢-ابن المستوفي ج٢ ص٢٠ تاريخ اربل

٣٣-زبير بلال لەکتێبی ابن خلكان (حياته)

٣٤-نفس المصدر السابق يان ابن خلكان (٦) ٢٥٨-٢٦٦ يان شذرات الذهب ٥١٣/٥.

٣٥-المقدسي-الروضتين ص١٥٩ ج١

٣٦-المقدسي-الروضتين ص١١٦-١١٨.

٣٧-ابن خلكان-وفيات الاعيان ص٢٠٥ ج٦.

٣٨-المقدسي-الروضتين ص٦٠ ج٢.

٣٩-خرائط اذربيجان القديم/ اطلس التاريخ الاسلامي-هاري د.هازارد نەخشەی عێراق-بۆ زێدە زانیاری بڕوانە صلاح الدين الايوبي من جديد/ سەرسام.

٤٠-دليل الاثار العراقية ص٢٢ لەگەڵ نەخشەی شوێنەوارەکان لە شوێنەواری هەولێر.

٤١-شەرەفخانی بەتلیسی-شەرەفنامە-وەرگێڕانی هەژار موکریانی.

٤٢-ذيل تاريخ دمشق ص٣١٦.

٤٣-طولان العربي العدد (٦٢)-٣١ تموز ٢٠٠١ ص٥٩-٦٠ القبائل والطوائف الكردية في العصور الوسطى-د. زرار صديق.

٤٤-لسترنك-بلدان الخلافة الشرقية ص٢١٦.

لەگۆڤاری هەولێر- لەژمارە (١٢) وتارێك بەخێرایی لەسەر دۆزینەوەی زێدی باپیرانی سەلاحەدین و کتێبە کوردییەکە نووسرابووەوە بەناونیشانی (بابەشێوەیەکی زانستیانە بڕوانینە

(٢)

**ئەو شوێنەی مێژوو لەسەری ناكۆكبێ شوێنەوار یەك لای دەكاتەوە**

# تێڕوانینی زانستیانە بۆمێژوو، لەچاوی عاشقانیدایە

مێژوو) بەناوی خاوەنی وتاریش ناوی بردبووم وەك ناوم نەزانێ كەوا لەشەستەكانەوە یەكێكم لەنوێخوازانی شاری هەولێر لەهەموو جموجۆلی رۆشنبیری ئەم شارە تائێستاش بەشدارم چ وەك شاعیرو چ وەك نووسەر، وەك سەرۆكی نووسەرانی لقی هەولێر، بەرپرسی كتێبخانە لەشۆڕشی ئەیلول. چەندین كتێبو دیوانی شیعرو لێكۆڵینەوەو دۆزینەوەم بەچاپ گەیاندووە لەزۆربەی رۆژنامەكان بەرهەمم بڵاوكردۆتەوە، دیارە ئەم برادەرە ناویشم بەخاڵێك دەزانێ لە دۆزینەوەكە یا وەك بڵێ (چۆلەكەی دوێنێ نازانێ بجریوێنێ). (ئەمەم نەدەوت) ئەگەر ئەم برادەرە بیزانیبوایە (زانستی پێوەرەكەی لەعەقلدایە لە ئەزموونو دیتنو خوێندنەوەی زۆرو وردبینی نەك شەهادەی چوارساڵی نێو چواردیوار. كە بناغەیە نەك بینا) بەڵام داهێنان لەسەرووی پلەو پێپلیكانێی قوتابخانەیە* تەنیا داهێنەر مامۆستای بێ مامۆستایە. بۆ ئەوەی بزانین ئەم مامۆستایە یاریدەدەری مامۆستای زانكۆیە كەناوی محەمەد عەبدوڵڵا كاكەسوورە زانستیانە دەڕوانێتە مێژوو یان نا؟!

١-تەنیا كتێبەكانی منی هەڵگێڕو وەگێڕكردووە بێ وردبوونەوەو بێ سەیركردنە سەرچاوەكانی لەسەری نووسیوم ئایا ئەم جۆرە نووسینە تێڕوانینێكی زانستیانەیە؟! كە بەبەڵگە باس دەكەین!!

٢-شوێنەواری (دوین)ی نەدیوە، هیچ دەربارەی شوێنەوارو هەڵكەوتەی (دبیل) نازانێ بەبێ دیتنو وردبوونەوە باسیان دەكات ئایا ئەمە تێڕوانینێكی زانستیانەیە؟!!

٣-ئایا گەلەكۆییو گروپ دروستكردن، وەڵامی پێكەوە نووسینو خەڵك هاندان شێوازێكی زانستیانەیە، یان بەڵگەی نازانستیو عەشایرگەرییە؟!

٤-نێوان من‌و ئەو دەگەڕێتەوە ساڵی ١٩٨٨ وتارێکی کە لەگۆڤاری (کاروان)ی ژمارە (١٢٤)ی ساڵی ١٩٨٨ وتارێکی یاهێرشێکی ناڕەوای بردبووە سەرو منیش لەهەمان گۆڤارو هەمان ژمارە وەڵامم دایەوە تکایە خوێنەری ئازیز سەیرێکی گۆڤاری کاروان بکات لەهەموو شتێك دەگات، کەمەبەستی ئێستای تێڕوانینی زانستیانە نییە بۆ مێژوو!! بەڵکو تێڕوانینی بێهێزانەیە بۆ لەعەردیدان‌و تۆڵەساندنەوەو تەعمی.

٥-خاوەنی وتار بەرنامەیەکی تەلفزیۆنی هەیە لە تەلەفزیۆنی هەرێم. دووبارە دوو مانگ بەر لەئێستای هێرشێکی ناڕەوای بردبووە سەرم، کە ئاشکرایە دڵسۆزی نییە بۆ دۆزینەوەکەم بەبەڕێز وەرزیری ڕۆشنبیریم ڕاگەیاند هەروەها بەڕێز بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنەکە بڕیاریدا لەتۆڵەی لەگەڵم دانیشێ ڕووبەڕووی ببەمەوە بەڵام شاهێدم هەیە کە بەهەڵاتن هەڵات کاتێ بۆ تۆمارکردن چووبوومە TV کە دەپرسم ئایا ئەمە دڵسۆزییە بۆ ڕاستی‌و تێڕوانینی زانستیانە بۆ مێژوو- کەمن ئامادەم هەمیشە ئەویش ت- کاتێ وتیشم بۆ وادەکەی وتی بەشی مێژوو وای پێوتووم؟!

## وەڵامەکان بەخێرایی

١-کتێبەکەم بەرپەرچی ناونیشانی وتارێکە کە عبدالرقیب لەگۆڤاری هەزارمێرد بەناوی ((سەلاحەدین تەیوبی خەڵکی ئەرمەنستانە نەك ٠دوین)ی هەولێر)) وەڵامی منیش بە ناونیشانی (سەلاحەدین ئەرمەنی نییە زەرزاری‌و ڕەوەندی هەولێرە کەمەبەستی ئەو وروژاندنی شارچیاتی بووو، بەڵێ وەڵامەکەم بۆ گۆڤاری هەزارمێرد بەحمید ڕێبواری نووسەر ڕەوانەکرد، بەڵام بڵاویان نەکردەوەو سەرەڕای ئەوەی کە لە وەزیری ڕۆشنبیری کاك فەلەکەدین داوای قەدەغەکردنی کتێبەکەمی کردبوو وەڵامی نەدەمەوە، ئایا ئەمە تێڕوانینی زانستیانەیە، هەڵسووکەوتی شارستانیانەیە؟ یانِ دەم کوتکردن‌و پشت لەعەردیدان!

ئێوە بەهانایەوە (دێن) کە لەهەمووتان شارەزاترو دیارترە.

٢-ئەمە سەربەستی نووسینە من وەك نووسەرێکی خاوەن ئەزموون دەزانم بابەتی سەلاحەدین‌و سەرچاوەکانی هەمووی بەعەرەبین ئایا ئەگەر وەك تۆ بنووسمەوە زانستیانەیە؟!

٣-(نووسەری کۆمپیوتەر ناوەکانی لەبیرچووبووەوە بیاننووسێ تەنیا ڕۆژنامەی یەکگرتووو برایەتی نووسیبووی لەژێر ئەو ڕستە پیرۆزباییانەی پسپۆڕو تایبەتمەندا بۆمنیان نووسیبوو ئەم برادەرە سەیری (ل٩٤-٩٤)ی کتێبەکەمی نەکردووە کەلەژێر ناونیشانی (تێبینییەکی گرنگ‌و پێویست) ناوی ئەو بەڕێزەم نووسیووە کە پیرۆزبایی لێکردووم لەیەکگرتوو ئەویش لەبەشی مێژووی ئیسلامیە لەکۆلیژی ئاداب ناوی بەڕێزیان مامۆستا ئیدریس عەبدوڵلا)یە نەك ڕۆژنامەکە لەبرایەتیش مامۆستا عەبدوڵلا بەرزنجی لەئەڵمانیاوە نووسیبووی کاتی خۆی لێپرسراوی کتێبخانەی گشتی هەولێربوو لەگەڵ دکتۆر فیصل عارەب ئایا ئەمانە ڕۆشنبیرن نابێ بیروڕادەربڕن ئەگەر تۆزێك بەزانستیانە بڕوانیبایە مێژوو ئەم تێبینییە

گرنگەت دەدیت بەلام وەك وتم مەبەستت گەیشتن نەبوو بۆ راستی. بەلکو بۆ تۆلەو لەعەردیدان، بەلگەشم باسی مامۆستاو پسپۆڕەکانیشی کردووە کە دەبوایە ناویان بهێنێ ئەگەر مەبەستی زانست بوایە!!

خالەکانی ٤،٥،٦،٧. پەیوەندی بەمنەوە نییە کاك (ئەحمەد سەلام) نووسەرو شاعیر دەتوانی وەلامیان بداتەوە. کەپێشەکییەکەی نووسیبوو بۆم.

٨-ئیبن الاثیر دەلێ (دوین من آخر أعمال اذربیجان مما یلي الروم) مەبەستی ولاتی (رۆم)ە رۆمی بێدەنگی یاتورك الروم کە لە رۆژئاوای ئازربێجان بووە کە لەلێواری شامەوە بگرە تا فەرەنسابوو دەکا ئەوروپای ئێستاو (بحر الروم) بحر الابیض المتوسط. نەیوتووە (مما یلي حدود الروم) تامەبەستی سنووری رۆم بێت کە سنووری دیاریکراوی هەمیشەیی نەبوو ئێستاش لەجیاتی (دوین) هەولێر دەتوانی بلێی (پیرانشهر خانە) من آخر أعمال ایران مما یلي اوروبا یە کە دەکا غەربی ئێران کە ئێستا(خانە) غەربی ئازربێجانی ئێرانە، کاتی خۆی هەتا (دوین)ی هەولێربوو- بەلێ مامۆستا ئەمە تێروانینی زانستیانەیە نەك بلێی الروم مەبەستی ئەرمینیایە!!

٩-مەبەستم کورتکردنەوەیەکە لەزستانا ئەمە هەیە.

١٠-ل١٣ هەولێر هەلەی چاپە بۆ راستی بڕوانە ل(٥١) کتێبەکەم کە باسی تەغری بەردی دەکەم نووسیومە (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة) ئەگەر وردوو تێڕوانین زانستیانەتان هەبوایە ئەم لاپەڕەشتان دەخوێندەوە کەدیارە لەپێشەکی زێتر هیچیدیکەتان نەخوێندۆتەوە ناوەکەی ئیبن تەغری بەردیەك نەك وەك نووسیووتە (ئیبن تغری بەردی).

١١-دەلێ بەلگەی ج.س. پکنگهام رۆژهەلاتناس و گەڕۆك کە لەسالانی ١٨٢٧ز هاتووەتە موصل لەوێ دەلێ:- سەلاحەدین خەلکی کوردستانەو لە ص ٣٤ی کتێبی خطط الموصل هاتووە کەوا (خەلکی کوردستان نزیکە) واتا نزیك موصل و نیپوری رۆژهەلاتناس گەڕۆك ١٧٣٣ز-١٨١٥ز دەلێ (خەلکی دوین وتیان باوکی سەلاحەدین ئەگەرە لەلای ئەوان لەدایکبووە دەلێ (هەردووکیان بەبەلگەناچن چونکە سەرچاوەی باوەڕپێکراو لەبەردەستدایە). دەپرسم بۆنەتنووسی؟

دەپرسم ئەم سەرچاوە باوەڕپێکراوە چین؟! دەتەوێ خوێنەر چەواشەبکەی و سەرنجی لەوە دووربخەیتەوە کەوا وئەم دوو بەلگەیە یەکسەر لەگەل (وتەکەی ئیبن کثیر پرپێکە کە دەلێ (ولد نجم الدین بارض موصل) وە لەگەل وتەی (ولد نجم الدین بجبل وعاش في الموصل) ط٢ ج١ الروضتین هەروەها لەگەل شوێنەواری (دوین)و سنووری کۆنی ئازربێجان- کە گوندەکەیان لەلای هەولێر بووە سەربە (ارض موصل). وەلەدایکبوونی نجم الدین ئەیوب لەسەر سنووری هەردوو لادەگرێتەوە ئازربێجان و موصل. کەشوێنی (دوین)ی هەولێرەو شوێنەواری سنووردکەو (باب دوین) ماوەو، خەلکەکەش هەموویان رەوەندن زراریین، لەگەل (الزرزاریە)ی ئیبن کثیرو وأهلها کلهم من الروندیەی ئیبن خەلەکان و من آخر أعمال أذربیجان ومما یلي الروم و

...(ئاران)و (قەراج)ی هەولێر دەگونجێ- من تەنیا ...کەم (٣) بەڵگەی وامەیدانی لە (دبیل)و ...ی بدۆزنەوە کەنییە؟! (کورە خۆ بەزۆری ...ی مێژووی کورد بشێوێنن) ئەمە تێڕوانینی ...نیە لەلایەن لە بۆ مێژوو یاشێواندن پاش ئەم ...و بەڵگە ئاشکراو روونە.

...نەبەرئەوەی (ئاران و قەراج)ی هەولێر بەئاران و ...جستان تێگەیشتوون.

١٢-شوێنەواری عێراقی کە دەڵێ شوێنەواری قەڵاتی (دوین) قەڵاتی سەلاحەدینە ص٢٢ دلیل الاثار العراقیة. کاک محمد دەڵێ ئەوجا چییە قەڵاتێکە ...قەڵاتێکانی. باشە دەپرسم بۆ تەنیا لە (دوین) زێدە ...هەموو عێراق سەلاحەدین قەڵاتی هەیە، ئەمە ...لەگەڵ دۆزینەوەی (قلعە خفتیدکان ابی علی زەرزاری) ...دەگونجێ کە قەڵاتی (ابی عەلی) کەسەلاحەدینە چونکە ...ی گەورەی ناوی عەلی بوو (بۆزێدە زانیاری بروانە ص٥٧ صلاح الدین الایوبی من جدید). ئایا ئەم ...مەش لەگەڵ سەرجەم بەڵگەکانی خاڵی (١١) لەم نووسینەم ناگونجێ کەباسمکردووە. هەموویان لێك ...مۆنیین ئێوە ئەگەر زانان ئازان وەك من باسی (دبیل) ...بکەن نەك وەك سەرخۆشەکە تەنیا ژێرگلۆپ دەگەڕا ...سەعاتی ونکردبوو بەشەو وتیان بۆ تەنیا ژێر گلۆپەکە دەگەڕێی وتی چونکە روناکە. تۆش ئاسانە ...سەرماندوویوونی من بدوێی. نەك لێکۆڵینەوەی مەیدانی و ماندوویوونی چوارساڵ و شەش ساڵ وەلامدانەوە.

١٣-دەڵێ: قسەی خەڵکی (دوین) ئاخوا چونکە خەڵکی بۆتان وتیان لەنەوەی خالید بن وەلیدین واش نەبوو) مەسەلەکە دیسان گێژەرو لێژەرە؟! باشە بۆ خەڵکی شەقلاوە ناڵێن لەنەوەی سەلاحەدینین؟! یان خەڵکی (دبیل)ی ئەرمەنستان ناڵێن تایبکەنە بەڵگەیەك و لەهەموو جیهانیش کەسێ واینەوتووە چونکە بەراستی سەلاحەدین خەڵکی (دوین)ی هەولێرە بەڵگەیەکە لەنێو بەڵگەکانی دیکەدا ئایا من تەنیا ئەم بەڵگەیەم هەیە تاوام پێ بڵێ- ئەگەر یەك بەڵگە بوایە حەقت بوو، یان پارچەکردن و تێڕوانینی زانستیانەت بەم جۆرەیە کاکی مامۆستا؟!

١٤-تەنیا وشەی (ش) پەڕیوە لەرستەی ئەوانەش کە لەمێژووی ئەم سەردەمە نەشارەزان.

١٥- بەڵێ (زانست هەڵە قەبوول ناکات یان راست یان درۆ) لەسەر قسەی خۆمم تێڕوانین و ئینتخابات و هەڵبژاردن و گەلەکۆیی و سیاسەت نییە بیشێوێنێ.

١٦-هەڵەی چاپە.

١٧-(متفق علیە) زاراوەیەکی مێژوونووسانە دیارە لەمەش نەگەیشتووی کە ماجستێرتان هەیە، مەبەستەکە مانای مێژوونووسان لەسەری کۆکن.

١٨-لە وەڵامەکەی کاك قادر ئەشکەنەیی وەڵامان داوەتەوە.

١٩-بەڵێ شاگەشکەبووم، چونکە من گوندەکەم دۆزیبووەوە بەرامبەر (باب دوین) بەهەمان مانای ناوەکە (باب دوین) بەهەمان ناوەکە (ئیجدانکان) ئەجدانقان. (جن) ئەجندەکان. کە گۆڕی پیر (مەروان)م

زانی لەوێیە- لەنێو کۆی بەڵگەکان کە کێڵە مەلیکانەکەشم دی هی هەمانسەردەمە زانیم باپیرە گەورەی سەلاحەدینە کە دەمزانی ناوی (مەروان)ە، ئەگەر لەهەولێر بوایە هەونەبوو ئەگەر ناوی (حوسێن) بوایە هەونەبوو ئەگەر کێلەکەی گرینگ نەبوایە هەونەبوو- ئەگەر گۆڕستانەکەش بەناوی ئەوەوە نەبوایە هەونەبوو جگە لەوێنەی (رۆژ) لەسەرکێلەکەی کە رەمزی (زەرزاریە). دەکا مەروانی زەرزاری لەنێو گوندی زراریان بەهەمان ناو (مقابل باب دوین).

٢٠-بەڵێ کاری تاکە کەسی خۆمە کەس یارمەتی نەداوم وەك ماجستێرەکەی تۆو مامۆستاکانتو زانکۆی سەلاحەدین. کەدەبوایە رێز لەم کارە تاکە کەسییەم بگیرێ کە کەس یارمەتی زانستیانەی نەداوم.

٢١-بەڵێ (جن) لە (گیان)ەوە نزیك کە مەبەستی گیانێکی بێ لەشە. وشەکەش (ئەجندەیە) بەڕای من عەرەب زاراوەی (گیان)ی بە (جن) نووسیوە چونکە پیتی (گ) گافی فارسییان نییە وەك هەمەنگوای- همنجوای، گرگان-جرجان گورگیس-جورجیس، دیارە نازانی لە سەردەمی میدیاو زەردەشتو شێوەی فارسی لە سەردەمی ساسانیان بە جیهانی دەورە بلاو بۆتەوەوە لەگەڵ وشەو رۆشنبیریانو زمانی عەرەبیش هەبوو کاتێ قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە کەواتە (جن)- گیان-گیاندەر-(فدائی) (جەندرمە) (جند) کە ئەو کەسانەن گیانیان بەخت دەکەن لەپێناو بیرو بڕوا، باسی یاقوت الحموی‌و کورد ئەجندە نییە کردووە بڕوانە ص٣٦ صلاح الدين الايوبى من جديد کە بۆ چونەکەمان بەهێز دەکا: (جن) لە گیان)ەوە هاتووە.

٢٢-مەبەستم لە جیهان جیهانی ئەوکاتەو زاڵبوون بەسەر هێرشەکانی ئەوروپا، کە زلهێزێکی جیهانی بوو.

٢٣-بگەڕێوە بۆ خالی (١١)و (١٢) ئەم نووسینەمو وەڵامەکانم بۆ کاك محەمەد ئەشکەنەیی باسم کردووە سەعید ابو سەعید کوکبری زاوای ابو سعید کوڕی سەلاحەدین.

٢٤-لە لاپەڕە (٩٤) کتێبەکەم بە کوردی راستم کردۆتەوە. کە تێڕوانینی زانستیانەت نەی دیوە؟! وەك وتم تەنیا پێشەکییەکەت خوێندۆتەوە بۆ ئەوەی تەنیا لە گەلەکۆیەکە بەشداری بکەی، یان وەك وتی بەشی مێژوو وای فێرکردووە. لە کۆتاییدا سوپاست دەکەم بەهۆی بەڕێزتان زۆر لایەنی دیکە لە دۆزینەوەکە بۆ خوێنەرو گەلی کورد شتی بکەمەوە کە زۆر لایەنی مێژووی هەولێرو کورد ڕاستەرێ دەکا.

لەسەدەکانیو سەردەمی ناوەڕاستو دواتردا ئەویش هەمووی بەهۆی شوێنەوارەکەو دۆزینەوەو وردبوونەوەیە لە زێدی باپیرانی سەلاحەدین لە (دوین)؟!

* * *

# گۆڕی پیرمەروان و نهێنییەکانی





گۆڕی پیر (مەروان) باپیرە گەورەی سەلاحەدین ـەگوندی قەلاتە (جن) ئەجندەکان (اجدانتان) ـستییەکەی (ئەجندانکان) کانی ئەجندانی یا کافرانی ـیە (مقابل باب دوین) لەنێو زراریان (الزرزاریە) ـتاکەو سیمبولی بەم جۆرەیە گۆڕستانەکە بەناوی ئەوە ـتای هەیە:-

١-وێنەی(٨) هەشت ڕۆژی بێتیشکی لەسەرە، لەسەر ـەر لاکێلێك دوو ڕۆژی لەسەرە کە بەمانای (زەرد) دێت ـن الاصفر)، (الزرزاریە) ڕۆژ زۆری کێلەکانی مانای ـەرەگەورەیی دێت. دەکا هەشت ئەستێرەی سەربازی کە ـوا پلەی گەورەییە لەوەزیفە.

٢-لەسەر شێوەی دوو دەسکە خەنجەر دروستکراوە، ـنای بەهێزیو گەورەیی ناوچەکەیە. ناویشی پیر-دەکا شێخ پیاوی ئاین (مەروان) کەناوی باپیری سەلاحەدینە.

٣-سەر کێلەکان لەشێوەی (تانجە) وێنەی (٢) کەدەکا ـەشادو مەلیکەکانە کەلەم ناوچەیە لەئەیوبییەکان زێتر کەس مەلیك نەبووە لەمێژووی کورد.

٤-لەهەموو کوردستان کێلی وانییەو دووبارە ـابێتەوە.

٥-کۆنیەکەی پێوەدیارە، لەتیشە (بەردێکی ئاسینی) هەڵبژاردەیە.

٦-ئەم کێلە لەئاستی ژیانی ئەم گوندە بچووکە نییە کیلەکانی دیکە بەردی ئاسایین بچووکن.

٧-لەسەردەمی سەلاحەدین کراوە وەك کێلەکانی (دوین) کاتێ گرنگیان داوە بەناوچەکەو بە (دوین)و قەڵای خفتیدکان أبی علی الزرزاری لێدروسکراوە. لە ئەشکەنەیی دەپرسم ئایا ئەمە شێخی ماوەرانە؟ چ بە مێژوو دەڵێی لەسەرت بووە ماڵ.

## تێبینی

١-ئەم گۆڕە لە (دوین) بوایە گۆڕی باپیر سەلاحەدین نەبووە چونکە لەگەڵیان نەهاتبووە (دوین).

٢-ناوێکی دیکەی هەبوایە وەك (پیرحسین) دیسان هەونەبوو چونکە باپیری سەلاحەدین (مەروانە).

٣-لەشوێنێکی دیکە بوایە لەکوردستان نەمان دەتوانی بڵێین گۆڕی باپیری سەلاحەدینە.

**٤-ناوچەو گوندەکە سەلمێندراوە شوێنی زێدی باپیرانی سەلاحەدینە لەوان (مەروان) بەتەنیا بەجێماوە ئەگەر نەسەلمێندرابوایە دیسان نەماندەتوانی بڵێین هەوە.**



(گۆپاڵ) سیمبولی (رەوەندایەتی) راهەندەیی خەنجەرو شمشێر هێزو سەرکردایەتی

ئایا ئەم کێلە لە (دوین) مانای ئەوینە زێدی باپیرانی (سەلاحەدین)ی رەوەندر زەرزاریو مەروانە؟!



زەرزاری سەرکردایەتی خەنجەری کوردو شمشێری موسڵمانان دەکا ئەمەش گۆڕی سەرکردەیەکی کوردە لە (دوین) لەهۆزی سەلاحەدینی زەرزاری

(زەرد+زا+ئاری)

(ابن+الاصفر+الآری)

کەدیارە لەنەوەی زەردەشتی بووینە



ئەم دوو پارەیە لەنێو قەڵاتی (دوین) حەرەسی شوێنەوارەکە حاجی مرادخانی رەوەند دۆزیبوویەوە:

١-پارەیەکی ئەفرەنجی Frunj وێنەی پاپۆڕێکی لەسەرە

٢-پارەیەکی ئەبوسەعید کوکبری ئەمیری (اربل) هەولێر.

وێنەی یەکەم دەسکەوتی جەنگی دودم (سەردەمی سەلاحەدینە)



## خوێندنەوەی کێلێکی (دوین)

١-وێنەی خاچێکی رێك‌و لاونیوو هەڵسراو

٢-رۆژ-مانای زەرد

زەرداری=زەرزاری

سەرکردەی خەنجەرو هێزی کوردە کە دەستەی خاچەکەکراوە خەنجەرو هێزێکی دیکەی کورد. ئاراستەی دەسکی شیری موسڵمانان کراوە، کەدەکا دەوڵەتی کوردان بووە موسڵمانی رێکخستووە بۆ جەنگ ئاراستەکراوە.

٣-خاچێکی نابووت‌و پارچەپارچەکراو نیشاندەدا کە وێنەی سێهەم‌و خوارەوەیە.

٤-گۆڕەکە سەرکردەیەکی زەرزاری بووە.

١-ئەم وێنەیە دەیسەلمێنێ زەرزارییەکان سەرکردەی کوردو موسڵمانان بوون کە سەردەمی سەلاحەدینی زەرزارییە وەك نەکێلێکی دیکە (گۆپاڵ) لەسەرە کە سەلاحەدین رەوەندیش بوو.

٢-ئایا ئەمانە بۆ تەنها لە (دوین) هەیە مانای ئەوەنییە جێگای زێدی باپیرانی سەلاحەدینی رەوەندو زراری‌و مەروانە.

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

هەرێمی کوردستانی عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین هەولێر
نوسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ
بۆ کاروباری زانستی وخوێندنی باڵا

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERIAL COUNCIL
UNIVERSITY OF SALAHADDIN
POST GRADUATE SECTION

ژمارە: ٢٤٢٤
رێکەوت: ٢٠٠٠/٦/١

**بۆ/ کۆلێژی ئاداب/ نوسینگەی راگر**

**ب/ سیمینار**

سەلاو رێز

نوسراوتان ژمارە ٥٠٧/١/١ لە ٢٠/٥/٢٠٠٠ ئاماژە بە پەراوێزی بەرێز سەرۆکی زانکۆ لە ٢٧/٥/٢٠٠٠ داوای بەستنی سمیناری بەرێز / عبدالخالق سەرسام دەکەین ئەگەر نا ئەمە زۆر دەکەوێ لە سەرتان.

لەگەڵ رێزماندا

د. سەرتیپ فتاح کاکەی
یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ زانکۆ بۆ کاروباری زانستی
وخوێندنی باڵا

وێنە یەک بۆ/
- نوسینگەی بەرێز سەروکی زانکۆ/ پەراوێزتان لە ٢٧/٥/٢٠٠٠ / لەگەڵ رێزماندا
- نوسینگەی بەرێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ / بۆ کاروباری زانستی وخوێندنی باڵا / لەگەڵ بەرایەکان
- دەرکردە

**ئازەربێجان (دوین) هەولێر لەسەر هێڵی ٣٦,٥×٤٤، (دبیل) پایتەختی ئەرمێنیاو ناوەڕاستی کەلەدەرەوەی ئازەربێجانە**



**( دوین ) لەخوارووی رۆژهەڵاتی هێڵی ٣٦,٥×٤٤ سەیری ئازەربێجانی غەربی بکەن. کە ئێستا سەر بە ئێران ( مهاباد ) ئایا من ( دوین )م لەم شوێنە داناوە؟**



**هەژار:**

# (گەر رێکبکەوێت حەزدەکەم لەهەولێر نیشتەجێبم) یا سیاحەتنامەی (هەژار) و (هەولێر)

**محەمەد خدر مەولود**

## پەیڤی بەرایی

باسکردن لە (هەولێر) و (هەژار) باسکردنێکە لەدوو کتێبی مێژوویی زیندووی پڕ لەبزاڤو داهێنەرانەی نوێخوازی دوێنێ هەمیشە بەردەوام.

یا بەواتایەکی دیکە هەڵکۆڵینی ئاقارو سەرکەشەکەیو خوێندنەوەی دێر بەدێری نێو کتێبەکەی چاپکراوو یاداشتە چاپنەکراوەکانی هەژارە. چونکە ئەم دوانەیە (هەژارو هەولێر) مرۆڤو خاکی دوێنێو ئەمڕۆی کوردنو، ئایندەشیان پڕاوپڕی داهێنانو بەخششی سەرفرازانەی مرۆڤایەتیو حەتەوەیی کردووە، دەکرێ لە ئێستاوە بەدواوە باشتر بخوێندرێنەوەو تیشکی لێکۆڵینەوەی ئەم عیشقە ئەزەلییەی گەورە داهێنەران بەرامبەر بەم شارەو خاکەکەی نهێنییەکانمان بۆ بجریکێنێت.

وا من ئەو جارە دوای شەونخونیو هەوڵدانێکی زۆرو هەڵکۆڵینی سەدان بگرە هەزاران رستەی نێو کتێبەکانی مام هەژار، ئەم سیاحەتنامەیەی هەژار بۆ هەولێر دەکەمە دیارییەکی بچکۆلانەو بەهیوام لێم وەربگرن.

---

### هەژارو هەولێر

هەژار موکریانی (١٩٢١-١٩٩١)، شاعیرو نووسەرو زمانزانو وەرگێڕو فەرهەنگنووس و ئەدیبی دیاری کورد، یەکێکە لەو نووسەرە بەرزانەی نەک هەر لەنێو کورددا بەڵکو لەنێو فارسو عەرەبو تورکو روسو ئینگلیزو فەرەنسییانیش ناوبانگو ئازناوی بەرز راگیراوە، بەبەرهەمە داهێنەرە ئەفرێنەکانی بەشاکارە چاپکراوو چاپنەکراوەکانی (شەرەفنامە، قانون در گب، هەنبانەبۆرینە، مەمو زینو دیوانی مەلای جزیری، تاریخی ئەردەلان، قورئانی پیرۆز، تارخی سلێمانی، أیار البلاد وأخبار العباد، چێشتی مجێورو بۆکوردستانو، .....تاد) خزمەتی بیرو هزری مرۆڤایەتیو کوردایەتی کردووین، هەروا بەژیانی چەرمەسەریو مەمرەو مەژییەوە،

بەکۆڵنەدانو تێکۆشانو خەباتکردنو باوەڕبوونی پتەوی بەرێبازو هزرو فەلسەفەی شۆڕشگێڕی نەتەوەیی بارزانی نەمر فێرە دەرسو پەندو عیبرەتی مێژوویی کردووینو عیشقی کوردایەتیو ڕێبازو هزری بارزانی نەمری لەلا خۆشەویستکردووین.

ئەوو هەولێر لە چەندین لاوەو بەهۆی چەندین بۆنەوە یەکتر لە ئامێزدەدەکەن، ئەوی گەڕیدەی شاران لەمەهابادەوە بۆ زۆربەی هەرە زۆری شارەکانی ئێران بەتارانەوەش بۆ گەلاڵەو ناوپردانو سلێمانیو کەرکوکو بەغداوە، لەوێشەوە بۆسوریاو لوبنانو شارو وڵاتەکانی دیکەی سۆڤیەتی جارانو پاشان بۆ شارانو وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بەلەندەنو پاریسیشەوە.. دەبینین لەدوادواییەکانی ژیانیدا، بەر لەکۆچی دوایی ئاواتو هیوا بەنیشتجێبوونو دانیشتن لەشاری هەولێر دەخوازێ، بەو هیوایە قسان دەکات، لەهەولێر لەنێو خانوویێکدا نیشتەجێبێو ئارخەیانو ئارام بێت.

پەیوەندی نێوان هەژارو هەولێر، پەیوەندی مرۆڤە بەخاکەکەیەوە، عیشقو خۆشەویستییەکی ئەزەلیبوونی مرۆڤە بۆ هەڵبژاردنی ئەو شوێنو جێگایەی کە ئاسوودەییو ئارامی پێدەبەخشێت... هەژاریش لەگەڵ هەولێردا هەروابووە.. ئەدیبو نووسەرو هونەرمەندانی شارەکەی خۆشویستووەو گۆڤارو بڵاوکراوەکانی هەولێری بە هی خۆی زانیوە، لەبۆنە جیاجیاکاندا (ئەدەبی سیاسی، کۆمەڵایەتی...) بەشداری کاریگەری کردووە... هەمیشە هەولێری لەسەرزاراندابووە. هەربۆیەش لەبەرهەمەکاندا باس لەو لایەنانەی ئەم شارەدا دەکات.

هەولێر لەنێو پەیڤە شۆڕشگێڕییەکاندا (برایم ئەفەندی) وەك نموونەیەك

هەژار موکریانی لەنێو بیرەوەرییەکانی نێو چێشتی مجێوریدا، لەگەڕانەوەی لەبەغداوە بۆ ناو شۆڕش بەنهێنی بەم جۆرە دەدوێت: (چوومە مەیدان کە ماشێن بگرم بۆهەولێر...تاد). بەرەو هەولێر هاتین...تاد. سێبەر شۆڕ ببوون، تەقە قەوما، غارماندا سەربان. لەدەشتی خوار هەولێرەوە شەڕێك بوو کەس شتی وای نەدیوە، تەیارە بەبۆمباو تیربار،



تۆپو تانكو عەسکەر، تەقەو گرمەو قرمەیە، دووکەڵ دەستی داگرتووە، تەیارەیەك پێکراو لەنزیك ماڵان کەوتو گڕی بەرزبۆوە، هەموو خەڵکی هەولێر، بەژنو پیاو لەسەربانانەوە سەیریان دەکردو دەنگی (ئافەرین پێشمەرگە) لەهەموو لایەکەوە بڵندبوو، منداڵە هەولێری هەر مەپرسە چ قیژەو هەرایەکیان بوو، هەر حەزت دەکرد گوێت لێبێ، هەتا سێرە هەڵگیرا شەڕ هەربەردەوامبوو... تاد. کورە سەیر لەوەدابوو سۆفیەکانیش، کە دوژمنی پێشمەرگەو هەواڵی

دەرچەت بوون لەسەربانەوە ئافەریم‌و چەپڵە لێدانیانبوو خۆ ئازایەتی پێشمەرگەکان. هەژار موکریانی مێژووو چیرۆکی ئەم شەڕە پڕ لە قارەمانیەتییەی دەشتی هەولێر بەم جۆرە باسدەکات: (برایم ئەفەنی کە سەردەستەی پێشمەرگەکانی ناوشاری هەولێربوو، لەکیو بەکن ژن‌و منداڵی ئاوارەی پێشمەرگەدا تێدەپەڕێ، ژنان زۆری جنێو پێدەدەن کە پێخۆرێکی ورمان نییەو هەر خۆت قەڵەودەکەی. برایم ئەفەندی دەزانێ شەوی عاشورا لەبەرخاتری سەربازان کە زۆربەیان شیعەن، گۆشت زۆر سەردەبردرێت بۆ رۆژی عاشورا. شەو دەوری قەسابخانەی پادگان دەدا، کەلاکی شێست مەڕ، بیست مانگاو گا، دوازدە گامێش لە کەمیۆنی قەسابخانە باردەکاو دەچێ دەڵێ ئەوە پێخۆرو دابەشیدەکات. پۆلیس حەپسن... تاد کەلاکمان شەق‌و پەقن. لەشکر لە برایم ئەفەندی دەنگ دەدەن. دەچنەسەر (بنەسلاوە) کەبنکەی پێشمەرگەیەتی‌و ئەو شەرەی ئێوارە قەوماوە کەپتر لە شێست سەربازی دەوڵەت کوژراوە، دوو تانك شکاوەوتەیارەیەك بەتیر باری گرینۆف پێکراوەوسووتاوەو لەشکری دەوڵەت بەسەرشۆڕی گەڕاوەتەوە.

هەروا هەژار دەربارەی قارەمانییەتی برایم ئەفەندی دەنووسێ‌ودەڵێت((ئەگەر بۆگەلانی بێکەسی وەکو کوردیش وەك گەلانی خواپێداو تاریخ بنووسرابا، ناوی برایم ئەفەندی لەریزی ئازاو کارزانان سەد داخ کەئەو جۆرە پیاوانە ناویان لەبیر دەچێتەوەو کەس ئاوریان وەسەرنادا... بەڵام ئەوەندەی من لێی دەزانم زیانی نییە تۆش بیزانی‌و جاروبار وەبیرت بێتەوە.

برایم ئەفەندی بەدەرەجەی ستوان دوو لەرشتەی پۆلیسیدابووهاتبووە ریزی شۆڕش. هەولێریی بوو. پیاوێکی بەقەڵافەتی چاووبرۆ رەشی جوان چاك. لەوەتا هاتبووە کۆڕی خەباتەوە. ناوی برایم ئەفەندی زراوی ئەفسەرو چەکداری دەوڵەتی عێراقی بردبوو. دوژمنانی کوردی نیوەشەو لەماڵەوە خۆیان دەردێناو دەیرفاندن‌و کەس هەستی پێنەدەکرد. جارێك دەپاش نوێژی شێواندا، پۆلیس هەموو رێگەی (هەولێر- شەقلاوە)، (هەولێر- کۆیەی) بەستووەو هەموو ماشێنان دەپشکنێ، زۆر کەسان دەگرێ. تا بەیانی نەزانراوە کە ئەو پۆلیسانە پێشمەرگەی برایم ئەفەندی بوون‌و جل و زمانیان گۆڕیوە!

هەژار جگە لەم چیرۆکە شۆڕشگێڕییانەی برایم ئەفەندی چەندین هەڵوێست‌و بەسەرهاتی دیکەی ئەم قارەمانە هەولێرییەمان بەتام‌و چێژی داهێەرانەی خۆیەوە بۆ دەگێڕێتەوە.. لەلایەکی دیکەی گێڕانەوەو وەسفی قارەمانەیدا بەم شێوەیە وەسفی دەکات (ماوەی پتر لەچوار ساڵ نیوەی بێ‌سیمی رەمزی دەوڵەت،داد لەدەستی برایم ئەفەندی بوو. تاوای لێهاتبوو شەوانە تووشی ئەفسەری خۆشیان بوونایە، دەیانگوت برایم هات‌و هەڵدەهاتن).

هەر لەتاریفکردنی ئەم قارەمانەدا هەژار دەڵێ: (جارێك تاریفمکرد کە پیاوێکی ئازاو بەجەرگ‌و فێڵزانی. گوتی: هەموو ماڵێك دەرکەی کراوەتەوە. هەر گۆشتەکەی عاشورا، قەسابی هەولێر خەبەرسان بۆ ناردم و دەگەڵیان بارکردم،ئێواران بەسواری دووچەرخە بۆ ئارەق خواردنەوە خەڵکی هەولێر دەشتو خەبەری ناوشارم دەدەنێ..). دواجار هەژار لەباسکردنی ئەم قارەمانە بەم جۆرە کۆتایی پێدێنێ: (بەسەتان حیکایەتی سەرسوڕێنەر لە ئازایەتی برایم ئەفەندی لەهەولێرو مەڵبەندەکانی تری عێراقا لەبەرکراوەو من ئەمانەم بەنموونە باسکرد.).

لەم چەند دێرو پەیڤەی نێو یاداشتو بیرەوەری شۆڕشگێڕانەی هەژاری نووسەری پایەداردا هەر بەوەندە رادەگەین بڵێین میللەتانی زیندووی ئازاد هەزوو بەزوویی بایەخ بەکارە شۆڕشگێڕیی و نەتەوەییەکانی خۆیان دەدەنو قارەمانو کەڵە مرۆڤانیان بەچەندین شێوەی هونەریو شارستانی سەردەمانە بەزیندوویی دەهێڵنەوە، بەداخەوە لای ئێمەی ژێردەستەی رژێمو جەوروستەمی داگیرکەراندا کەمتر کەوتووینەتە خۆو زۆر کەمتریش بەوە راگەیشتووین لەنێو دووتوێی لاپەڕەی کتێبەکاندا ناویانو کاروکردەوەیان بەزیندوویی و بەرزی راگرین.

هەژار موکریانیش قارەمانێکی وەك برایم ئەفەندی هەولێری کە بەو شێوە بەرزییەو بەو جۆرە ئازاو بوێرییەی باس دەکات، هەڵبەتە بۆتە مایەی سەرنجو سەرسوڕمان لە ئازایەتی برایم ئەفەندی لەهەولێرو مەڵبەندکانی دیکەی عێراقدا لەبەرکراودو من ئەمانەم بەنموونە باسکرد، مەبەستی نووسەریش لەم جۆرە باسکردنەیدا ئەوەیە بانووسەرانو هەڤاڵانی برایم ئەفەندی بکەونەخۆ، چیرۆكو حیکایەتی ئازایەتیو شۆڕشگێڕیو لێزانیو کارامەیی ئەو لەنێو شۆڕشدا بنووسنەوەو ژیانو خەباتی بەرز رابگرن. گەرنا ئەویش قارەمانێکی شوون بزردەبێ.

سیفەتەکانی برایم ئەفەندی هەولێری

هەژار لەنێو چێشتی مجێوردا،لە گێرانەوەو باسکردنی برایمەفەندی چەندین سیفەتی پێبەخشیوەوبەم جۆرە بە کەسایەتی یەکەمیمان پێدەناسێنێ. برایمەفەندی پیاوێکیپۆلیسی دەرەجەداری هەولێریدەچێتە ناو شۆڕشیکوردستان و لەنێو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا رۆڵی قارەمانانەو شۆڕشگێڕانە دەگێڕێت و دەبێتە ئەو قارەمانەی کە دوژمن سەرسامی نەخشەوپلان و ئازایەتیو کارامەیی ئەو دەبێت.لەلایەکی دیکەوەش ترس دەخاتە ریزەکانی سوپای دەوڵەت هەروەك هەژار ئاوا وەسفی کردووە:((تاوای لێهاتبوو شەوانە تووشی ئەفسەری خۆشیان بوونایە،دەیانوت برایم هات و هەڵدەهاتن)).

کەواتە ئازایەتیوجەسووری یەکێك بووە لە سیفەتەکانی برایمەفەندی،لەگەڵ کارزانیو کارامەیی. هەر هەژار دەڵێت((جارێك تاریفم کرد کە پیاوێکیئازاو بەجەرگ و فیڵزانی))،سەربارەی وەسف و تاریف و پیاهەڵدانی ئەو کەسێتییە هەڵکەوتووە ئەویش بە خاکەڕاییو راستگۆییەوە سیفەتی قارەمانانەو شۆڕشگێڕانەو دواتر گیانی کوردپەروەرانەی خەڵکی هەولێر باس دەکات و،لە چۆنیەتی هاریکاریکردنی خەڵکی شار بۆ پێشمەرگەو شۆڕشی مەزنی ئەیلول دەدوێت.هەر لەسەر



..ی برایمەفەندی،هەژار موکریانی وا دەڵێت:

یەکەم:کوردی هەولێرن ئەوکارە دەکەن.

دووەم:شەوانە هـەمـوو مـاڵێك ـماڵـە هـەولێری ـ ..ەرگەی کراوەتەوە. بەواتای دەرگا لەسەر پشـت بـوون ..ەر جۆرە کارو هاریکارییەك بێت کـە پێشـمەرگە ..ەمانەکان پێویستییان پێ‌هەبێت. پێویستییەکانیش .. پێویسـتی نـان و حەوانەوەیـە یاهـەواڵ و گـەیاندنی ..انەکانی ناوشارە لەچۆنیەتی هەڵسوکەوتی دەوڵەت .. بەگژداچوونەوەی پێشمەرگە، یان گـەیاندنی هـەواڵو ..لاکییەکان و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی شارە لە بزاڤ .. جوولـەو بەرنامــەی شـــۆڕش و ســـەرکردایەتی ..ـــۆڕش،بەرامبـــەر دەوڵـــــەت و دامودەزگـــا ..پلۆسێنەرەکانی.

سێیەم: ئێوان بەسواری دووچەرخە (پایسکیل)و بۆ ..ردقخواردنەوە خەڵکی هەولێر دێنە دەشتو خەبـەری ..ۆشارم دەدەنێ.

ئەو حەقیقەتەش ئەوپەڕی پەیوەندی پتەوی نێـوان ..ەڵکی شارو تەنانەت (ئارەق خۆرەکانیش)، کەئەوسا قەسـابو فیتەرو کوورەچیو سەبزە فرۆشو هەندێ لــە ..ەنچییەکان و.. بوون لەگەڵ پێشمەرگە قارەمانــەکان ..پێشیاندەدات.

هـەر ئـەو وەسـفە شـاعیرییانەی هـــەژارو ئــەو ..یگارکێشانە وردو بەجوولەیــە کـە بۆسـاتی شـەڕەکە ..نووسـیویەتی مایـەی تێڕامـانو جـارێکی دیکـــەش خوێندنەوەیەتی: (لەدەشتی خـوار هـەولێرەوە شـەڕێك ..بوو کەس شتی وای نەدیوە: تەیارە بەبۆمباو تیربـار، تۆپو تانكو عەسکەر، تەقەو گرمەو قرمەیە دووکەڵ ..دەشتی داگرتووە، تەیارەیەك پێکراو لـە نزیـك مـاڵان ..کەوتو گڕی لـێ بەرزبۆوە؟ هەموو خـەڵکی هـەولێر، بەژنو پیاو لەســەربانانەوە سـەیریان دەکـردو دەنگـی (ئافەریم پێشمەرگە) لە هەموو لایەکــەوە بڵنـد بـوو، منداڵە هەولێری هەر مەپرسە چقیرەو هەرایەکیان بوو، هەر حەزت دەکرد گوێت لـێ بێ).

لەم چەند دیمەنەدا هەژار شاعیرانە، سـیناریۆیەکی وێنەگیراوی هەست بزوێنی شەڕەکە دەخاتــە بـەرچاوو دیدی خوێنەران.. لەخۆشەویســتی خـۆی بـۆ خـەڵكو شارو دەشتی هەولێردا واقیعو حەقیقـەتی رووداوەکـە بـێ رتووشـکردن دەگێڕێتـــەوە. ئــەو گێڕانەوەیـــەی شەڕەکەو باسکردن لە کەسێتی برایم ئەفەندی، دەکرێ چەندین بابەتی چیرۆکی قارەمانیەتیو سیناریۆو کـارو بەرهـەمی سـینەماییو تەلـەفزیۆنی لـــێ دروســـت بکرێت.

مایــەوە ئــەوەندە بڵێـین بـە گوێـرەی بیرەوەرییـــە نووسـراوەکەی هــــەژار، محەمــــەد مـــەولود مـــەمی چیرۆکنووس لــە نزیکــەوە لەگــەڵ هــەژاردا بــووە، لــە هەندێ لەو رووداوانەی دەشتی هەولێر.

پەیوەندی هەژار لەگەڵ نووســـەرو هونەرمـــەندانی هەولێر

لایەنێکی دیکەی ژیانی هــەژار موکریـانی ئــەو پەیوەندییــە تونـدو بەهێزەیـە کـە لەگـەڵ نووســـەرو هونەرمەندانی هەولێردا هەیبووە.. هەندێ لایەنی ئەو پەیوەندییەش زۆر بە زەقی لە کتێبی (چێشتی مجێـۆر) کـە بـــیرەوەریو یاداشـــتەکانی ژیانیـــەتی رەنگــی داوەتەوە.. هەروا لە خوێندنەوەی ســەرچاوەی دیکـەو دیانەش لەگەڵ نووسەرانی هەولێردا. ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێت . خوێندنەوەی ئەم پەیوەندییە پتەوەش بەمجۆرە لێکدەدەینەوەو شرۆڤەی دەکەین.

یەكەم: پەیوەندی نێوان هەژارو نووسەرو هونەرمەندانی هەولێر

هەڵبەتە ئەدیبو نووسەرو هونەرمەندان هەمیشە پەیوەندی لەنێوانیاندا پتەودو لەبەر ئەركو پەیامی داهێنان بە ئاسایی تێكەڵ بە یەكتری دەبنو لەگەڵ یەكدی بۆ رووداوو بۆنە هەمە جۆرەكان لە یەك نزیك دەبنەوەو ئاشنایەتی قووڵیان لە نێواندا دروست دەبێت، ئەوەیان كارێكی ئاسایی نێوان نووسەرو هونەرمەندانە، مەگەر ئەو ساردو سورییەی كە جار نا جارێكو لەبەر هۆیە جیاجیاكان دەكەوێتە بەینەوەو حاڵەتی دژ بە یەكو ناكۆك بە یەكتریشی لێ كەوتۆتەوە.. قسە لەسەر پەیوەندی نێوان هەژارو نووسەرانی هەولێرە، لە ساڵانی (٦٠و ٧٠)دا ئەو پەیوەندییە چەكەرە دەكات.. جار لە شاخو لەنێو گەرمە گەرمی شۆڕشی مەزنی ئەیلولدا بووبێت یا با لە شاری بەغداو هەولێرو دواتریش هەر لە شاخو لە سەردەمی شۆڕشی گوڵانو لە ئاوارەیی دا لە ئێراندا، لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا راستەوخۆ لە راگەیاندنی شۆڕشو لەنێو ئێزگەی دەنگی كوردستانی عێراقدا پەیوەندی پتەو لەگەڵ نووسەران (عەبدولخالق مەعروف، فەرەنسۆ هەریری، سەعید یحیا، محەمەدی مەلا قادر، بارزانی مەلا خالد، ئەحمەد دەشتی، مەلا گچكە....تد) لە شاردا جگە لەم بەرێزانە، نووسەرانی دیكەی بەرێزی وەك (محەمەد مەولود مەم، كەریم شارەزا، پیربال مەحمود، تاهیر تۆفیقی هونەرمەند، عەبدوڵلا پەشێو، عەونی شاعیر، مەحمود زامدار، عەبدولغەنی علییەحیا، د. مارف خەزنەدار، مومتاز حەیدەری، مەجید ئاسنگەر، قازی ردشادەفەندی، د.عەبدوڵلا حەداد، عەبدولكەریم هیرانی، سامی عەودال..تد هەروا لە ساڵانی چلەكاندا لە شاری مەهابادا (دەروێش عەبدوڵلا سەرمابردووی هەولێر) دەناسێتو ئاشناو سەرسامی دەفژەنینو مقاماتەكانی دەبێت. بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی تا مێژووی نووسینی ئەم وتارە لەبەر دەستم دایە، دەكرێ هەندێ لەو پەیوەندیو ئاشنابوونەو پرسی نێوان هەژارو نووسەرو هونەرمەندانی هەولێر بخەمەڕوو. هەژار دەربارەی پەیوەندی لەگەڵ محەمەد مەولود مەمو تاهیر تۆفیقو عەبدولخالیق مەعروف لە (چێشتی مجێور)دا نووسیویەتی:

لە عێراقدا بە هەزاران ئاشنام بەجێهێشتوون، بەڵام كاك محەمەد مەولودو تاهیر تۆفیقو كاك عەبدولخالقم هەمیشە لە بیرەو ئارەزوو دەكەم بیانبینمەوە. هەرگا دەهاتمەوە هەولێر میوانی مەم دەبوومو گۆرجێ تاهیر تەوفیقم پەیدا دەكردو دەگەڵیا رامانەدبوارد. (تاهیر) بەناو گۆرانی بێژە، بەڵام نابێ وەك هیچ گۆرانی بێژێك حیساب بكرێ. زۆر پیاوێكی مەردو رەندو شەرم بەخۆیەو ئەوی لەبەر چاوی جارێكی دیوە خۆشی دەوێو قەت لە دڵی دەرناچێ. وەختێ كە(( عەبدولوەهاب نوتروشی))ئەستانداری هەولێر بوو لەناوپردان دیتمی گوتی: (كاك هەژار، ئەستاندار لە مەڵبەندی ئەستاندا پادشایە، تۆ من بە پیاو نازانی دێیە هەولێر نایەی سەرم بدەی، بەڵام لەگەڵ (...) وەك تاهیر تۆفیق دەگەڕێی).

گوتم: (كاكە پادشایەتیت لە خۆت موبارەك، من هەواڵەتی تاهیر بە تەختی پادشایەتی نادەم، چونكە خۆی لەمن بە زلتر نازانێ.. دەشزانێ قسەی خۆش بكاو دەنگیشی خۆشە). هەر بەم بۆنەیەوە، هەژاری شاعیر لەدێرە شیعرێكی نێو چامەی شیعری (منو

بۆبۆن) ناوی تایەر تۆفیقی دەنگخۆش بەم جۆرە دێنێت:

**دەنگخۆش دەیگێڕن بەندان**
**حەمە جەیران، عەلی خەندان**
**تایەر تەوفیق، گەردیو رەمۆ**
**کاوەیسو رەشۆڵو کوڕۆ**

دەربارەی تیرۆرکردنی عەبدولخالق مەعروفیش هەژار هەر لە چێشتی مجێوردا نووسیویەتی (زۆر بە داخەوە لە ساڵی ١٩٨٤دا کاك عەبدولخالق لەسەر کتێبێکی کە دەربارەی ژن لە ئیسلامدا نووسیبووی و هەموو مەدرەکی لە قورعانو حەدیسو کتێبی (ألام)ی شافعی نیشاندابوو، مەلایانی هەولێر فەتوای کوشتنیان داو لەسەر جادە تیرۆرکرا).

دەربارەی شیعرەکانی عەبدوڵلا پەشێویش هەژار ئەم سەرنجو سەرسامییەی لەمەڕ شیعرەکانی دەربڕیوەو لە پرسیارێکی دەنگی کوردستانی عێراق، ئۆرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانو لەو دیمانەیەدا کە ئۆرگەکە لەگەڵ هەژاردا دەربارەی باری ئەدەبی کوردی بە گشتیو شیعری کوردی بەتایبەتی کردوویەتی، لە رۆژی ١٤/٧/١٩٨٧دا لە شەقڵاوەی مەرگەوەرو نمراژان دەقی پرسیارەکەی (د.ك.ع) ئاوایە:

پرسیار: شاعری ئەمڕۆی کوردی لەنێو بواری ئەدبدا بۆ گەلەکەمان چۆن دەبینی؟

لەوەڵامی هەژاردا: دوابەدوای باسکردنی رۆڵی ئەدەبو ئەدەبیان لەو شیکارکردنەوەی گەلو کاریگەری ئەدەبو شیعر بەسەر نەتەوەو بوارە جیاجیاکانی ئەفراندندا. هەژار دێتەسەر باسی شیعری ئەمڕۆی کوردیو دەربارەی عەبدوڵلا پەشێو دەڵێت: من ئەمڕۆ ئەوەی پێی ئاشنام شاعیری زۆر چاکمان لێپەیدابوون، لەتازەکانو جحێڵەکان، بەتایبەتی بۆنموونە من بۆ (عەبدوڵلا پەشێو) یەکجار زۆر موعجیبم پێی، پێم شتێکی زۆر عەجایبە دەڵێ. هەروا لەوەڵامی پرسیارێکی دیکەشدا هەژار ئاوا باسی پەشێو دەکاتو دەڵێ: (عەرزم کردن ئەلعان یەکێکی وەکو عەبدوڵلا پەشێو لەقمەدایە، بەراستی شیعری چاك دەڵێ.) سەبارەت بەو ئەدیبو نووسەرە بەڕێزانەی کە خۆیان باسی پەیوەندیو ئاشنایەتی خۆیان لەگەڵ هەژاردا بۆکردووین. بەڕێزان مامۆستا محەمەدی مەلاقادر بەرپرسی ئێستای لقی (١)ی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەسێ یادەوەری هەژار موکریانیدا کەساڵانە لەرۆژانی ٢١و٢٢ی مانگی شوباتدا لەهەولێرو شەقڵاوەو سەلاحەدیندا لەبیرەوەرییەکانی پەیوەندی ئەدەبیو ژیانی سیاسیو پێشمەرگایەتیو ئاوارەییو ئاگالێبوونی لەدانانی فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەو بەشداریکردن لەساڵیادی کۆچی بەرواڵەتی بارزانی نەمرو کاك ئیدریسی هەمیشە زیندوو بەشیعرو وتار بۆنەوەی ئێستا گێڕاوەتەوەو خەرمانی ئەدەبیاتی هەژاری دەوڵەمەندتر کردووە. هەمدیس فەرەنسۆ هەریری شەهید لەدۆستو هەڤاڵە نزیکەکانی هەژارە، ساڵانە بەبیرەوەریو وتارو دەقە شیعرییەکانو دەقی دانسقەی وەرگێڕدراوی قورئانی پیرۆز بۆسەرزمانی کوردیو بەراستکردنەوەی هەندێ هەڵە لەشیعرەچاپکراوەکانی هەژاردا بەشداری کاریگەرانەی نواندووەو زۆر لایەنی هەژاری نیشانداوین. بەڕێزان بارزانی مەلاخالیدو ئەحمەد دەشتیو سەعید یەحیاو مەحمود زامدار بەوتارو نووسینەکانیان لەبۆنەکانی یادکردنەوەی هەژارو

نووسین لەگۆڤارو رۆژنامەکاندا بابەتی تازەی ژیانی ئەدەبیو خەباتو تێکۆشانی هەژاریان زیندوو راگرتووە. لێرەدا روو لەبڕێزان مامۆستا محەمەدی مەلاقادرو کاك بارزانی مەلاخالیدو ئەحمەد دەشتی دەکرێت ئەو بیرەوەریو یاداشتانەی دەربارەی هەردوو قۆناغی شۆڕشی ئەیلولو گوڵانو لەگەڵ ژیانی ئاوارییدا بکەنە کتێبو بڵاوی بکەنەوە. لەکاتێکدا مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی وەك نووسەرێکی کارامە بەیەکێك لە هەژارناسەکان دادەنرێت وەك ئاگادارم بەچەندین لێکۆڵینەوەو وتار دەربارەی ئەدەبیاتی هەژار موکریانی سەرچاوەیەکی هەرە دەوڵەمەندی دونیای ئەدەبیاتی هەژارەو قسەو باس لێرەدا لەسەر ئەدیبانو نووسەرانی خودی شاری هەولێرە. دەنا باشترو بەرچاو روونتر لەسەر نووسینو لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی دەوەستامو دواتر باسی چەند نووسەرێکی بەڕێزی دیکەی بواری لێکۆڵینەوە لەشیعرو ئەدەبیاتی هەژارم دەکرد، لەوانە بەڕێزان شوکر مستەفا، مەسعود محەمەد، د. شەفیق قەزاز، د. کەمال مەزهەر، رەشید فندیو چەندان ئەدیبو نووسەری دیکەی بەڕێز کەحاڵی حازر بیرو ئەندێشەم یارمەتیدەر نییە بۆ ناوهێنانی بەڕێزیان.

دووەم: هەژار لەبۆنە ئەدەبییەکانی هەولێرو پەیوەندی لەگەڵ گۆڤاری جارانی هەولێردا لە گۆڤاری هەولێری سالآنی (١٩٧٠-١٩٧٢)ی شاردوانی هەولێرو هەژار موکریانی دەدوێین- هەژاری شاعیر ئەم گۆڤارەی بەیەکێك لەگۆڤارە هەرە خۆشەویستەکانی خۆی دادەنا، ئەوەشیان لەبەر دوو هۆبوو، یەکەمیان دەستکەوتێکی رۆشنبیری شۆڕشی ئەیلولی مەزنو رێککەوتنی مێژوویی ئاداری ١٩٧٠بوو، بۆ رۆشنبیرانو خەڵکی تێکۆشەرو فەرمانبەرانی بەڕێزی شاری هەولێر هاتبووە دی. دووەمیان محەمەد مەولود مەمی سەرنووسەری گۆڤارەکە یەکێك بوو لەئاشنا نزیکەکانی هەژار لەشاری هەولێردا، بۆیە هەژار هەمیشە بەشیعرو نووسینو وتاری زمانەوانیو مێژوویی بەشداری لەدەرکردنی گۆڤارەکەدا دەکردو بوو بەنووسەرێکی دیاری گۆڤارەکە. لەماوەی تەمەنی سێ ساڵەی دەرچوونی گۆڤارەکەدا چەندین شیعری دانسقەی خۆی تێدا بڵاوکردۆتەوە. لەشیعرە هەرەدیارەکانیدا (حەللەق مەللەق) لەژمارە (١)ی ساڵی (٢)ەمینی گۆڤارەکەدا، دیارترین شیعرە چونکە چەندین گۆبەندی نایەوەو بوو بەمایەی گرفتو سەرئێشە، (حەللەق مەللەق) چەندین چیرۆکی سەیرو سەمەرەی هەیە، بۆیە خراپ نییە گەر بەکورتی لەناوەرۆکی شیعرەکەو گۆبەندەکانی دوای بڵاوبوونەوەی لەسەرزاری هەژاردا خۆیەوە لەشیعرەکە بدوێین: (ساڵی حەفتا بەبەڵێنی خودموختاری کورددواری لەعێراقدا دەگەڵ بەعس ئاشتبووینەوە، بەکوردی لەشەڕ چووینەوە. مامۆستاکان چوونە بەغداو بوونە وەزیرو ئەستاندارو دەست ئەندەرکار. بەشی زۆریان لەڕێگەی چەوریی پێخۆریان، لەبەرمەبەستی پارەو کورسی، تێر ئاگای لەبرسی نەما، دەسکرا بەخانوو کڕینو ترومبێلی جوان لێخوڕین، پێشمەرگە رەمەکییەکانیش کە ئەوان شەڕیان بردەوە، رژانە ناو شارانەوەو چوونە ناوڕیزی بێکارانو لەبیر زلان برانەوە. بەم شیعرانە تۆزێ گلەم لەو خۆبوێرانەی خۆمان کردو کە ناوم لێنا (حەللەق، مەللەق) چیرۆکنووسی بەناوبانگ (مەم) سەرپەرشتی کۆواری (هەولێر)ی ئەوودەم بۆمی چاپکرد. منیش بۆ

بەڵاگێڕی ئەم دوو بەیتی ناخێرییەکەم کە تێرو خەستو قۆڵتربوون دەراوێشتو خاڵمان لەجێی بەتاڵ دانا).

وەك دەرکەوت دەقی شیعرەکە رەخنەو گلەییە لەو نەخۆبوێرانەی خۆمان، کەبەپلەو پایەی ئەوسای مێری نەسۆنگەی بەڵێنی خودموختاری خۆیان لەبیرکردو خزانە نێوخۆ دەولەمەندکردنو پێشمەرگە فەقیرو بێکارەکانی خۆشمان بەزگێ تێرو دوانی برسی کاریان ردپ راوەستابوو، هەندەی ئێرەو ئەوێ پێبکەن ناچار بێکارو پرس دەستەو ئەژنۆ مابوونەوە.

هەژاری شاعیر لەدرێژەی گێڕانەوەی رووداوی شیعرەکەو گۆیەندەکانی بەردەوامەو دەڵێ: (هەر شیعر لەچاپ هاتەدەر، هەرچی هەرچیو پەرچیو نەمن کرد، وتیان هەژار دژی کوردەو فاین دەبێ سزا بدرێ کە بارزانی هەڵپەرستو بەناوی کوردایەتییەوە بۆ کوردفرۆشتن چەرچی بوون، وەك زەردەواڵەی هارووژاو هورووژمیان کرد.شیعری ئابڕووبەریان دڕی. مەم یان لەسەرکار وەلابرد. هەزار شکایەتیان پتر لەلای بارزانی ئەمەی پێزانی خواستمیو شیعرەکانم بۆخوێندەوە. لەجیاتی سزا سەد ئافەرینی لێکردمو فەرمووی دەستم دەگەڵ دەستی تۆیە. ئیتر لەددەست ئەو گورگانەی وا کەوڵەمەرپیان پۆشی یوو پاراستمی، مەمیش لەئازار رزگاربوو). سەرباری ئەو گرفتو گۆبەندە، دەقی شیعرەکە (حەللەق مەلەق) کەشاعیر بۆ گاڵتە لەسەری نووسیووە (شیعری حوڕ)، لای هەندێ شاعیرانو نووسەرانی ئەوساش کەوتە بەر رەخنەو گلەییکردن لەهەژار، گوایە گاڵتەکردنە بەشیعری نوێو نوێخوازی عەرەبیو کوردی. هەژاری شاعیر لەپێشەکی شیعرەکەیدا هەر ئەوەندەی نووسیووە (شیاوی باسە عارەبو کوردی عێراقی هەڵبەستی تازە بابەتی پەت پساویان کەبەلاوە زۆر پەسندە ناویان لێناوە، شیعری (حوڕ)، واتا (ئازاد).

ئەم لایەش کەشیعری (حەللەق مەللەق) ورووژاندنی بابەتێکی سەربەخۆ هەڵدەگرێو ئێمە پێشتر لەنووسینێکی سەربەخۆ بەناوی (هەژارو شیعری نوێی کوردی) لەژمارەیەك لەژمارەکانی سالی ١٩٩٢ی رۆژنامەی خەبات لەو باسەمان بەدرێژی کۆڵیوەتەوە. سەرباری ئەم شیعرە هەژار موکریانی چەندین شیعرو بابەتی دیکەی هەمەجۆری لە گۆڤاری هەولێردا بلاوکردۆتەوە. لەراپرسێکی گۆڤارەکەدا دەربارەی چۆنییەتی پێشخستنی شاری هەولێردا دەڵێ: (رۆژێك بەناو شاری هەولێردا تێپەڕدەبووم تووشی چەند گۆڕستانێك هاتم لەناوەڕاستی شاردا کە بەراستی سەرنجیان راکێشام. وام بەدڵداهات کە زیندووەکانی هەولێر وەك بیر لەمردووەکانیان دەکەنەوە نیو ئەوەندە بیر لەخۆیانو ژیانی رۆژانەیان بکەنەوە، هەولدەدەن شارەکەیان لەهیچ شارێکی دیکە دواناکەوێو ئەگەر بەدەستی گەل داوای خۆشی بوونی شارەکەیان لەکاربەدستان بکەنو لەجیاتی ئالای رەنگاوڕەنگی گۆڕستانەکان گەلێك ئالا بەسەر مەدرەسەو خەستەخانەو کارگەوە دەبێت. قسە قسە دەبڕێ: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی (خیر القبور الدوارس) واتا چاترین قەبرستان ئەوانەن کە شوێنەواریان نامێنێ، (بەڵام داخی گرانم ئەوە کۆتایی سەدەی بیستەمەو هەمان گلەیی تاکو ئێستاش ماوە... جا نازانم تا سالی سێ هەزاریش دەمێنێ یان نا...؟)

وەك گوتمان هەژار بەیەکێك لەنووسەرە هەردەدیارەکانی گۆڤاری هەولێر دادەنرێت بۆیە

پەیوەندی ئەو لەگەڵ گۆڤارەکەو شارەکە زۆر لەوە قووڵترە کە نووسەرێك هەر تەنها بەنووسین پەیوەندی لەگەڵ گۆڤارێك یا ڕۆژنامەیەکدا دەکات. ئەم ڕاپرسەی گۆڤارەکەش لە هەزار دەربارەی شاری هەولێر وەك ئەوەیە لەکەسێکی شارەزاو ئاشناو خەڵکی شار بکرێت نەك تەنیا لەنووسەرێکی ڕێبوارو پیادە.

لایەنێکی دیکەی پەیوەندی هەزار لەگەڵ شاری هەولێر ئامادەبوونی کاریگەرانەی بۆنە ئەدەبیو ڕۆشنبیرییەکانی بووە، جا چ لەبەستنی کۆنفرانسی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر بووبێ لە ١٩٧١/١/١٥دا، یا لەبەستنی کۆنگرەی دووەمی یەکێتی نووسەرانی کورد کە لەهەولێر بەسترا. یا میهرەجانی حاجی قادری کۆیی بەبۆنەی دانانی پەیکەری حاجی قادر لەکۆیە کە لەلایەن کۆڕی زانیارییەوە بەستراودولەو بۆنانەشدا هەزار جگە لەخوێندنەوەی وتاری یەکێتی نووسەران کە ئەوسا تا کۆنگرەی دوو سەرۆکی بووە، لە گفتوگۆو لێدوانو باسی ئەدەبی کۆڕی شەوانو ڕۆژانی هەولێرو کۆیێ پڕ لەبابەتو باسو خواسی ئەدەبیو سیاسیو نەتەوەیی کردووە. باسکردنی ئەمانەش لەوتارێکی گۆڤارێك دەردەچێت بۆیە هەر بەوەندەی ئێرە دەوەستین.

گەڕان بەدوا دەروێش عەبدوڵلای سەرمابردوو

بەگوێرەی ئەوەندە زانیارییە کەمانەی هەزار دەربارەی ئەو زاتە دەیگێڕێتەوە دەبێ ئەم دەروێش عەبدوڵلایە، لەدەروێش عەبدوڵلای بلوێرژەنی گۆرانی شاعیر جیابێت؟ ئەو دەروێش عەبدوڵلا دەفژەرنە کەخەڵکی هەولێربووە، هەژاری شاعیر لەمەهاباد لەسالانی چلەکان دەبێتە ئاشناییو سەرسامی هونەری دەفژەنینیو گۆرانی گوتنو زەوقو شەوقی شیعر گوتنی دەبێت، هەربۆیە لەدیمانەیەکیدا کە بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی بۆ ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق لەگەڵی سازکردووە بەو شێوەیە باس لەدەروێش عبدوڵلای دەفژەن دەکات: (ئەودەروێش عەبدوڵلایە زۆر ساحێب زەوق بوو، خەڵکی هەولێر بوو شیعری زۆر زۆری لەبەربوو، هەم شیعری وەتەنی، هەم شیعری کاکی هیرانی. ئەو دەروێش عەبدوڵلایە جیا لەئەوەی مامۆستا گۆران ئەوەی مەن دەمناسی دەروێش عەبدوڵلای سەرمابرووشیان پێدەگوت. ئەوە بەدەف لێیدەدا، گۆرانی دەگوت..) وەك لەهەژاری شاعیرەوە بۆمان دەرکەوت ئەوسا سەرسامی ئەو دەورێش عەبدوڵلا سەرمابردووەبووە، کەبەگۆرانی گوتنو خوێندنەوەی شیعرە نیشتمانییەکانی شاعیرانی کوردو شیعرەکانی سافی هیرانی شاعیرو ژەنینی دەف، زەوقی هەژاری هێناوەتە خرۆش بۆیە باسی لێوەدەکاتو پێی دەڵێ (زۆر ساحێب زەوق)بووە.

لەوە بۆمان دەردەکەوێت هەژار موکریانی هەر لەزووەوەو بەر لەوەی بێتە کوردستانی عێراق ئاشنای هەولێرو خەڵکی هەولێر بووە، دواتریش کە لەنزیکەوە لەگەڵ خەڵکی هەولێرو هەولێرییەکان، ئاشنا دەبێت زێتر عەشقیان دەبێت. تەنانەت لەچامەی شیعری (منو بولبول)دا، بەم شێوەیە وەسفی ساتی دەفژەنینی عەبدوڵلای سەرمابردوو دەکات:

**سەرمابردوو بەدەفەوە**
**هەڵدەخولێ بەبەرسەفەوە**

هەڵبەت لەم چامە شیعرییەی هەژاردا، شاعیر لەوەسفی گۆرانیبێژانو لەنێو هونەرمەندانی (دەفژەنو کەمانو شمشاڵژەنو تارژەنو چووزەلەژەنو دنبگلێدەردا) ئەو هونەرمەندانەی هەڵبژاردوون کە

...ی کەیفی پێیان پێدێ‌و سەرسامی بەهرەو سەلیقەی ...ی سەلیقەی هونەرییانە.

...دا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، ئایا ئەو دەروێش ...ولا دەفژەنە سەرمابردووەی کە هەژار باسی ...کات دەبێ حاجی عەبدوڵلای مەقامزان‌و دەفژەن ٠-١٩-١٩٦٣) بووبێت یا کەسێکی دیکەیەو تا ...ت هەر ئەو زانیارییەمان دەربارەی هەیە؟.

گەر رێکبکەوێت حەز دەکەم لەهەولێر دابنیشم

...مە دەقی قسەی هەژار موکریانی شاعیرو ...عری گەورەی کوردە، کە بۆ بەرێز فەلەکەدین ...کعی کردوویەتی‌و ئەویش چەند بەشێکی ئەو ...تیەی بلاوکردۆتەوە. هەڵبەتە لەم چەند حەزو ...زووە بەتینەی هەژاردا ئەوەندە دەخوێنینەوە ...عتی بڵێین هەموو عیشق‌و خۆشەویستی هەژار بۆ ...نێر لەوەدا کۆدەبێتەوە کە حەز دەکا لەنێو شارەکە ...شتەجێ بێ‌و بەیەکجاری لێیدابنیشێ. هەڵبەتە ...شتن) کە وشەیەکی کوردی موکریانی‌و هەولێرییە ...رامبەر بەوشەوی (نیشتەجێبوون) دێ، واتای ئەوە ...گمینێ‌ئەوەیان پێچەوانەی پیادەیی‌و کاروان‌و گەڕان‌و سوڕانە.. هەژاریش کە بەدرێژایی ژیانی ئەم شوێن‌و ئەو شارو ئەوجێگاو ئەو وڵاتەو ئەوی دیکەی کردووە. کەم بۆی لواوە بەیەکجاری لەشوێنێ ئۆقرە بگرێ.. هەر لە مهابادی زێدی لەدایکبوون‌و سەردەمی کۆماری کوردستان لەو شارەوە بۆ کوردستانی عێراق‌و بەغداو سوریاو لوبنان‌و پاشان ...کەو بارەگایەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولی مەزن‌و دواتر سەردانی وڵاتانی سۆڤیەتی جاران‌و ئەوروپاو قاهیرەو جارێکی دیکە کوردستانی عێراق لەنێو شاران دڵی بەهەولێر خۆشەو ژیانی لەو شارەدا ئاسوودە دەبێ. ئاخر ئەم دیمانەیە بەرلەکۆچی دوایی بەماوەیەکی کەم بوو، وەك بەرێز فەلەکەدین کاکەیی ناوی لێناوە (هەژار هەولێری نەدیتەوە) تێیدا دەڵێ: (هەژار بەئاواتەوەبوو سەر لەهەولێر بداتەوە، بەئازادی لەگەڵ میللەتی کوردو بزووتنەوەکەی بگەڕێتەوە هەولێر. زۆرجار پێیدەگوتین: گەر رێکبکەوێ حەز دەکەم لە (هەولێر) دابنیشم، هەواڵی پێگەیشت کە چەند دۆست‌و ئاشنای لەهەولێر قاتی دووەمی خانوویەکیان بۆ ئامادەکردووە، هەر وەختێ گەڕایەوە لەوێ جێنشین بێ. بەهارو هاوین‌و پاییزی هەر ساڵێك چەندین جار لە (کەرەج)ەوە دەگەیشتە کوردستان، لەبنکەی پێشمەرگە چ لەسەر سنوور یا لەناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی عێراق تا (١٩٨٨) هەوای دەگۆڕی‌و پشوویەکی دەدایەوە. بەداخەوە یەك هەفتە پێش راپەڕینی ئەمساڵ واتە راپەڕینی ساڵی ١٩٩١. م.خ.م.) چاوی لێکنا، ئەگەر وەختێ راپەڕینەکەو رزگاربوونی کوردستان بمابا، بێگومان هیچ نەبێ سەری لەهەولێر دەدایەوە..)) ئەوەبوو مەرگ مۆڵەتی نەدا هەژاری شاعیر بە هەولێری شارو هەولێری وەفاو ئەمەکداری.. بەهەولێری کوردایەتی‌و پێدەشتی خوێن‌و بەرگری‌و مەڵبەندی دێرینی دوێنێ‌و پایتەختی ئەمڕۆی کوردستان ئاشنابێتەوە. ئەوەبوو لەرۆژی (١٩٩١/٢/٢١) گیانی سپاردو ماڵئاوایی یەکجارەکی لێکردین..

ئەوەیان عیشق‌و خۆشەویستی ئەزەلی نێوان خاك‌و مرۆڤە. نیشتمانپەروەران، ئەدیب‌و هونەرمەندانی رەسەن رۆشنبیران‌و تێکۆشەران زیاتر بەخاك‌و کێشە رەوایەکەیەوە دەلکێن‌و پابەندی پیرۆزی خاك‌و بەرزی واتاکەی دەبن.

لەدوای ئەو عیشــق و پەیوەندییــە خۆشەویســتییە هەژاری شــاعیر بــۆ هــەولێرو هەولێرییــەکان لــەدوای کۆچی دوایی هەژارەوە چییان بۆ کــردووە.. ئەمانــەی خوارەوەش وەڵامی پرسیارەکەیە.

کاروچالاکییە رۆشنبیرییەکانی هەولێر

دوای کۆچــی دوایــی هــەژاری شــاعیرو نووســەری پایەدار. ناوەندە رۆشنبیریی و بنکە ئەدەبییەکانو دەزگا رۆشــنبیرییە جەماوەرییــەکانو دواتریــش وەزارەتــی رۆشنبیریی و رۆژنامەو گۆڤارەکــان. بایــەخیان بەهــەژار موکریانیی و ئەدەبیاتی هــەژارو ژیــانو بەرهەمــەکانی داوە، بۆنەی ئەدەبیی و دیدارو کــۆڕو میــهرەجانیان بــۆ ســازکردووە. بەرهــەمو کتێبیــان بــۆ لەچاپداوەتــەوە. ئەمانەی خوارەوە ناوهێنانی هەندێ لەو چالاکییانەیــە کــە لــەپێناو باشــتر ناســاندنی ئــەدەبیاتی هــەژار موکریانییە.

یەکــەم: لەســاڵی ١٩٩٢ەوە بەتایبــەتیش لــە (٢/٢١)ی هەمــوو ســاڵێکدا بایــەخ بەیادکردنــەوەی هــەژار موکریــانیی و بەرهەمــەکانی دەدرێــت بەسازکردنی کۆڕی ئــەدەبیی و تەنانــەت میــهرەجانو سیمیناری فراوان لە زۆربــەی شــارو شــارۆچکەکانی کوردستان بەتایبەتیی و لەهەولێری پایتەخت، بنکــەو ناوەندە رۆشنبیرییەکان بایەخی پێدەدەن.

**دووەم: ساڵی ١٩٩٦ لە پیرمــامو لــە رۆژانــی (٢٤-١٩٩٦/٢/٢٥) بزاڤــی رۆشــــنبیرانی نوێخــواز میــهرەجانێکی رۆشــنبیری لــەژێرناوی (هەژار گەورە نووسەرو شاعیرو پــارێزەری زمــانو کولتــووری کــوردی) ســازکرد. ئــەم میهرەجانــە بــەچاودێری مەکتــەبی نــاوەندی رێکخــراوە جــەماوەریی و پیشــەییەکانی پــارتی دیموکراتــی کوردستان بوو، هەر راستەوخۆش بەسەرپەرشــتی مەکتەب پەیکەری هــەژار لەلایــەن هونەرمــەند (دارا محەمەد عەلی) دروستکرا..**

لەو بۆنەیەدا کە ســاڵرۆژی پێنجــەمینی کۆچــی دوایی هەژار بوو. لەگۆڕەپانی ستراتیژی چوارڕیــانی هەولێر- شەقڵاوە- پیرمام- سەری ڕەش، رێوڕەســمی پەردەلادان لەسەر پەیکــەری هــەژار بــەئامادەبوونی نوێنەری جەنابی سەرۆك بــارزانی بــەڕێوەچوو. دوای مەراســیمەکە بۆمـــــاوەی دوو رۆژو لەرۆژانــــەی میهرەجاندا چەندین بابــەتی ئــەدەبیی و لێکۆڵینــەوە لەشیعرو هونــەری وەرگــێڕانو ئــەدەبیاتی هــەژاردا خوێندرانــەوە، ســەرباری ئەمانــەش هــەر بــەیادی هــەژارەوە لەدوابڕگــەی میهرەجانەکــە کۆمەڵــێ شاعیر شیعریان خوێندەوە.

٣-لەســــــــاڵانی (١٩٩٧و ١٩٩٨و ١٩٩٩و ٢٠٠٠)دا بزاڤــی رۆشــنبیرانی نوێخــواز بایــەخێکی بەرچاوی بەیادکردنەوەو ســیمینار بەســتن دەربــارەی ئەدەبیاتی هــەژار داوە. هــەروا هــەموو ســاڵێکیش رادیــۆو تەلــەفزیۆنی کوردســتانو هــەرێمو گــوڵانو تەنانــــەت رێکخــراوە جەماوەرییــــەکانو بەشــــی رۆشــنبیریی و راگــەیاندنی ناوچــەکان یــادی هــــەژار موکریــانی بەلێکۆڵینــەوەو وتــارو باســی ئــــەدەبی هەمەجۆر دەکەنەوە.

٤-لەهاوینی ١٩٩٢ لەسلێمانی سیمینارێك بــۆ هــەژار موکریــانی ســازکرا. لــەو ســیمینارەدا کــە بەسەرپەرشتی بــەڕێز مــەحموود زامــدار بــەڕێوەچوو چەندین بابەتی هەمەجۆر پێشکەشکران.

٤-ئـەم سـاڵ دەزگـای ئـاراس لەهـەولێر سـەرجەم شیعرەکانی هەژار موکریانی لـەچاپێکی قەشـەنگدا کۆکردەوەو بەناوی بۆکوردستان بەچاپی گەیاند.

هەڵبەتە بۆ هەژارو ناساندنی ئـەدەبیاتی هـەژار گەلـێ کـارو بەرهـەمی دیکـەی هەمـەجۆر ئەنجامدراوە، بەلای منەوە سەرباری ئـەو سـیمینارو میهرەجانو کـۆڕە ئەدەبیانـەی کـە بـۆ ئـەدەبیاتو ژیانی هـەژار موکریـانی سـازکراوە، دروسـتکردنی پەیکەرەکەی پیرمامو ناولێنانی گۆڕەپانەکەش هـەر بەناوی هـەژارەوەو دواتـر چـاپکردنی دیوانـی (بۆکوردستان)ی باشـترینی کارەکـانو داواشـان لێدەکرێت، کارو بەرنامەی دیکـە بـۆ بـەرزڕاگرتنو ڕێزگرتن لەبەرهەمو ژیانی هەژار پیادەبکەین چونکە هەژار تـەواوی ئـەدەبیاتی کوردیمـانی پڕکردۆتـەوە، لەهەموو بوارێك بەخششی بەخشـیوە، شـیعرەکانی خزمەتی نەبەردی پێشـمەرگەی کوردسـتان بـوونو، شـاری هـەولێرو هەولێرییـەکانی خۆشویسـتووەو بەبەرزو ڕێزەوە باسیان دەکات.

## سەرچاوەو سەرنج

١-چێشتی مجێور- هەژار- چاپی یەکەم پـاریس ١٩٤٧.

٢-بۆکوردستان- هەژار چاپی چـوارەم- هـەولێر ٢٠٠٠.

٣-گۆڤاری ڕێگای ئاشتیو سۆسیالیزم- ژمارەی (٣٠) سـاڵی ١٩٩١ وتـاری (هـەژار) نووسـینی فەلەکەدین کاکەیی.

٤-دیمانەی دەنگـی کوردسـتانی عـێراق لەگـەڵ هەژار موکریـانیدا سـالی ١٩٨٧. دەسـتنووس، دانـانی پرسـیارەکانو سەرپەرشـتی دیمانەکـە فەلەکەدین کاکـەیی. ئـەنجامدانی هـەمزە ڕەشـید. ڕاژان ١٩٨٧.

٥-گۆڤـاری هـەولێر ژمـارە (٦) سـاڵی ٢٠٠٠ بابەتی گۆڤاری هەولێر سەرنجو سەرهەڵدان. ئـەکرەم مەولود.

٦-چەند ژمارەیەکی گۆڤاری هـەولێری سـالانی (١٩٧١-١٩٧٣).

٧-سەیری وتاری حاجی عـەبدوڵلای مـەقامزان بکـە. گۆڤـاری هـەولێر ژمـارە (٧) سـاڵی ٢٠٠٠ جەلال خدر.

٨-لەخوێندنەوەی ئەم بابەتـەدا، بـەهیچ جـۆرێ بیرت بـۆ ناوچـە پەرسـتیو شـارچیایەتی، نـەچێت. خۆشەویسـتی شـار لای مـن وەك خۆشەویسـتی نیشتمانو کوردستانەکەمە. بۆیە ئـەم بابەتـە دوورە لەناوچەگەرییـەتی ماناکـانی ناوچەپەرسـتی (م.خ.م.).

٩-بابەتەکـە زیـاتر پـەیوەندی بەنووسـەرانی خـەڵکی شـاری هـەولێرو هـەولێرەوە هەیـە، دەنـا پـەیوەندی هـەژار زۆر فراوانـترو قووڵـتر ڕۆچـووە بەدەیان ئەدیبو نووسـەری دیکـەی کـوردو غـەیرە کوردو دەیانو سـەدان بـیرەوەریو سـەرنجی جوانـی هـەژار بۆشـارانو شـوێنانی دیکـەی کوردسـتانو دەرەوە هـەنو دەکـرێ بابـەتی دیکـەیان لەسـەر بنووسرێت.

* * *

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

پاش بڵاوبوونەوەی وتارێکم لە ژمارە (١٢)ی گۆڤاری (هەولێر)دا، بەناونیشانی (هەولێریی کوردن نەك تورکمان)، ڕۆژنامەی (تورکمن ایلی) لەژمارەکانی (٤١٧، ٤١٨، ٤١٩)و ڕۆژنامەی (قارداشلق)یش لە ژمارەی (٤٣)یدا چەند وتارو ڕوونکردنەوەیەکی بێ سەروبەر (بەتایبەتی قارداشق) بڵاوکردبووەوە کەهەر هەمووی بریتی بوو لەقسەی ساردوسڕو بەکارهێنانی هەندێ وشەی ناشیرین بەرامبەر بە خۆمو وتارەکەم وەك (وتاری پوچ، ڕەگەزپەرست، توندڕەو، شۆڤێنیو.....تاد) کە بەڕاستی هەر هەموویان ئاستنزمی نووسەری وتارەکە نیشاندەدەن. دیارە ئەم دوو ڕۆژنامەیە بەتایبەتی نووسەرانی وتارەکان باش لەبابەتەکەی من نەگەیشتوونو ئەوەندەی کە لێی تێگەیشتوون توانای وەڵامدانەوەیان نەبووە. من لە وتارەکەمدا نکۆڵیم لەهەبوونی تورکمانی عێراق نەکردووە، بەڵکە نکۆڵیم لە تورکزمانەکانی هەولێر کردووە ئەویش بەدانپێنانی پیاوماقوڵانیان بەکوردایەتی خۆیانو کەسایەتی واشیان تێدابوو بەو پەڕی دڵسۆزییەوە کوردایەتی خۆیان دەکردو بەشداریشیان لە کۆمەڵەو یانەو حزبە سیاسییەکانی ساڵانی سییەکانو چلەکانو پەنجاکانو شەستەکانو حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو دەکردو نموونەش زۆرن.

جا من حەزم دەکرد نووسەرانی ئەم چەند وتارە بەچەند بابەتێك یان بەچەند لێکۆڵینەوەیەکی مەوزوعی وەڵامی بابەتەکەم بدەنەوەو هەر هەڵەیەکیش ئەگەر هەبووبێ بەسەنگێکی فراوانەوە بیخەنەڕوو نەك بەم شێوازە نارۆشنبیریانە بێنە وەڵام.

لەراستیدا من وەڵامێکی زۆر هێمنم بۆ نووسەرانی ئەم چەند وتارە ئامادەکردبوو کە بەچەند بەڵگەیەکی بڕواپێکراوو نوێوە دەوڵەمەندم کردبوو، بەڵام هەردوو برای بەڕێزم سەرنووسەرو بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (هەولێر) بە پێویستیان نەزانی حالی حازر زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بڕۆمو تەنها ئیکتیفایان بەبڵاوکردنەوەی ئەم ڕوونکردنەوەیە کرد وەکو هەقێکی ڕەوای خۆم.

ئەوەی ماویشە بیڵێم هەر میللەتێك ڕەمزێکی خۆی هەیە کە جێی ڕێزو تەقدیری ئەو میللەتانەن، لەوانەیە سەبارەت بە میللەتێکی دیکە وانەبێ، بۆیە ئێمەش ڕێز لەهەستی ئەو میللەتانە دەگرینو ئەوەی ڕوونکردنەوەکانی ئەم چەند ڕۆژنامانەش بخوێنێتەوەو، بابەتەکەی گۆڤاری (هەولێر)یش بخوێنێتەوە، ئەوا هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

**عەباس سلێمان سمایل**



# جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر

هوشیار عەبدوللا

## پێشەکی

لەولاتی عێراق و هەرێمی کوردستانی عێراقدا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان لەزۆربەی شارو گوند و شارۆچکەکاندا تا دوا ساڵانی چلەکانیش دەبینران، پاش ئەوەی قەوارەیەکی سیاسییان لەفەلەستین بۆ دامەزرا بەگوێرەی پەیمانی بلفۆری ساڵی ١٩١٧ز بەرەبەرە جوولەکەکانیان لەولاتانی جیهان رەوانەی فەلەستین کرد، یەکێک لەو ولاتانەش عێراق و هەرێمی کوردستان بوو، کە ژمارەیەکی زۆر جوولەکەی تیدا بووە، دەڤەرەکەی ئێمەش یەکێک بووە لەو دەڤەرانە. بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کەشتێک دەربارەی جوولەکانی ناوچەوی دزەییاتی دەشتی هەولێر بنووسم بۆ ئەوەی نەوەی ئێستامان شتێک دەربارەی جوولەکەکانی ولاتی کوردەواری و دەڤەرەکەمان بزانن، لەگوندەکانی دەشتی دزەییاییەتیدا ژمارەیەک لەجوولەکەکان هەبوون، لە هەر گوندێک چەند بنەماڵەیەک دەژیان بە زۆری بەکاری خەمچیاتی و رەنگ و ریس رەنگ کردن و جولایی و دروست کردنی جاجم و دووگرد و تیرو کوتاڵ فرۆشتن و عەتاری و بەرگدروو زێرینگری خەریک بوون.جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی لەگوندەکانی دەشتی ملکیە دەشتی پشتری-دەشتی شەمامک و تەنانەت گوندێکیان بەناوی (شابان شارە) هەبووە. لەشارۆچکەی (دیبەگە) و دەوروبەری و ناوچەی کەندیناوەو لەشارۆچکەی (مەخمور) و دەشتی قەراجێ بلاوبوونەوە ژمارەیەکی زۆریشیان لەدەشتی بەرانەتی و ناو شاری هەولێر دا دەژیان تەنانەت گەرەکێک بەناوی (تەعجیل) بەشێکی جوولەکە بوو کە بەناوی (تەعجیل یەهود) بەگەرەکی جوولەکان ناسراو بووە.

لەوانەیە پرسیار بکەن بڵێین: ئەدی ئەو جوولەکانە چۆن کەوتوونەتە وولاتی عێراق و هەرێمی کوردستان؟ مێژوو و بۆمان دەگێرێتەوە کەوا لەزەمانی ئاشوورییەکاندا پاشایەکی بەهێزیان هەبووە ناوی (سەرجۆنی ئاشووری) بووە، ئەم پاشایە شاری (سامرە) ی لەفەلەستین داگیرکردووە. جوولەکەیەکی زۆری لێ دەرکردو بردنی بۆ (نەینەوا) و وولاتی میدیا. ئەم جوو گواستنەوەیەش لەمێژوودا پێ دەڵێن (دیلایەتی جوولەکەکان بەدەست ئاشوورییەکانەوە).

(نەبو خەزنەسری دووەم ٦٠٤ پ.ز - ٥٦٢پ.ز) پاشای وولاتی بابل لەشکرێکی بەهێزی نارده شاری (یەهودا- قودس) لەفەلەستین و لەساڵی (٥٩٧پ.ز)و داگیری کرد

ژمارەیەکی زۆری لەجوولەکەکان بەدیل گرت و هێناوینە (بابل) ئەمەش لەمێژوودا ناوی (یەکەم دیل گیری بابلی) لێ دەندرێت. لەساڵی (٥٨٦ پ.ز) دا جوولەکەکان دووبارەکەوتوونەتەوە سەر مل کەچ نەکردن و سەرکێشی بۆیە جارێکی دیکە (نەبو خزنەسر) پەلاماری شاری قودسی داوەو داگیری کردووەو ئەم جارەیان (٤٠٠٠٠) چل هەزار جوولەکەی بەدیل گرتووەو هەمووییانی هێنایە شاری بابل ئەمەش لەمێژوودا بە (دووەم دیل گیری بابلی) دادەنرێت. پاش ئەوەی بابلیەکان بەدەستی ئەخمینی یەکان لەناو چوون ئەو هەموو (دیلە جووانە) بەناو گوندو شارو شارۆچکەکانی و وڵاتی عێراق و کوردستان بڵاوبوونەتەوە.

ئەمەش ناوی ئەو گوندو شارو شارۆچکانەیەلە ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێریکەدا کە جوولەکەکانی تێدا ژیاوە لەگوندی (سۆربەشی خدری پاشای) ٤-٥ ماڵێک هەبوون لەوانە ماڵی (ئیسحاق) ی بوو، ئەو پیاوە ردێنێکی گەورەو درێژ و پانی هەبوو ٣-٤ کوڕی هەبوو یەکێکیان ناوی (سلێمان) بوو لەشاری هەولێر نیشتەجێ بوو، پاشلن هاتەوە گوندی (سۆربەش) ی خمچیاتی دەکرد.

ماڵێکی دیکەیان (مکاییل) بوو بەکاری عەتاری خەریک بوو، ووردە واڵەی دەفرۆشت وەکو خرێلە و سنجاق و دەرزیلەو بنێشت و سابون و شتی دیکە.

ماڵێکی دیکەیان ماڵی (بنیامین) ی بوو، کوڕێکی ناو (سەلیمی) هەبوو، ژنەکەی ناوی (گورجی) بوو. هەروەها ماڵی (حەنۆکە) ش لەوێ بوو (شیرین) ە جوو هەبوو، ماڵی لە هەولێر بوو، بێوەژن بوو، ٢-٣ منداڵی لەپیاوە جووەکەی هەبوو، (مام حاجی حەسۆ) لەگوندی سۆربەشی دادەنیشت سەرکاری خدری پاشای بوو، دێتە هەولێرێ، لەوێ لەگەڵ خوشکە شیرینی رێک دەکەوێت و بۆی دەبێتە موسوڵمان و مێردی پێدەکات و هینایەوە گوندی، چەند ساڵێکی لەگەڵدابوو کوڕێک بەناوی (تەها) و کچێکی بەناوی (ستیلە) ی لەمام حاجی حەسۆی هەبوو، لەکاتی رۆیشتنی (جوولەکەکان) لەکوردستاندا بۆ فەلەستین پلکە شیرین بەبیانووی ئەوەی سەر لە منداڵەکانی دەدات، دێتە هەولێرێ و لەوێ بەگەڵ منداڵەکانی دیکەی دەکەوێت و لەگەڵ جوولەکەکان دەڕوات مام حاجی حەسۆ و هەردوو منداڵەکانی بەجێ هێشت بۆوە (جوولەکە).

هەنووکەش کاک (تەها) ماوەو لەشاری هەولێر نیشتە جێ یە. لەگوندی سۆرەبەشدا هەندێ کەس فێری زمانی (جوولەکان) ببوون، بەحوکمی ئەوەی لەکاتی منداڵییاندا لەگەڵ منداڵانی جوولەکەکان یاری و گەمەیان دەکرد و جیرانی یەکتر بوونەو هات و چۆیان بەسەریەکەوە زۆر بووە، لەوانەی کە زمانی جوولەکەیان دەزانی خوالێخۆشبوو مام حاجی وەستا ئەمین و دادەفاتم بووە.

لەگوندی (قازایخنە) شدا ٣-٤ ماڵێک هەبوون لەوانە بنیامین دوو خوشکی هەبوو بەناوی (سورامی- ئەستێر). ماڵێکی دیکەیان ماڵی (صالحۆکی) بوو. (مەلا ئۆمەر ئەحمەد) ناوێک خەڵکی گوندی قازیخانەی ژنیشی هەبوو ناوی (بەسێ) بوو هەستا لەگوندی (شێخانان) کچە جوولەکەیەکی بەناوی (بەسێ) هەڵگرت و هینایەوە گوندی و ژنەکە موسوڵمان بوو.

ـگوندی (شێخانان) سەلیمۆکە جوو هەبوو، ــنی لەوێ بوو عـەتاری دەکـرد، هاتووچۆی ـپردێ) ی دەرکرد لەگوندان دەگەڕا، ڕۆژێکیان ـبیتی شارۆچکەی (پردێ) و (شێخانان) زۆر ـحمردی کوشتبویان و سەریشیان بڕیبوو.

ـگوندی (قورشاغلو - قشاغلو) شدا چەند ــێک هەبوون لەوانە ماڵی (مـوشی) بوو، ـکەی ناوی (مەتان) بوو، (٢) دوو کوڕو دوو ـچی هەبوو، کوڕێکیان ناوی (سێون- سیمۆن) ـ ئەویدیکەیان ناوی (عەبدوڵلا) بوو دەستێکی ـبوو، سـێـۆن زۆر قـوز و لاو چاک بوو خوشکێکیان ناوی (عەزیزە) بوو کچێکی زۆر ـسک و جوان و شۆخ و شەنگ بوو، گەنجێک ـگوندەکەدا هەبوو ناوی (کەریم مامز) بوو دڵی ـکچەکەوە بووە، دەگێڕنەوە دەڵێن هەموو جارێک ـبر خۆیەوە دەیگوت:

ئەی (عەیزە) جو چاوت پێرو
ـتەرازوو
لەگەر ووان ئاوا دەبوو لەخۆفی خوای
ـبایە
دەهاتمە سەر دینی توو

سیـۆن هەسـتا وەکـو کرمانجەتی دەشتی ـزەبیایەتی ژن بەژنی بە (عەزیزە) ی خوشکی لەگەڵ کابرایەکی جوولەکەی دانیشتووی گوندی (عاتلا) ی ناوچەی کەندێناوەی کرد و ژنی هێنا ـنەکەی ناوی (سوڵتان) ە بوو، پاش ٦-٧ ڕۆژان بەسەر ژنهێنانەکەیدا تێپەڕیبوو کاک سیۆن لە گـوندان دەگـەڕا بۆ ڕەنگ کـردنی و ریس لەگـوندەکـانی بناری (زوورگـەزراو) لەبەینی ئاقـاری هەردوو گـوندی قـازیخـانەو باشـتەپەدابزربوو و تاوەکـو ئێستـاش کـەس نەیزانی چی بەسەر هات.

لەم بارەیەوە دایکم (عازیە کەریم عەبدوڵلا) لەدایک بووی ساڵی ١٩١٧ز بۆی گێـرامەوە گوتی: دێتەوە بیرم نازانم چ ساڵێک بوو، کوڕێکی جوولەکە هاتە گوندەکەمان (سیۆن) یان پێ دەگوت بەکاری ڕەنگ و ریس کردن خەریک بوو، دەگەڕا لەگوندان ریسی دەکردەوە بەپارە بۆ خەڵکی ڕەنگ دەکرد، لەئاقاری نێوان گوندی باشتەپەو قازیخانە و ئەو دەوروبەرەدا بزر بوو، تاوەکو ئێستاش کەس نەیزانی چی بەسەرهات، پاش یەک دوو ڕۆژان پیرە بابێکی هەبوو لەگەڵ برایەکی دەست گۆجەدا هاتنە دوو سۆراغی لەو گوندانەی بناری زوورگەزراو دا دەگەڕان بەڵام سەد حەیف و مەخابن .. هیچ شتێکیان دەست نەکەت و بەدڵ ساردی گەڕانەوە گوندی قشاغلووی. ئامۆزایەکی ئەو (سیۆن) ە ناوی (حوجرە) بوو کوتاڵی دەفرۆشت، لە ئاقاری گوندی (عەولافات) ی ناوچەی کەندێناوەدا کوژرا.ماڵێکی دیکەیان متی (نەحۆ) ی بوو، هەستا بووە موسڵمان، خەڵکی گوندی بارو بوویەکی زۆریان کرد بەتایبەتی ئاغەی پاشای ، بەڵام لەدواییدا هەڵگەڕایەوەو بۆوە جوولەکەو هاتەوە هەولێرێ.

کاک (عوسمان فەقێ ی کێخوا حوسێن) خەڵکی گوندی سۆربەش لەدایک بووی ١٩٣٢ز بۆیگێڕامەوە گوتی: ماڵە جوولەکەیەک لەگوندی قشاغلوو هەبوو ناوەکەی نایەتەوە بیرم بەکاری زیڕینگری خەریک بوو لەشاری هەولێرێ هاتبووە گوندەکەمان، کورتەک و شەرواڵی لەبەر دەکرد و هەوری لەسەری دەنا کوڕێکی قۆز بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو، حەیرانی دەگۆت، یەکێک لەو

حەیرانانەی کە تاکو ئێستاش لەیادمابێت ئەو حەیرانەی خوارەوەیە (حەیران بە ستۆرە بەکەپرە مێلە، خەناوکەی زەردە، سەدەف خەسیلە، لەبەر شێمحەمەداغەی وەراشێ، کابایزاغەی زراری، ئەو حاکمی کسۆکباب، لەبەر خاتری نازێ و مەریێلی کورەتیمە حەیران ئیعدام ناگۆلی)ئەگەر تەماشا بکەین هەندێ وشەی بە زمانی جوولەکەی تێدایە وەکو میلە بەمانای مێو- خەسێلە- ناگۆلێ.

گەلەک جاران لەگەڵ منداڵەکانیان بەشەر دەهاتین دەکەتینە دوویان دەمانگوت:

هەدەیسی، دەیسی، دەیسی
گوو بەگۆری عەدەیسی

(عەدەس- عەدەیس)وادیارە گەورەی جوولەکەکان بووە لە وڵاتی عێراقێ (٢) دوو ماڵی دیکەیان بەناوی (ونس)و (موسا) هەردووکیلن برابوون ونس ژنەکەی ناوی (مریەم) بوو، جولاییان دەکرد، جاجم و بەر ماڵ.لەگوندی (ئۆمەراوە) ی نزیک شارۆچکەی (پردێ) ئەو گوندەش سەربەناحیەی قوشتەپەیە (٣) سێ ماڵە جووی تێدابوو لەوانە ماڵی (دانیال) ی بوو کەوا سەڵتەی لەبەردەکرد، عەتاری دەکرد، ماڵی (یەعقوب) ی ژنەکەی ناوی (خوچێ) بوو. ماڵی (داود)ە جووی خێزانەکەی ناوی (خاتون) بوو کورەکەی ناوی (شللۆم) بوو زەلامێکی درێژ بوو. داود کچێکی جوان و شۆخ و شەنگی هەبوو ناوی (بەسێ) بوو (رەحمان حاجی حمە صالح)ی خەڵکی گوندەکە خۆشی دەویست، هەڵیگردت و بردییە گوندی (قووچ) د لە ناوچەی کەندێناوە، جوولەکەکان خڕبوونەوە، هەموویان هاتنە گوندی (ئۆمەراوە)ی بۆلای ئاغای گوندی خوالێخۆشبوو (برایمی عەلی حەمەدی) شکاتیان کرد، گوایا کاک رەحمان بەزۆر کچەکەی فڕاندییە، (برایمی عەلی) ش گوتی: بابە کچەکەتان بە ئارەزووی خۆی بەگەلی کەوتووەو موسوڵمان بووە، ئەگەر دەشلێن بەزۆری بردوویەتی ئەوە ئەمن دەنێرمە دوویان و دەیانهێنمەوە و بزانن خۆی بەگەلی کەوتووە یان نا؟

ئەگەر کچەکەی خۆشتان پێ ئیقناع دەکرێت ئەوە بیبەنەوە. گوتیان باشە (برایم عەلی)پیاوی نارده دوویان، کاک رەحمان و بەسێ ی گوندی (قووچ) ی هێنایەوە (ئۆمەراوە) ی لەوێ (خاتون) ی دایکی چەندی هێناو برد کچەکەی خۆی پێ ئیقناع نەکراو کچەکە گوتی من بەئارەزووی خۆم مێردم پێکردووەو تازە موسوڵمان بوومە نایەمەوە، ناچار وازیان لێ هێنا.

هەروەها لەگوندی (گرد مەلا) ی رۆژهەلاتی ناحیەی قوشتەپەش (٢) دوو ماڵە (جوو) هەبوون، برا بوون، متی (لارۆ) ی کورێکی بەناوی (مشکۆ) و کچێکی بەناوی (گورچی) هەبوو (مشکۆ) زۆرجاران دەبووە موسوڵمان و پاشان دەگەڕایەوە سەر دینەکەی خۆی. برایەکەی دیکەی (لارۆ) بووە موسوڵمان و ناویان لێنا (فەقێ عەولا) بەڕاستی موسڵمان بوو، پیاوێکی خواناس و سەر راست بوو، لەبەرکاری جۆلایی و رەنگ و ریس کردن خەریک بوو جاجم و بەرماڵی دروست دەکرد، لەبەر سەر راستی دەست رەنگینی خۆی لەهەموو لایەکەوە خەڵک روویان تێدەکرد، لەئاخرو ئۆخری ساڵانی چلەکاندا کاتێک حکومەت جوولەکەکانی ردوانەی فەلەستین کرد ماڵی (لارۆ) ش چوونەوێ، (مام فەقێ عەولا) ش ماڵی هاتە

هەولێر و لەگەڕەکی سەیداوە نیشتەجێ بوو، هەر کاری جولاییییەوە خەریک بوو، هەر لە هەولێریش کۆچی دوایی کردووە، خودا لێ ی خۆش بێت.
کاک عەبدولڕەحمان لەدایک بووی گوندی (گرد مەلا) ی ١٩٣٨ ز بۆ یگێرامەوە گوتی: لەساڵی ١٩٤٣ز (٥) پێنج ساڵان دەبووم، مامۆستا (مەلا شەریف دوو شیوان) ی لەگوندەکەماندا مەلا بوو، ئێمە مانان مناڵ بووین لەلای ئەومان دەخوێند، من و کاک ئەحمەد شوان هەنووکە مامۆستایە لەکۆەلگای دارەتوو، محەمەد شریف ئەحمەد کوڕی مەلاشریف، سەردەمێک بریکاری وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی عێراق بوو لەبەغدا هەنووکە وابزانم لەدەرەوەی ولاتە، سەکۆی حاجی قەدۆ، کاک حەمیدی کوڕی فەقێ عەولا لەپاشان بووە مامۆستا و هەنووکە خانە نشینە لەشاری هەولێر نیشتەجێیە، لەساڵی ١٩٥١ز - ١٩٥٢ز قوتابخانەی میری بۆ یەکەم جار لا دێییەکەماندا کرایەوە، یەکەم مامۆستای قوتابخانەی میری بۆ یەکەم جار لە دێییەکەماندا کرایەوە، یەکەم مامۆستای قوتابخانەکەشمان (بەترۆس) ناوێک بوو دوایی ویش مامۆستا (جەودەت تەیور) بوو پاشان مامۆستا (فەوزی عومەر) هات وابزانم ئەو مامۆستا خەڵکی کۆیە بوو ئەنجا مامۆستا ئیسحان عەلی مەندەلاوی هات خەڵکی شاری (مەندەلی) بوو، وابزانم لەو ساڵانەی دواییدا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

هەروەها لەدەستە ڕەنگینەکەی (پیرە قەراج) یش و لەشارۆچکەی مەخموریشدا چەند ماڵە جولەکەیەک هەبوون لەوانە ماڵی (دانۆ) ی (دانیاڵ)، ماڵی یوسی- ماڵی (خدرۆک) ی هەر سێکیان برا بوون خوشکێکیان هەبوو ناوی (شۆرێ) بوو بە دوو (مەلا ڕەحمانی حەمەد حوسێنی) گوندی دوو گردکانی قەراجی کەت، کەبووە موسڵمان ناویان لێنا (فاتم) هەنووکەش هەر ماوەو لەشاری هەولێر لەگەڕەکی (کوران)نیشتە جێ یە.

ماڵێکی دیکەیان ماڵی (خدرۆک) ە جووی بوو ڕیشێکی سپی و پان و درێژی هەبوو، ژنەکەی ناوی (ڕەحمان) بوو، کوڕێکی هەبوو ناوی (سەلمان) بوو لەشاری هەولێری دادەنیشت بە دوکانداریییەوە خەریک بوو، ناوە ناوە سەردانی ماڵی باوکی دەکرد و دەهاتە مەخموور، خدرۆک (٥) پێنج کچی هەبووبە ناوی ((سورامی)، ئەستیر- ئاسک، سەبحە، مەلکە خمچیاتی یان دەکرد، ماڵێکی دیکەیان ماڵی(ینحاس) ی بوو، پیاوێکی پیر بوو، ژنەکەی ناوی (خاتون) جاحێڵ بوو، هەستا بەدوو (ڕفیق مەلا محەمەد) ی کەت ڕفیق برای مەلا غەریبی مەلا محەمەدی چنێرانی بوو کاتی خۆی ئەو بنەماڵەیە لەگوندی (چنێران) ی نزیک (شەقلاوە)، و لە ناوچەی خۆشناوەتی کەوتبوونە شارۆچکەی مەخموور، مەلا محەمەد کاری عەریزەنووسی دەکرد،پاشان کە جولەکەکان ڕۆیشتن ئەویش بەگەڵیان کەت بۆ فەلەستین، مێردەکەی بەجێ هێشت کچێکی دیکەیان ناوەکەی نایەتەوە بیرم بۆ (حوسێن وسوو)ی خەڵکی گوندی (خەزنە) ی دەشتی قەراجێ موسوڵمان بوو. لە دەڤەکەماندا چەند پەندێکی پێشینان لەسەر جووان هەیە یەکێک لەمانە دەڵێن (لەماری جووان بخۆن، لەماری دیانان بنوون)موسوڵمانەکان هەموو جۆرە

خواردەمەنییەکی جوولەکانیان دەخوارد، خۆ ئەگەر کرمانجەتی دەشتی دزەییان بهاتانایە شاری هەولێر بۆ کەل پەل کرین ئەوە شوێنی دیکەیان نەبوو، تەنیا ماڵە برادەرە جوواکانیان نەبێ ئەوانەی کە مامەڵە و پەیوەندییان پێکەوە هەبوو شەوانە میوانیان دەبوون و بەکەماڵی سەڵتەنەت لێیان پاڵدەدایەوەو دەنووستن ، هەولێرییەکان زۆربەیان عادەتیان وابوو میوانیان نەدەبردەوە ماڵی پەندێکی دیکەش هەیە دەڵێن (دەرێی جووە) یا (دەمنی جووە) یا (خۆ نەبوویتە جوولەکە) یان (دەرێی جوولەکەیە).

شایان شارە (شەعبان شارە)

ناوی گوندێکی کۆن بووە، کەوتبووە دەشتی ملکییەی، لەبناری زوورگی (زوورگە زراو) هەڵکەوتبوو بەدیوی مرکییەی، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شێخ شەروان- ماستاوە-سیداوە- عەوێنە لەسەرێکە لایەکیشی زوورگی (زوورگەزراوە) لەوێ ئاودیوو بێن گوندی (بەرزەوارە) ی ناوچەی کەندێناوەیە، شابان شارە گوندێکی زۆر کۆن بووە، کاتی خۆی هی جوولەکەکان بووە، دەڵێن بەناوی کابرایەکی جوولەکەیەکە ناوی (شابان) بووە، ئەو ئاوەدانی کردۆتەوە، هەندێکیش دەڵێن (شارەش) هەر ناوی گوندێکی دیکەی جوولەکەکان لەنێزیک گوندی (شابان) هەر چۆنێکی بێت کاتی خۆی ئەو ناوە بەتایبەتی دەشتی شەمامکێ جوولەکەی زۆر تێدابووە، زۆر لە بەساڵاچووەکانی دەڤەرەکەمان شوێنەوارو ئاسەواری ئەو گوندەیان کاتی خۆی دیوە، ئەو گوندە لەزووەکەوە نەماوە و کلول و وێران بووە، وابزانم ئاقارەکەی هەندێکی لەگەڵ ئاقاری (شێخ شەروان) ی کەوتووە، بەشەکەی دیکەشی بەبەر ئاقاری گوندی (عەوێنە) ی کەوتووە، لەدەڤەرەکەماندا ناوی (شابان) دەتوانم بلێم هەرنییە، ئەگەر هەشبێت دەڵێن (شەعبان) ئەو ناوەش زۆرکەمە. بەڵام لەناو خێلی (مەنتکان) دا ناوی (شابان) زۆرە لەپاش راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ز کەبیری چوونە هاندەران کەوتە مێشکی ئەو خەڵکەوە لەساڵی ١٩٩٤ز چەند بنەماڵەیەک لەناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێری کەکاتی خۆی دایکیلن یا ئەوەتە داپیریان جوولەکە بوونەو بوونەتە موسوڵمان و شوویان بەباوک و باپیرانیان کردوون لەرێگای خاڵ و خوازرایەتییەوە چوونەتە فەلەستین و هەندێکیان ماوەیەک لەوێ مانەوە، ئەوێیان بە دڵ نەبوو بە پرەپر گەڕانەوە کوردستان، باس و خواسی ئەو جوولەکانەیان دەگێڕایەوە کە کاتی خۆی دانیشتووی هەرێمی کوردستانی عێراقێ بوونە بەتایبەتی شاری هەولێر و دەشتی دزەییایەتی. جا یەکێک لەو جوولەکانە (دانیاڵ) ە جوو بووە کەپیان دەگوت (دانۆ) لەشارۆچەکەی مەخموور دادەنیشت، هەنووکەش ماوەو تەواو پیر بووەو هەردەم یادی دەشتە ڕەنگینەکەی (پیرەقەراج) و شارۆچکەی مەخمووری کردۆتەوە ناوی یەکەیەکەی ئەو شارۆچکەیەو جیرانەکانی پرسیوە.

هەروەها لەناو جەرگەی شاری (هەولێر) یش ژمارەیەکی زۆر جوولەکە هەبوون بەتایبەتی لەگەڕەکی تەعجیل ئەم گەڕەکە دوو بەش بوون تەعجیلی ئیسلام، تەعجیل یەهودا کەبەگەڕەکی جوولەکان بەناوبانگ بوو، ژمارەیەکی زۆریان دوکانداربوون بەکاری قوماش فرۆشتن و عەتاری

قەسابی یەوە خەریک بوونە هەندێکیشیان تەینگرو بەرگدروو مامۆستا بوونە.

(برایمۆکە) جوو هەبوو لەهەولێرێ دوکاندار بوو، دوکانەکەی لە قەیسەری بوو، قوماش و شەکر و چاو سابوون و خرپلە و ئاوریشم و دەزوو و وردەواڵەی دەفرۆشت، لەمانگی (١٠) ی ساڵی ١٩٤٥ ز پاش ئەوەی شۆرشی بارزان دامرکایەوە، بارزانی نەمر بەخۆی و (٣٠٠٠) سێ هەزار کەس ئاوارەی کوردستانی ئێرانێ بوون لەخەتی (کێلەشین) ەوە چوونە سابلاغێ. هەندێک لەو برا بارزانییانە کەوتبوونە دەشتی دزەییەتی دەشتی هەولێرێ و ناو شاری هەولێر، یەکێکیان بی مەنواو داماو لە قەیسەری دەگەڕا بۆ ئەوەی خەڵک یارمەتییەکی بدەن برایمۆک دەیگۆت :(بیاندەنێ .. بیاندەنێ لەسەر شەرەف لێیان قەومایە یارمەتییان بدەن)ئەمەی خوارەوەش هەندێک لەناوی پیاوان و ژنانی جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێرییە، ناوی ژنانیان هەندێک هەمان ناوی ئافرەتانی موسوڵمانان بووە وەکو خاتون- مەلکە-بەسی گورجی- مەتان- عەزیزە-سوراحی- ئەستیر- ستی-ستیلە- شیرین، خوچێ- فەرحە- رەحان- سۆرێ- سولتانە- مرەیم- خونچە، شۆرێ- پۆرێ- گورە (گوڵە)

ناوی پیاوانیشیان هەندێک هەمان ناوی ناوچەکە بوو بەڵام ناوی پیاوانیان جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ موسوڵمانەکان و تایبەتە بەخۆیان ناوەکانیش ئەمانە بوون صالح (صالحۆک) برایم (برایمۆک) خدر (خدرۆک) سلیمان - عەبدوڵلا - مکاییل- داود- مالم سەلیم (سەلیۆک)- دانیال (دانۆ) - سیۆن- مۆشێ- یۆسێ، رەحیم- نەسیم- ئیسحاق- بارۆخ- حسقێل- یوسف- نوری، ناجی - بارۆخ- مراد- یاقۆ- ساسۆن- عوزێر- حەبیب- هتد.

تێبینی: ئەگەر خوای گەورەو میهرەبان دەرفەتی دام لەداهاتووەدا لێکۆلینەوەو لێتۆژینەوەیەکی ووردتر و فراوانتر دەخەمە بەردەستی خوێنەران دەربارەی جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر.

سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١- زۆربەی ئەو زانیاریانەی سەرەوەم لەپیرە بەساڵاچووەکانی دەشتی دزەییایەتی وەرگرتووە لەوانە) حاجی عوسمان فەقێ کێخوا حوسێن لەدایک بووی ساڵی ١٩٣٢ شاری هەولێرەو بەرەسەن خەڵکی گوندی سۆربەشی خدری پاشایە.

٢- عازیە کریم عەبدوڵلا ١٩١٧ز تەمەنی ٨٤ ساڵە لەشاری هەولێر لەگەڕەکی رووناکی نیشتە جێ یە.

٣- هەولێوم وا دیوەو - بیستووە. بەرگی دووەم، مەولود قادر / ١٩٩٧ ل ٢٨٤

٤- شۆڕشەکانی کورد عەلائەدین سوجادی - ١٩٥٩- چاپخانەی مەعارف / بەغدا

٤- محەمەد ئۆمەر کێخوا عەولا لەدایک بووی ساڵی ١٩٢٢ خەڵکی گوندی قوشاغلو، لەژیانداماوەو لەشاری هەولێر نیشتەجێیە.

### لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری لەنێوان دوو قەڵاتدا

# خۆگریی قەڵاتی هەولێر لەمێژووداو پاشماوەیەکی قایمکاریی قەڵاتی حەلەب

**د. موحسین محەمەد حوسێن**
**مامۆستای مێژووی ئیسلام**
**بەشی مێژوو لەکۆلێجی پەروەردەی یەکەم**
**زانکۆی بەغدا**

**پێشەکی:**

کاتێک جوگرافیازانی گەورە (یاقووتی حەمەوی) جۆرە بەراوردێکی لەنێوان قەڵاتی هەولێر (ئەربل)و قەڵاتی حەلەبدا کردووە راستیی پێکاوە، ئەوەتا دەربارەی یەکەمیان دەڵێ: «قەڵاتێکی قایمەو شارێکی گەورەیە، لەساکە گۆڕێکی پان و بەرین دایەو قەڵاتەکە خەندەقێکی قووڵی هەیە... و لە قەڵاتی حەلەب دەچێت، بەڵام لەو گەورەترو رووبەری زیاترە» (١).

یاقووتی حەمەوی ماوەیەکی باشی تەمەنی لە حەلەب بەسەربردووە، دوو جاریش سەری لە هەولێر داوە، جارێکیان ساڵی ٦١٣ک - ١٢١٦ز کە لە حەلەبەوە هات و بە موسڵدا تێپەڕی و بەرەو خۆراسان و خوارەزم چوو (٢). جاری دووەمیش کە ساڵی ٦١٧ک/ ١٢٢٠ز لەوێ گەڕایەوە، هەروەکو ئیبن مستەوفیی، مێژوونووسی هەولێرو (٣) ئیبن ئەلشەعاری (٤) شاگردی باسیان کردووەو ئیبن خەلەکانی هەولێریش ئەم هەواڵەی لەیەکەمەوە وەرگرتووە. هەر بەم جۆرەیاقووتی حەمەوی خۆیشی ئەمەی دوویات کردۆتەوە. ئەم جوگرافیازانە پاشان گەڕاوەتەوە حەلەب و ساڵی ٦٢٦ک/ ١٢٢٦ز لەوێ مردووە.

**لێکۆڵینەوە:**

کە جوگرافیازانێکی وەکو یاقووت بەراوردی نێوان دوو قەڵات لە قەڵاتەکانی وڵاتانی ئیسلام بکات، دیارە قسەکە لەخۆڕا ناکات و بەچاوی خۆی بینیوویانیەتی، ئێمەش هاوڕای ئەوین، چونکە قەڵاتی هەولێر بێگومان بەقایمی بەناوبانگ بووەو رووداوە خوێناوییەکانی بەر دەرگاکانی و سەرخاکی قەڵاتەکەش کە لەمەودوا باسیان دەکەین پشتیوانیی قسەکە دەکەن. بەڵام یاقووت باسی ئەوەی نەکردووە ئایا لەلایەنی سوپاییەوە، جگە لەخەندەقە قووڵەکەی چی دی وا قایمی کردووە؟ چونکە ئەو تەنیا دەست نیشانی هەندێ جێ و دەزگای ناسەربازی دەکات وەکو بازاڕو ماڵی دانیشتوان و مزگەوت(٨).

بەڵام کە باسی قەڵاتی حەلەب دەکات، باسی جێیە پیرۆزەکانی دەکات، وەکو مەقامی ئیبراهیم خەلیل و ئەو گۆڕەی پارچەیەک سەری



مـزگـەوتی گـەورەو مـەیدانی و خـانووبەرە زۆرەكـانی و خـەندەقی قـوولّ و گـەورەی پڕ لـەئـاوی. دوای ئـەوە یاقـووت باسی ئەو شۆستانە (رصیف) دەكا كە بە بەدەنی قەلاّتەكەوە چەسپكـراوەو لەبەردی تاشـراوی لووس دروست كراوە تاكو هێرشبـەران نەتوانن پێی هەلّ بگەڕێن هـەتا ئـەگـەر لەخـەندەقـەكـەش بپەڕنەوە. ئەم شۆستـانە مەلیک زاهیر شەهابەدین غـازی كـوڕی سـەلاحـەددینی ئەیوبی بەهیممەتی بالاّی -وەكو ئەو گـوتەنی- فـەرمـانی دروست كـردنی داوە، هەروەها باسی حـەوت دەرگـەكـەشی كردووە(١٠).

لەم پێشـەكـیـەدا پشتـمان بە قسـەكانی یاقووت بەست، نەک لەبەر ناوبانگی، یان لەبەر ئەوەی كـە لەنێـوان هەر دوو قـەلاّ گـەورەكـەدا بـەراوردی كـردووە، بـەلّكو لەبـەرئـەوەی سـەردەمێک لە حـەلەب ژیاوەو لەوێش مـردووە، یەحیای كوڕی زەكەریای تێدایە، پاشان «باب الجنان» جێ نەزەرگەی ئیمام عەلی كوڕی ئەبو تالب (٩). هەروەها باسی ئەو كـارێزانەی كـردووە كـە ئاوی پاكـیـان هێناوە، هەروەها

لەچاو هەولێریشدا، ئەو تاکە جوگرافیازانە دوو جار هاتۆتە هەولێر، لەو کاتەدا بووە ئەو شارە گەشترین دەوری لەهەموو چەرخی مێژووی ئیسلامدا بەخۆیەوە دیوە، کە لەزاناو شەرع زان و شاعیرو مێژوونوسانی هەولێری و بیانی مۆنجەی دەهات، بەتایبەتی لەسەردەمی مەلیکی مەزنیدا مزەفەرەدین کوکبوری کوری زەینەدین عەلی کوچک کوری بەکتەکین، لەو دەمەدا پێش یاقووت کەسی دی نە لەدوورو نە لەنزیک باسی ئەم شارەی نەکردووە مەگەر ئیبن خەردازبە (١١) کە لە باسی دابەشکردنەکانی ولاتی عیراقدا ناوی ئەربلی هێناوە بەوە کە تەسووجێکە (ناحیە) لە تەسووجەکانی هەرێمی (دل ایرانشهر) واتا دڵی عیراق، ئەم جوگرافیازانە گوتەنی، هەر بەم جۆرەش قودامەی کوری جەعفەر (١٢) ناوی هێناوە. ئەمەش مانای وایە هەولێر لەسەدەی سێیەم و چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا، واتا سەدەی نۆ و دەو یانزدەی زایینیدا شارێکی بچووک بووە. هەر بەم جۆرە زۆر جوگرافیازانی تریش نەیان ویستووە باسی بکەنو ئەگەرچی هاوچەرخی ئەو ماوەیە بوون یان دوای ئەو ماوەیە ژیاون، بەنموونە ئەستەخری (١٣)، ئیبن حەوقەلی نەسیبی (١٤)، مەقدیسی ئەلبەششاری (١٥)...و هی دی باسیان نەکردووە، کەچی ئەمەی دواییان کە باسی هەرێمی ئاقوری کردووە باسی شارەکانی نزیک هەولێری کردووە بێ ئەوەی لەهەولێر بدوێ، ئەگەرچی هەولێر لەناوەراستی هەرێمەکەشدایە. ئەم گوێ نەدانەش لەو سەردەمەدا بێ هۆ نییەو مانای وایە شارەکە بایەخێکی وای نەبووە کە سەرنجی جوگرافیازانەکان و نووسەرانی مێژووی گشتی، وەکو یەعقووبی، تەبەری، مەسعوودی و هی دی بۆ لای خۆی رابکێشێت. ئەم حاڵەتە گرنگییەکی گەورە بەقسەکەی یاقووتی حەمەوی، هەروەها بەراوردەکەی لەنێوان دوو قەلاتە بەناوبانگەکەدا دەدا.

یاقووت گوتوویەتی قەلاتی هەولێر قایم بووە، بەڵێ رووداوەکانی مێژووی دوای ئەو، ئەو قسەیان پەسند کردووە، ئەمەش مانای وایە سەختیی قەلاتەکە بەهۆی چەند شتێکەوە بووە لەوانە دەرگەی بەهێزو قایم، قوللەی بەرگری، یان دەستۆکەری و بەربەرەکانێ کردنی هێرشبەران و، لەشکرگاکانی سەختی و قایمیی قەلاتانن. بەلام لەسەرچاوەکاندا باسی ئەم هۆیانە یان دەزگاکانی دیکەی سەربازی نەکراوە، جا ئەگەر ئەم بۆچوونەمان راست بێ ئەوا دیارە ئەو قایمکارییانە چ بەهۆی جۆری کەرەستەی بیناسازییەوە یان بەوێرانکاری چەند جارەی هێرشبەرانەوە بێت، بەرەبەرە لەناوچوون، لەسەردەمەکانی دواییشدا پشتگوێ خراون.

بەلام کە سەر لەقەلاتی حەلەب دەدەیت دەبینیت پاشماوەی دەزگاکانی سەربازی و ئاینی و کارگێری وەکو خۆیان ماون، تا ئێستاش خەندەقە قووڵەکەی ماوە، ئەمڕۆ لەدەوری خەندەقەکەدا تامانێکی تۆرە ئاسنیان داناوە تا خەڵک لێی نزیک نەکەون (١٦). هەروەها تاتە بەردە گەورە تاشراوەکانی کە دڵێی مەرمەرن زۆر بەجوانی رێکخروان و بەشێک لەبەدەنی قەلاتەکەیان داپۆشیوە، هەروەها دەروازە سەخت



و دەرکە ئاسنەکانیان ماوە.

دەروازەی یەکەم بەرارەوێکی درێژی بەردرێژکراو لەسەر خەندەقەکەوە، قەڵاتەکەو دەرەوەی پێک دەگەیەنێ، لەژێریدا هەشت دەرچەی لەسەر شێوەی تاق هەیە بۆ ئەوەی ئاو بەم لاو ئەولای رێرەوە «پردە تاق تاقەی»دا بڕوات، پانایی خەندەقەکەش نزیکەی سی مەترو قووڵایی لەسی مەتر زیاترە، بەرزیی قوڵلەی سەر ئەم دەروازەیەش ٢٠ مەتر دەبێ و لەسەر دەرگائاسنەکەی نووسراوە:

(امر مولانا الملک الظاهر غازی بن یوسف فی سنه ستمائه و ثمانیه).

ئەم قوڵلەیە لەسەردەمی کۆیلەکان «مەمالیک» کە دوای سەردەمی ئەیوبییەکان لەمیسرو شام هاتنە سەرکار، لەزەمانی سوڵتان قانسوەی غووری ساڵی ٩١٣ک/ ١٥٠٧ز نوێ کراوەتەوە، هەروەکو لەنووسینەکەی سەر دەروازەکەرا دیارە، ئەم نوێ کردنەوەش شێوەی بیناسازییەکەی نەگۆڕیوە.

ئەو رێڕەوەی باسمان کرد سەرێکی بۆ دەروازەی دووەم(دەروازەی سەرەکی)ی قەڵات هەڵدەکشێ، کە زەوییەکەی پلەپلەکراوەو گرنج گرنج ودرز درزە بۆ ئەوەی خەڵک بەئاسانی پێیدا سەربکەوێ. لە پێشانیی سەرووی قوڵلەکەدا چەند کونێکی هاوتەریبی مەودا لێک نزیک هەیە بۆ ئەوە تەرخان کراوە کە رۆنی داغ و قیری سووتاو بەسەرسەری دوژمندا برژێنن ئەگەر توانی قوڵلەی یەکەم ببڕێت و بگاتە قوڵلەی دووەم، بۆئەوەی هەر کە هاتن و ویستیان قوڵلەی دووەم ببڕن وبچنە ناو قەڵاتەوە بەم چەکە

کـــــوپرە بەردەست بکرێن. هەروەها کـــونی تیرهاوێژان و پشتێنە نووسینێکیشی لەسەر دەبینی کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دواییی سـەدەی حـەوتەمی کـۆچی سـێـزدەی زانین، سـەردەمی مـەلیک خـەلیل کـوڕی مـەلیک ئەلمەنسـوور قـەلاوونی یەکێ لە مـەلیکەکـانی مـەمالیک. پاش ئەوەی لە دەرگەی قـوللەکە بە ژوور دەکـــەوی و بەرەوپێش دەچی، لەناکـــاو تووشی چەند دیوارێکی سـافی بێ کـەلێن و کـەلەبەر دەبیت و، تەنیـا کونی تیـرهاوێژانییـان تێـــدایە، ئەو دەم خـــەریکی ئەوەیت بزانیت لەکوێوە دەچیتە ناو قەلاتەکە ، بە دەستەڕاستدا ڕێیـەک دەبینیت ، ئەم پێچ وپەنایەش بۆسـەرلێ تێک دانی دوژمنی هێرش بەر کراوە، تا گـوڕی پەلامـارەکـەیان دامـرکـێـتـەوە، ئەو دەمـەش کـە دوژمنی هێـرشـبـەر هێـزی مل لێنانی لەپڕ کپ بکـرێتـــــەوەو ڕێی لێ بزر بێت، پـاشـــــان بەدەسـتـەڕاست پێـچـبـداتەوە، قـەلات پارێزان هەلیـان دەست دەکـەوێت کـەزەبری بـاشیـان لێ بدەن و لەناویان ببەن.

لە سـەروی ئەم دەرگـــەیە، لە دیوی ناوەوە، وێنەی دوو مـاری تێک ئالاو هەلکەندراوە، وا دیارە ئەم وێنەیە کـاری کـردۆتە سـەر دەروونی قەلات پارێزان. ئەم دەرگەیەش پێی دەلێن «باب الحیات».

پاشـان بەرەو چەپ وەردەچەرخێی دەرگـەیەک دەبینی لەسەری نووسراوە:

«قناة حیـلان» کە جۆگـەیەکە ئاوی قـەلاتی لێـــودەهات و لەکـــاتی ئابلـــووقـــەداندا خـەندەقـەکـەشی پێ پڕ لەئاو دەکـرا. بێگومـان دەبێ ئەم جـۆرە جـۆگـەیەش لە قـەلاتی هەولێـر هەبـووبێـت و دوور نیـــــیــــــە هەلکـۆلێن و لێکۆلینەوەی پاشـەڕۆژ پێـوەندیی نێـوان ئەو کـەندرە (نەفـەق)ەی پێش چەند سـالێک کـە لەکـاتی تێکدانی دووکـانەکـانی دەوری قـەلاتدا دەرکەوت لەگەل مەسەلەی ئاوهێنان و دەرکردنی لەم کەندرەوە دەربخەن.

بێگومـان جۆگەی ئاوهێنانەکەی قـەلات دەبێ بەردەوام جۆمال بکرێت، ئەوەبوو مەلیک زاهیری کوڕی سەلاحەدین لەقـەلاتی حەلەب کردی کەوا وەسـتـاو وەسـتـاکـاری هێناو خۆی و سـەردارانی دەولەت هاتن و سـەرچاوەی جۆگـەکـەی پێشـان دان، ئەوجـا دەسـتـیـان کـرد بەجـۆمـال و پاک کردنەوەی. پاشـان خەندەقی قـەلاتەکەی قـوولتر کردو ئاوێکی زۆری تێکرد (١٧). هەر خۆیشی سەرپەرشتی کارەکەی دەکرد (١٨). فەرمانیدا خۆلی ناو خەندەقەکە هەل بگرن و لەسەر ڕۆخی دەرەوەی خـەنـدەقــەکـــەی دابنێن، بەم هۆیەوە قـوولترو بەرین تری کرد (١٩). ئەمە وا، بەلام بەنـســبـــەت لەچاو قـــەلاتی هەولێـــردا چ سـەرچاوەیەک باسی کـاربەدەسـتـێکی هەولێـری نەکردووە کە ئەم کارەی کردبێت.

پێش ئەوەی بـگـەیـتـــە کـــۆتـاییی ڕێڕەوە پێچاوپێچە باسکراوەکە، ڕووبەڕووی دەرگەیەک دەبیت پێیدەلێن (باب الأسدین) کە مـەقـامی حـەزرەتی خـدر وەکـو پارێزگـارێکی قـەلاتەکـە لەوێدایە. بۆیەش ناونراوە دەرگـەی دوو شێـران چونکە وێنەی دوو شـێـری لەم لاو لەو لای لێ هەلکەندراوە، یەکێکیان پێ دەکەنێ و ئەوی دی دەگـری، لەسـەر دەرگـەکـەش نووسـینێک هەیە

کـەهی سـەردەمی مـەلیک زاهیـری ناوبراوە ئەمەش دەقەکەیەتی:

«بسم الله الرحمن الرحیم، أمر بعمله مولانا السلطان الظاهر، العـالم، العـادل، المجـاهد، المرابط، المؤید، المظفر، المنصور، غیـاث الدنیا والدین، ملك الاسلام والمسلمین، سیـد الملوك والسـلاطین، قـامع الکفـرة والمشـرکین، قـاهر الخوارج والمتمردین، ابو المظفر غازي ابن الملك الناصـر صـلاح الدین یـوسف بـن أیوب أمـیـر المؤمنین أعز الله انصاره بتولي بدرالدین آیدمر الملکي النـاصـري وذلك سنة ست وسـتـمـائة» (٢٠).

پاش دەرگای دوو شێران بەکەمێک لەم بەرو ئەوبەری رێیەکە مۆڵگەی سەربازان دەبینیت، پاشان بەرێڕەوێکی پێچاوپێچی سەربان لەسەر دەگـەیە شـەقـامی سـەرەکی کـە قـەڵاتەکـە لەباشوورەوە بەرەو باکوور دەبڕێت. هەروەکو ئەو شـەقـامەی کە تائێـسـتـاش لەباشـوورەوە بەرەو باکوور قـەڵاتی هەولێر دەبڕێت. لەدەسـتـەچەپی شەقامەکەی قەڵاتی حەلەبدا پاشماوەی قەسرو گەرماو دەبینیت. لەدەستەڕاستیشدا دووکان و زیندانی قـەڵات دەبینی کـە لەبەرد داتاشـراوەو بانەکەی لەسـەر چەند تاقێکی بەخشی دروست کـراو بنیـات نراوە، پاشـان شـوێنەواری مـزگـەوتێکی بچـووک دەبینی کە بەمـزگـەوتی ئیـبـراهیم خـەلیل ناسـراوەو سـاڵی ٥٧٥ک/١١٧٩ز لەسەردەمی مەلیک ئەلسالح ئیسمـاعـیل کـوڕی نورەدین مـەحـمـوود زەنگی بەسـەرپەرشـتیـی (شـادبەخت) نوێ کـراوەتەوە، هەروەکـو لەسـەر مـەڕمـەڕەکـەی سـەردەرگـای مزگەوتەکە نووسراوە.

ئەگەر بەدەستە چەپدا بڕۆیت مزگەوتی گەورە دەبینیت کەوەختی خۆی کلێسا بووەو پاشان هەروەکـو ئیبن شەداد (کە لە ٦٨٤ک/ ١٢٨٥ز مـردووە) لەکتێبەکەیدا «الاعـلاق الخطیـرة» نووسیویەتی کراوەتە جێ قوربانیی (مەذبەح)ی ئیـبـراهیم خـەلیل، نووسـینی سـەردەرگـای مـزگـەوتی گـەورە دەری دەخـات کـە کـوڕەکـەی سەلاحەدین نوێی کردوەتەوە، کەوا نووسراوە:

«بسم الله الرحمن الرحیم، امر بعمله مولانا السلطان الظافر العـالم العـادل المجاهد الموید المظفر المنصـور غیـاث الدنیا والدین ابو المظفر الغـازي بن الملك الناصر صلاح الدین یوسف بن ایوب، خلد الله في ملکه سنة عشر وستمائة».

لەسەر تاقی دەرگاکەش نووسراوە:

«ادام الله العـز والبـقـاء لمولانا الملك الظاهر ابي سـعـیـد خـشـقـدم عـز نصرة، برسم الامـیـر الکبـیـر المخزومي تغري بردي الظاهري نـائب القلعة، عین عز نصرة بأن لایسکن احد في هذا الجامع ولا یستعمل لغیـر الصلاة ومن یحدث خلافـا علیـة لعنة الله ولعنة اللاعنین الي یوم الدین».

لەلایەکی مـزگـەوتەکـەوە منارەیەکی جـوانی چوارگـوشـەی بەپێ پلیکانەی ناوەوەی حـەفـتـاو هەشت پێ پلیکانەیی هەیە، لەناو مزگەوتەکەش دا پاشماوەی میحراب و نەخشەی قیبلەو ژووری فەقێیان ماوە، بەدەستی چەپی ناوەوەی دەرگای مزگـەوتی گەورە ژوورێک دروست کـراوە هەندێ دۆزراوەی دێرینەی قـەڵاتەکـەی لەناو داندراوە،

ئەگەر بەسەر پێ پلیکانەی نزیک منارەکەدا سەربکەویت دەتوانیت بەشی باکووری خەندەقی قەلاکەو قوللەی باکووری سەر لێژایی خەندەقەکەش ببینیت کە لەسەردەمی مەمالیکی دوای حوکمرانیی ئەیوبی دروست کراوە. قوللەیەکی دیش هەیە پێی دەگوترێ قوللەی باشوور کە لە لێژایی خەندەقەکەدا دروست کراوەو دەکەویتە لای راستی دەرگای سەرەکیی قەلات. گەشتی ناو قەلات بەبێ دیتنی ئەو کۆشکە جوانە تەواو نابێت کەوا باوە لەدوادوای سەردەمی ئەیوبیدا دروست کراوە. پێش هەموو شتێک گەرماو کۆشکی شاهانە دەبینی کە لەسەر تەرزی گەرماو خانەی تورکی لەلایەن بەشەکانی‌یەوە بینا کراوە، ئاوی گەرم و سارد بەبۆریی گۆسک (گڵ کراو) بۆ دەچێ پاشان دەگەیتە حەوشەی ناوەوەی کە بەمەڕمەڕی کووز داپۆشراوە، جوانترین دیمەنی کۆشکەکە نەخش و نیگاری دەگمەن و ئاوێزە شۆڕبووەکانێتی. لەرێگادا بەرەو هۆڵی تەختی شاهانە «قاعة العرش» هەندێ نووسین دەبینین، لەگەڵ پێ پلیکانەیەک کە دەگاتە راڕەوەکانی پاسەوانی کە کەوتوونەتە سەر دەروازەی سەرەکیی هۆڵەکە.

هۆڵی عەرش لەڕەنگینترین شوێنەواری نەخشونیگارو بیناسازیی ئیسلامیی حەلەب و شام دەژمێردرێت. ئیبن شەحنەی حەلەبی لەکتێبی «الدار المنتخب في تاريخ مملكة حلب»دا دەڵێ: میر سەیفەدین بەجکەمی نوێنەری سوڵتان مەلیک ئەلناصر فەرەج کوڕی بەرقوق فەرمانی دروست کردنی کۆشکەکەی دا، واتا هۆڵی عەرش، لەساڵی ٨٠٩دا بەڵام سەرەکەی نەگرت، پاش ئەوەی مەلیک ئەلموئید بوو بە سوڵتانی میسر هاتە حەلەب و بەسەر قەلاتەکە کەوت، فەرمانی دا سەربانی هۆڵەکە تەواو بکرێت، بۆ ئەمەش دار لە بەعلەبەک و دیمەشقەوە بهێنرێت، ئەوجا سەری گیراو بووە کۆشکێکی بەرزی ئێجگار دڵگیر. بەڵام بانەکە زۆر خۆی نەگرت و کەوت، ئەوسا بە فەرمانی مەلیک ئەلئەشرەف قانسوەی غووری ساڵی ٩١٦ک/ ١٥١٠ز بە گوومەز دروست کرایەوە، پاشان هۆڵەکە پشگوێ خرا، هەروەها قەلاتەکەش پشت گوێ خراو وێرانی رووی تێکرد. هەروەکو لێپرسراوانی ئاسەواری لای خۆمان ئەوا چەند ساڵە دەستیان کردووە بە دروست کردنەوەی دەرگای سەرەکیی قەلاتی هەولێرو دیوارەکانی دەرەوەی تاکو لە نەمان رزگار بکرێت، بەیادی رابردووی پڕ شکۆو شانازیی ئەم شارە کۆنە. دەزگاکانی ئاسەواریش لەحەلەب لەساڵانی پێشوودا هەوڵیان داوە دەست بەهۆڵی عەرشدا بێنن و دەستکاری‌یەکی باشی بکەن و سەربانەکەی بۆ دروست بکەنەوەو بە نەخشونیگاری بەردو دار رووپۆشی بکەن. دیوارەکانیشی بەچوارچێوەیەکی دار دەورە دراوە، پڕە لەنەخش، کوڵەکەکانیشی بەنەخشی هەڵکۆڵراو رازاوەتەوە، ئەوەی لەهۆڵی عەرش بێتەدەرێ دەتوانێ بەڕێڕەوێکی نهێنی کۆندا بچێت کە هۆڵەکە بەقوللەکانی بەرگری کردنەوە دەبەستێ پاشان دەگاتە دەروازەی سەرەکیی قەلات.

ئەمە بوو دەربارەی شوێنەوارەکانی قەلاتی حەلەب و پاشکۆ سوپایی و ئاینییەکانی و

جێماوە دێرینەکانی، کەوا دەکەن لێکۆڵەرەوەو میوانی قەڵاتەکە بیرێک دەربارەی بەرزیی پایەی قەڵات و پلەی شارەکە لەمێژووی ئیسلامدا پێک بهێنێ. بەڵام بۆ قەڵاتی هەولێر تەنیا قسەکانی یاقووتی حەمەوی- لەبەر ئەو هۆیانەی باس کران- دەبنە دەسمایەی ئەو کەسەی بیەوێ نسەردەمی گەشی هەولێر... لەسەردەمی مەلیک مزەفەرەدین کوکبری بدوێ.

هەرچی دامودەزگاو ئاوایییەکانی قەڵات و شارەکەشە، ئەوا یاقووت گوتوویەتی قەڵاتەکە شووریەکی بەدەوردا هاتووە، بەڵام نەناوەڕاستییەوە پچڕاوە (٢١)، وا دیارە قەڵات قەرەباڵغ بووەو چی دی جێی دامودەزگاکانی سوپایی و کارگێری (دیوانەکان)و زانستی (قوتابخانە)و کۆمەڵایەتی و نیشتەجێییەکانی لێ نەبۆتەوە، خەڵکەکە بیریان لەوە کردەوە لەدەرەوەی قەڵات دابنیشن، هەروەها هەندێ دەزگای دەوڵەتیش گوێزراوەتەوە خوارێ. وەختی خۆی، تا رادەیەک، لەلێکۆڵینەوەکەمان لەنامەی ماجستێری تایبەت بەمێژووی (هەولێر لەسەردەمی ئەتابەکی) بەپشت بەستن بەکتێبەکانی مێژوو و ژیاننامەو جوگرافیا، و بە هەندێ پاشماوەی مێژوویی ئەو سەردەمە، توانیمان ئەو سنوورە دیاری بکەین کە شاری هەولێری گەیشتووەتێ، ئەگەرچی دانانی ئەو سنوورەش کارێکی زۆر سەختە.

یاقووتی حەمەوی زۆر کاری ئاسان دەکردین ئەگەر هاتبا دەست نیشانی لایەکانی شاری بکردایە، ڕەنگبێ گرنگترین ڕێگەی نیشان کردنی ئەولایانە لە ڕۆژی ئەمڕۆدا گۆڕانی شێوەی شارەکەیە، چونکە ئەو خانووبەرانەی ئەم دەم دروست کراون لەناوچوون.. بەهۆی جۆری کەرەستەی بیناسازی کە ئەو خانووبەرانەیان لێ دروست کراوە، بەتایبەتی قوڕ کە بەرگەی گۆڕانی باری ئاوو هەواو وێرانکاریی نەگرتووە ، ئەگەر بە کەرەستەی پتەوو بەتین دروستیان بکردایە لەوانەیە تا ئێستاش دەمانەوە، هەروەکو چۆن منارە جوانەکەی(مزەفەری یە)بەرگەی زەمانەی گرتووە چونکە لە گەچ و خشتی سوورەوەکراو دروست کراوە، بەڵام خانوبەرەکانی دی، هەتا ئەو مزگەوتەی منارەکەشی لێ بووە هەموو ڕووخاون(٢٢). خانووەکانی قەڵاتی حەلەب کە لەو ماوەیەدا دروست کراون ئەوانیش هەر وابوون.

دەتوانین بڵێین ئەگەر قەڵاتی هەولێر نەبوایە، شارەکە تووشی زۆر جار گۆڕان دەهات نەک هەر لەخانووبەرەو دامودەزگاکانی، بەڵکو جێیەکەشی دەگۆڕا، چونکە مادام لەسەر ڕۆخی زێ نییەو چیایەک دەوری نەداوەو خۆی لەدەشتێکی تەخت و بەریندایە لەوانە بوو جێ بگۆڕێت. کەوابێ قەڵاتەکە بووەتە هۆی مانەوەی شارەکەو مانەوەی ناوە کۆنەکەی بە درێژایی ڕۆژگار.

قەڵات لەسەردەمی گەشی ئەتابەگیدا، شارێکی تەواوو پڕ لەدووکان و بازاڕو خانووی دانیشتوان بووە، مزگەوتی گەورەی لێ بووە، یەکەم قوتابخانە لە سەردەمی ئیسلامدا لەهەولێر سالی ٥٥٩ک/١١٦٣ز میر سەرەفتەکین ئەبو مەنسووری کوڕی عەبدوڵڵای زەینی(لە ٥٥٩ک/١١٦٣ز مردووە) و نوێنەری

میر زەینەدین عەلی کوچوکی دامەزرێنەری میرنشینی ئەتابەگیی هەولێر بووە دایمەزراندووە، سەرەفتکەین ئەم قوتابخانەیەی بۆ شەرع زانی گەورە ئەلخضر ئەبو عەباس کوڕی نەسر کوڕی عەقیلی ئەربیلی دروست کردو ناونرا (مدرسە القلعە). جگە لەوە لەو سەردەمەدا - ڕەنگبێ پێشتریش - قەلات بۆتە بارەگای میرنشینی یەکەو دایەرەکانی دەولەتی تێدابووە وەکو دیوانەکان و سەرای (٢٣) حکومەت و بەندیخانە (٢٤). قەلات دوو دەرگای بەرامبەر بەیەکی هەبووە، یەکێکیان دەرگای باشوورە کە ئێستاش و ئەوسا دەڕوانێتە ئەو مەیدانەی کە قەلات و لەو قەیسەری یە - بازاڕی کۆنی سەرگیراو - جودا دەکاتەوە کە مزەفەرەددین کوکبوری دروستی کردووە. دەرگای دووەم دەرگای باکوورە بەرامبەر بە عەینکاوە کە دانەری کتێبی (الحوادث الجامعە) کە یەکێکە لەمێژوونووسانی سەدەی حەوتەمی کۆچی پێی گوتووە (باب عمکاوا) و (٢٥) باسی ئەم دەرگایەی بەجۆرێک کردووە کەلەهەموو دەرگاکان گەورەترە، وادەگەیەنێ کە قەلات لەدوو دەرگا پتری هەبووە چونکە نەیگوتووە (اعظم البابین) بەلکو بەشێوەی کۆ گوتوویە (أعظم الابواب).

کتێبەکەی ئیبنولستەوفی دیاری کردووە کە چوار دەرگای هەبووە، دوو دەرگاکەی تر لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادابوون و (*) لەدەرگاکانی باکوورو باشوور بچوکتربوون. قاییمیی قەلاتی هەولێر لەچاو ئەو ڕووداوانەی دیتوویەتی:

هەروەکو باسمان کرد نازانین جۆری قایمکاریی ئەو قەلاتە چۆن بووەو هێزی خۆپاریزی و بەرگریی چی بووە، بەلام دەتوانین لەو ڕووداوانەی کەبەسەر قەلاتدا هاتوون بەتایبەتی دوای سەدەی پێنجەمی کۆچی و سەرەتای سەردەمی ئەتابەگی، بگەینە ئەنجامێک کە قەلاتەکە قایم بووەو داگیرکردنی زەحمەت بووە. لەوانەیە یەکەمین ڕووداوێ کەلەناواخنی کتێباندا دەیاندۆزیەنەوە قسەی ئیبن واسلی حەمەوی بێت کەمێژوونووسێکی نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی، سێزدەمینی زایینە، کەلەباس کردنی گرتنی هەولێردا بەدرێژی و ڕوون و ڕەوانی تاکە؛ باس دەکا چۆن زەینەدین عەلی کوچوک دەستی بەسەر هەولێردا گرت، کەپێش ئەو ئەم شارەو ناوچەکانی بەشێک بوون لەمولکی ئەبو هەیجای کوردی هەزبانیی ئەربیلی و میراتگرانی، پاشان هەولێر بووە بەشێک لەدەولەتی ئەتابەگی کە موسل پایتەختی بوو. ئەوەبوو سالی ٥٢٦ک / ١١٣١ز هەروەکو ئیبن واسل دەیگێرێتەوە یان سالی ٥٢٢ک / ١١٢٨ز بەقسەی (ئەبو شامەی مەقدیسی) (٢٦) عیمادەدین زەنگیی دامەزرێنەری دەولەتی ئەتابەگی موسل، لەشکرێکی ڕێکخست و ڕووی لە هەولێر کرد، هێرشی بردەسەر قەلاتەکەی بەلام پێی نەگیراو دەوری دا (٢٧)، سولتانی سەلجووقی (مەسعوود کوڕی محەمەدی کوڕی مەلیکشا) دوا مەلیکی گەورەی سەلجوقی کە هەوالی گەمارۆدانی هەولێری پێ گەیشت، ئەو دەمە لەمەراغەبوو لە ئازربێجان، بەخۆو سوپاوە هاتە یارمەتیی نوێنەرەکەی خۆی لەقەلاتی هەولێر.

ئەنجا عیمادەدین زەنگی هەستی بەشڵۆقیی كرکردو سەیری كرد ڕاست نییە هەر لەسەر گەمارۆدانەكەی بەردەوام بێت و خۆی تووشی شەڕی سوڵتان بكات، كەدەوڵەتە ساواكەی پێویستی بەو هێزە هەبوو كەنابێ لەگرتنی هەولێر بەختی بكات، چونكە زانی كەزۆر زەحمەتە ئەو قەڵاتە داگیربكرێت، بەهۆی سەختی و قایمی هێزی پارێزگارانی قەڵاتەكەوە.

بۆیە وازی هێناو گەڕایەوە موسڵ، بەڵام لەگەڕانەوەدا سوپاكەی نزیك زێی گەورە دامەزراند تا لەنزیكەوە بزانێ چی ڕوودەدا. پاشان نوێنەرێكی ناردە لای سوڵتانی ناوبراوی سەلجووقی و لەدوایی دا لەسەر ئەوە ڕێك كەوتن كە عیمادەدین زەنگی بێتە ژێر ئاڵای سوڵتان و خۆی بەلایەنگری ئەو بزانێت، پاشان بێتە پێناو لەنێوان موستەرشید بیللای خەلیفەی عەباسی و سوڵتاندا و داوا لەخەلیفە بكات كە دان بەسوڵتان بنێ و لەسەر مینبەرەكانی بەغدا ناوی بخوێندرێتەوە، لەتۆڵەی ئەمە سوڵتان واز لە هەولێر بێنێت و بیدا بە ئەتابەگ عیمادەدین زەنگی، ئەمەش مانای وایە هەولێر بایەخێكی گەورەی هەبووەو پاداشت و نرخی ئەو دەستكەوتە مەعنەوییە گرنگە بووە كە سوڵتان دەستی دەكەوت، ئیدی سوڵتان هەولێری دا بەعیمادەدین، ئەویش دای بەمیر زەینەدەین عەلی كوچوكی سەرلەشكری (٢٨). بارتەقای ئەو دەورەی لە دامەزراندنی میرنشینی موسڵ و پشتگیری كردنی دامەزرێنەرەكەی دا هەیبوو. هەرچۆنێك بێت خۆگرتنی قەڵات لەڕووی داگیركەرە ئەتابەگییەكە ناچاری كرد پەنابەرێتە بەر ڕێبازی دیپلۆماسی دوای ئەوەی بەزۆری هێز هیچی پێ لەگەڵ نەكرا، قایمی قەڵاكەش یەكەمین هۆی ئەم خۆگرییە بوو.

پاش ئەم ڕووداوە هەولێر بوو بەموڵكی زەینەدین عەلی كوچوك، ئەویش خۆی لە موسڵ مایەوەو بەهۆی نوێنەرانی خۆیەوە فەرمانڕەوایی لە هەولێر دەكرد. دوای ئەوە بەنزیكەی چل ساڵ ئەنجا گوێزایەوە هەولێرو لەوێش زۆر نەژیا، پاش چەند مانگێك مردو لەوێش نێژرا. (٢٩) دوای ئەو مزەفەرەدین كوكبری كوڕە گەورەی بوو بەحوكمڕان، پاشان زەینەدین یوسف نیالەتكینی كوڕی دووەمی، جارێكی تریش مزەفەرەدین گەڕایەوە سەركار لەهەلومەرجێكی تایبەتیدا. (٣٠) مزەفەرەدین بەگشتی چل و چوار ساڵ حوكمی گێڕا، لەبەر ئەوەش كە وەجاغ كوێربوو، كوڕی نەبوو جێی بگرێتەوە لەسەردانێكی بەهاتووهاواری بەغدایدا (ساڵی ٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)و بڕیاری دا هەولێر بدا بە موستەنسیر بیللای خەلیفەی عەباسی.

ئەگەرچی ئەم بڕیارە سەری نەگرت، چونكە دووكەس لەلایەنگرانی مزەفەرەدین ناویان خالس و بەرەنقەش بوو دژی دانی هەولێر بەخەلیفە بەرهەڵستیان پیشان داو خۆیان ڕێكخست، لەڕاستیشدا بەرلە وەفاتی كوكبوری بەماوەیەكی كەم دۆستایەتیی نێوان هەولێرو بەغدا ئاڵۆز بوو، (٣١) دووریش نییە كوكبری خۆی بەپیاوانی خۆی ڕاگەیاندبێت كەدژی سوپای خەلیفە بەرگری ڕێك بخەن و نەهێڵن هەولێر بچێتە سەرموڵكی خەلیفە. ئەم دوانە - خالس

و بەرەنقەش - پاش وەفاتی مزەفەرەدین لە ١٨ی رەمەزانی ٦٣٠ک/ حوزەیرانی ١٢٣٣ز نامەیان نووسی بۆ خەلیفەو عیمادەدین زەنگیی (٣٢) زاوای مزەفەرەدین (٣٣) فەرمانڕەوای شەهرەزوور، هەروەها نامەشیان بۆ هەندێ لەمەلیکەکانی بنەماڵەی ئەیوبی ناردو بەهەر یەک لەوانیان گوت: کامیان زووتر بگات هەولێر بۆ ئەو دەبێ. (٣٤) گورج خەلیفە سوپای نارد، بەڵام ئەم دوانە کە هەواڵیان پێ گەیشت هەڵویستی خۆیان گۆڕی و داوایان لەفەرمانڕەوای شارەزوور کرد کەپەلەبکات و پێ رابگات. (٣٥) ئەویش لەبەر هۆیەکی نەزانراو بەدەنگیانەوە نەهات، ئیدی سوپای خەلیفە کەچەند سەرلەشکری گەورەی وەکو ئەرغەشی ناسری رومی و عەلائەدین ئەلدەکزی ناسری هەروەها پێشەنگی لەشکر (عارض الجیش) ظەهیرەدین ئەبو عەلی ئەلحەسەن کوڕی عەبدوڵلا هات، نەیتوانی قەڵا بگرێت. (٣٦) بۆیە سەرلەشکرانی خەلیفە ناچاربوون داوای هیمداد بکەن، ئەوەبوو هێزێکی سەربار بەسەرکردایەتیی (ئەبولفەزایل شەرەفەدین ئیقبال ئەلشەرابی)ی سەرکردەی سوارەی بەغدا لە ١٣ی شەوالی ٦٣٠ک/١٢ی تەمووزی ١٢٣ز گەیشتە هەولێر. (٣٧) بەڵام نەیتوانی قەڵات بگرێ و دەرگا قایمەکانی بکاتەوە. ئەوسا داوایان لەخەلیفە کرد هێزێکی دییان بەهیمداد بگەیەنێ ئەم جارە هێزێکی سوپایی دی بەسەرکردایەتیی میر جەمالەدین قەشتەمەر لەبەغداوە بەرێ خست، کەگەیشت، بۆ گرتنی قەڵا پلانێکی نوێی دانا، هات هێزەکەی خۆی بەسەر دەرگاکانی دابەش کردو خۆیشی بەرامبەر بە دەرگای باکوور کەپێی دەگوترا دەرگای عەمکاوا (یان عەینکاوە وەکو ئەمڕۆ پێی دەڵێن) و گەورەترین دەرگاکانی قەڵاتەکە بوو خیوەتی هەڵداو ژمارەیەکی زۆر لەجەنگاوەرانی لەسەر داناو ئابلوقەدانەکەی توند کردو ئامادەی پەلامارابوو. پاشان وای بەچاک زانی نامە بۆ پارێزەرانی قەڵات بنێرێ، بەڵکو واز لەکوشتار بهێنن و قەڵاتەکە تەسلیم بکەن و رادەیەک بۆ خوێن رشتن دابنێن. جەمالەدین قەشتەمەر دەستی بەهەڕەشەو تۆقاندنیان کردو ئەنجامی خراپی کارەکەیانی پیشان دەدان، ئەودەمە خالس و بەرەنقەش داوایان کرد مۆڵەتیان بدا با لەگەڵ پیاوانی دەسەڵاتدارو سەرکردەکانی میرنشینییەکە وتوووێژ بکەن ... سەرلەشکری عەباسی مۆڵەتی دان ... بەڵام هەر کەماوەکە تەواو بوو دیسان کەوتەوە هەڕەشە لێ کردن و ترساندنیان ئەگەر لەڕووی خەلیفایەتی بوەستن. بەڵام هەڕەشەکانی هەموو بەباچوون. (٣٨)

جەمالەدین قەشتەمەر داوای لەسەربازان کرد بە چڕی هێرش بەرن و شوورەی قەڵاتەکە تیرباران و ئاگرباران بکەن... ئەوسا کوشتاری گەرم دوو رۆژ بەردەوامی کردوو لەهەردوو لادا کوژراوو بریندار زۆر بوو، رۆژی سێیەم هێرشەکە توندترو بەربەرەکانیش توندتربوو، جەمالەدین قەشتەمەر خۆی سەرپەرشتی شەڕەکانی دەکردو فەرمانی دا دەرگای عەینکاوە بسووتێنن (٣٩) پاشان چووە سەر خەندەقەکەی دەوری قەڵات و جەنگاوەرانی هان دەدا، لەو لاشەوە سەرکردەی سوارەی بەغدا شەرەفەدین ئیقبالی شەرابی

ـەر بەرزاییەک وەستابوو و غیرەتی وەبەر ـەربازانی دەدا سەرکەوتن وەدەست بهێنن، ـشان لەشوێنەکەی خۆیەوە چووە لای قەشتەمەر ـ راوێژی لەگەڵ بکات، هەرکە پێک گەیشتن هەواڵی گرتنی قەڵاتی یاخییان بۆ هێنان(٤٠). ـە جۆرە هەولێر هاتە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەی ـغدا.

وەکو لەم گێڕانەوەیەدا دیارە، مێژوونووس ـەریزی باسی ئەوەی کردووە کەلەنێوان خەلیفەو ـەرلەشکرەکانی دا رووی داوە. بەڵام نە ئەوو نە مێژوونووسانی تر باسی جەنگاوەرانی هەولێر ـن قەڵابەندی و قایەکاری قەڵاتەکەیان ـەکردووە کەبەم جۆرە توانیویەتی روو بەرووی چاکترین سەرلەشکرانی دەوڵەتی عەباسی بوەستێ، لەکاتی بووژانەوەی دەوڵەتی عەباسی ـەردەمی خەلیفە موستەنسیر بیللادا.. لەگەڵ ـەوەش دا مانای سەختی و قایمیی قەڵاتەکە دەچەسپێنی.

**قەڵاتی هەولێرو شاڵاوی مەغۆل:**

هەولێر کەزۆرجار تووشی شاڵاوی مەغۆلان هاتووە یەکێک بوو لەو شارانەی کە مەغۆلەکان دوای بەرەڵڵابوونی لافاویان و هێرش بردنە سەر وڵاتانی ئیسلام و نائیسلام چاویان بەوردی تێ بڕی و پەلاماریان داو وێرانکارییان لەناوچەی هەولێر دەست پێ کرد.

مەغۆلەکان دەیان زانی ئەم شارە بەخۆی و بەقەڵا سەختەکەی و جەنگاوەرانی بەجەرگییەوە زۆر گرنگە. بۆیە چەند هەڵمەتێکیان ناردە سەر هەروەکو بیانەوێ سەرەتا باری شارەکەو هۆیەکانی بێ هێزیی خۆی و بنکە ئیسلامییەکانی تر بزانن، بۆ ئەوەی لەدەست وەشانی دوارۆژیان دا زۆر زەحمەت نەبینن، هەولێریش وەکو لەمەولا دەوکەوت - یەکێک بوو لەو بنکە کەمانەی بە ئازایەتییەکی کەم وێنە بەریان لەپەلامارانی سوپای مەغۆل گرت(٤١).

هەروەکو گوتمان، مایەی سەرکەوتنی بەربەرەکانێی مەغۆلەکان بەئاسان دەست نەکەوتنی هەولێر چەند هۆیەکە. کەوا قەڵابەندی و قایمی قەڵاتەکە لەپێشەوەی ئەو هۆیانە دێت. لەم بارەیەوە جوگرافیازانی ناسراو «قەزوینی» کەلەسەدەی حەوتەمی کۆچی / سێزدەی زاییندا ژیاوە دەڵێ: قەڵاتی هەولێر بەجۆرێک قایم بوو کە تەتەرەکان نەیانتوانی بیگرن ئەگەرچی چ قوللەو قەڵاتێک لەدەستیان رزگاری نەدەبوو.(٤٢).

(باکۆیی)ش (٤٣) هەروا دەڵێ، هەرچی (ئەنساریی دیمەشقی) یە کەباسی قەڵات دەکا دەڵێ قەڵایەکی مەزنە (٤٤).

(شەمسەدین سامی)ش گوتوویەتی: «ئێجگار کۆن و پتەوە» (٤٥).

لەوانەیە چاکترین باسی قەڵاتەکە ئەوەبێت کە دیارترین مێژوونووسانی چەرخی مەغۆلی (رشیدەدین فەزاوڵڵا کەلە ٧١٨ک/١٣١٨ز مردووە) لەکتێبە گەورەکەی دا «جامع التواریخ» گوتوویەتی: قەڵاتی هەولێر لەناو قەڵاتاندا تاکەو لەدنیادا هاوتای نییە (٤٦). ئەگەرچی شێوەی قسەکەی زێدەڕۆیی پێوەدیارە، چونکە لەدنیادا زۆر قەڵاتی تر کەلەقەڵاتەکەی هەولێر پتەوو گەورەتر بوون باڵەو کۆنتریش نەبووبن نەیانتوانی لەبەردەم مەغۆلەکاندا خۆبگرن.

لەوانەیە ئەم مێژوونووسە بۆیە ئەو قسەیەی كردبێت تا ئەوە بڵێ كە تاكە قەڵاتێكی سەختی بێ هاوتای لەهەموو دنیای ئەو سەردەمەدا وەكو قەڵای هەولێر نەیتوانی خۆی بگرێت، لەوە بزانە شاڵاوی مەغۆل چەند بە تاوو بەهێز بووەو چۆن لەتواناادا نەبووە (یان بێ كەڵك) بووە بەرامبەری بوەستن. ماوەیەكی زۆری پێ نەچوو تابەرگریی قەڵات پارێزان كزبوو و نەیانتوانی هەتاسەر خۆبگرن، دوژمنی وێرانكەر لەپەلاماری ساڵی ٦٣٤ك/ ١٢٣٧زدا توانی بیانبەزێنێ و شمشێر لەخەڵكی ناو قەڵات بخاتە كار. ئەوەندە كارەساتی دڕندانەیان بەسەر خەڵكەكە هێنا كە مێژوونووسانی چەرخەكە بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە سەرەڕای ڕای جیاوازییان دەربارەی ئەم كارەساتە گەورەیە هەموویان بێزاری دەربڕن.

ئەو مەرگەسات وماڵوێرانییەی بەسەر ئەو شارەیان هێنا بەڵگەی قین و دڵڕەشی یانە بەرامبەر ئەو شارەی كەڕۆڵەكانی پشت بەقەڵا قایمەكەیان ئازایانە سنگیان دایە بەر شاڵاوی وێرانكەری ئەو تاقمەی كەوەكو گەردەلوولێكی لێك نەترازاو لەبیابانەكانی ئاسیای ڕۆژهەڵاتەوە هەڵی كردو ڕاگرتنی بۆ نەبوو.. بەڵێ شەڕیان كردو خۆیان قایم كرد، بەڵام لەدواییدا شكان.

زۆربەی مێژوونووسانیش لەسەر ئەوە ڕێكن كە كەمیی ئاو كارێكی گەورەی كردەسەر ورەبەردانیان.

ئەوەی ئیبن ئەلجەوزیی مێژوونووس كە ئاگاداری كارەساتەكەبوو(لە ٦٥٤ك/١٢٥٦ز مردووە) دەڵێ: ئەوسا سوارەو پیادەی مەغۆل لەهەمــوو لایەكــەوە دەوری هەولێــریان داو مەنجەنیقیان لێ دابەست، شوورەكەیان كون كردو بەتۆبزی لێی بەژووركەوتن و هەرچی تێ دابوو كوشتیان! كچانیان ئەتك كرد، پارەو سامانیان تالان كــرد. خــەڵكەكــە ژێر زەمین و كــەندڕو كــۆلانیــان لە قــەڵا هەڵكەند، بەڵام ئاویان هاتە كەمی و هەندێكیان لەتینووان خنكان(٤٧).

ئیبن ئەلعیبری كە ساڵی ٦٨٥ك/١٢٨٦ز مردووە نوسویەتی مەغۆلەكان كشانە ناو شار، خــەڵكی شــار بەڕووتی (**) هەڵاتنە ناو قەڵات، مەغۆلەكان ماڵەكانیان داگیركردو تالانیان كردن و زۆربەی خانووەكانیان سووتاند، گــەمــارۆدانەكــەش نزیكەی چل ڕۆژی خــایاند (٤٨). عــەبدولحــەمــیــد كــوڕی ئەبولحــەدیدی نووســەری گــەوره كــەســاڵی ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز مردووەو ئاگاداری ئەم ڕووداوانەبووەو لەساڵی داگیركردنی بەغدادا مردووە، دەڵێ ئەو مەغۆلانە كــەزۆرجــار هەولیــان دا هەولێــر بگرن، دواجــار لەذیلقەعدەی ساڵی ٦٣٤ك بەسی هەزار سوار بەسەركردایەتی (بەجەكتای)كە(جەرماغون)ی سەرلەشكر ناردبوونی هێرشیان هێنایە سەر هەولێرو شەڕێكی گەورە لەنێوان هەردوولادا ڕووی داو خەڵكێكی زۆر كوژرا، بەڵام توانییان بچنە ناو شارەكەو خەڵكەكە ناچار ڕایان كردە ناو قــەڵاتەكــەیان و خــۆیان لێ عــاسی كــرد. مەغۆلەكان ماوەیەكی زۆر دەوری قەڵاتیان دا هەتا خەڵكێكی زۆر لەتوینا خنكان، ئەوسا میر ئەبو مــزەفــەر شــەمــســەدین باتكین كــوڕی عەبدوڵلای ڕۆمی كەوالیی خەلیفەی عەباسی

ـوو لەسەر هەولێر ناچار بوو ئاشتیانەو ـامانێکی زۆر ڕازییان بکات (٤٩) تاکو ـدیەک بۆ ئەم قەسابخانەیە دابنێت. ئەم ـێژوونووسە پاشان دەڵێ: کاتێ کە باتکین ـەکەی بۆ ناردن، پارەکەیان وەرگرت و ـانیان نەدا(٥٠)، ئەوجا پەلاماری قەلاتیان ـو پەیتا پەیتا بەهەموو هێزێکەوە بۆی ـەندەکشان و لەزۆر لاوە مەنجەنیقیان تێ ـگرت. پاش ئەوەی خەڵکێکی زۆریان کوشت، ـەکەیان کاول کردو وەکو کەلاکی کەر بەجێ ـێ هێشت (٥١).

نووسەری کتێبی «الحوادث الجامعه»بەدوورو درێژی باسی ئەو کەتن و کارەساتە جەرگبڕانەی کردووە کە مەغۆلەکان کردوویانە، دەگێڕێتەوە کە دانیشتوانی قەلات ئاویان لێ بڕاو بەهەزاران کەس لەتینوێتی خنکان، نەشیان دەتوانی بیان نێژن چونکە زەویی ناو قەلات بەشی نەدەکرد، نەشیان دەتوانی فڕێیان دەنە ئەودیوی شوورەکان نەوەکو خەندەقەکە پڕببێتەوە، ئیتر لاشەکانیان سووتاند، مەغۆلەکانیش تا توانییان لەتالان و دیلی و کاول کردن و سووتاندن درێغیان نەکرد، پاشان خۆیان.بۆ گرتنی قەلاتەکە ئامادەکردو مەنجەنیقیان لێ ئاگردا(٥٢).

سەرباری ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەش، هەولێر هەر بەدەست خەلیفەوە مایەوەو والی بۆ دادەنان، دوا والی میر (ئیبن ئەلسەلایا ئەلساحب تاجەدین ئەبولمەعالی محەمەد کوڕی نەسر کوڕی یەحیای شەریفی عەلەوی هاشمی) بوو کە بەپیاوێکی ژیرو بەڕووەت و جوامێر ناسراوبوو(٥٣). ئەم میرە دەیزانی وڵات و ناوچەکە بەقۆناغێکی ناسکدا تێ دەپەڕێت و ڕووبەڕوو وەستانی مەغۆلەکان زۆر زەحمەتە، بۆیە هەوڵی دا بەرەنگارییان نەکات، دەشیزانی خەلیفە توانای چ بەرهەڵستییەکی دژ بەوانی نییە، هەرچەند خەلیفەی لەم لایەنە ورياکردەوە هیچ سوودی نەبوو. (٥٤) بۆیە هەڵوێستی ئیبن ئەلسەلایا بێ هێز بوو، دەبوو نرخەکەی بەزۆر لەسەر بکەوێ، یان لەگەڵ مەغۆلەکاندا بکەوێتە شەڕێکی دۆڕاوەوە یان لەگەڵیان ڕێک بکەوێت و هەولێریان بداتێ.

ڕەشیدەدین فەسلوڵلا لەباسی ڕووداوەکانی ساڵی ٦٥٦ک/١٢٥٨زدا بەسەرناوی (کەوتنی شاری هەولێر بەدەستی ئەرقیونویان و ئابلوقەدانی قەلاتەکەی) دەڵێ: لەو کاتەدا کە هۆلاکۆ ویستی بەغدا بگرێت، ئەرقیونانی سەرلەشکری ڕاسپارد قەلا قایەکەی هەولێر بگرێت، جاکەوتە دەوردانی دلێرانی قەلات و شەڕ قەوما، بەڵام فەرمانڕەوای هەولێر - ئیبن سەلایا - ورەی بەرداو چووە لای ئەرقیونویان تا مل کەچیی خۆی پێ ڕابگەیەنێ هەچەند جەنگاوەرانی قەلا پارێز ڕایان لەگەڵ نەدا پێی گوت: هەرچی دەیانەوێ ئامادەیە پێشکەشی بکات، بەڵام سەرکردەی مەغۆل قایل نەبوو پێی گوت: بەڵگەی ڕاستیی مل کەچی تەسلیم کردنی قەلاتە عاسێیەکەیە! ئیبن سەلایا گەڕایەوە قەلات بەڵکو خواستی مەغۆلەکان بەجێ بهێنێ، بەڵام جەنگاوەرانی کوردکە لەدەرگای قەلات کۆبوونەوە لێ نەگەڕان بێتەوە ناو قەلات، ئەوساکە نەیتوانی بۆ تەسلیم بوون و بێ سوودیی بەربەرکانێی مەغۆل قانعیان

بکات، بەبێ هیوا گەڕایەوە دواوە، سەری بۆ ئەرقیونویان شۆڕکرد، ئەویش ناردییە لای هۆلاکۆ تا ئەنجامی بڕیاربدات. کە هاتە لای گرتی پاشان فەرمانی دا بیکوژن. (٥٥) لەوانەیە بۆیە کوشتبێتی چونکە چەند جارێ هەولّی دابوو لەروویان بوەستێ و خەلیفەی هان دەدا بکەوێتە خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوە یان، هەر نەیتوانی بەسەر قەلاپارێزاندا سەربکەوێ، بۆیە ناچاربوو داوای یارمەتی و راوێژکاری لەبەدرەدین لوئلوئی میری موسڵ بکات، کە ببووە پیاوی مەغۆلان، ئەویش ژمارەیەک سەربازی بۆ ناردن تا بەرگریی قەلات تێک بشکێنێ بەلام هیچان بۆ نەکرا، بەلکو لەناکاو دەستیان لێ وەشاندن، هەروەکوو مێژوونووسی ناوبراو باس دەکات شەو لە ناکاو جەنگاوەران لە قەلات دەرچوون، بێ ئەوەی سوپای دوژمن بەخۆی بزانێ، لەناکاو پەلارماریان دان و هەرچی بەردەستیان کەوت کوشتیان و مەنجەنقیەکانیان سووتاندو گەڕانەوە جێی خۆیان.

پاش ئەوەی (ئەرقیونویان) بەئامانج نەگەیشت، داوای هاتنی بەدرەدین لوئلوئی موسڵی کرد تا دەربارەی ئەو قەلاتەی کە بۆتە کۆسپی رێی پێشەوەچوونی خێرایان تەگبیرێک بکەن، چونکە کوردەکان بەهاوین لەگەرمان قەلات بەجێ دێلن دەچنە چیا! بەلام ئێستا هەواکەی خۆشەو ئازووقەیان زۆرەو قەلاتەکەی تابلّیی قایە، بەفێڵ و تەگبیر نەبێت ناگیرێت. دواشت ئەرقیونویان قەلاتەکەی دا بە بەدرەدین لوئلوء ئەویش توانی شوورەکانی شار برووخێنێ پاشان قەلاتەکەو هەولێر کەوتنە دەست فەرمانڕەوای موسڵ. (٥٧) لێرەدا باپرسیارێک دەربارەی ئەو رایە تاقانەی ئەم نووسەرە بکەین و بلّێین چۆن دەبێ قەلات پارێزان کوردی کۆچەر یان ئەو چیانشینانە بن کە بەرگەی گەرما نەگرن و هەر هاوین بێت شارچۆڵ بکەن؟ لامان وایە مەنتیق لەوەدانییە چارەنووسی شار هەر شارێک بێت، بخرێتە ئەستۆی کۆمەلێک کە بەپێی ئارەزوو شەڕبکات وەرزێک بچێتە مەیدان و وەرزێکیش شەڕ ڕاگرێت؟

ئەگەر ئەم قسەیە راست بێت دەبوو هەر سوپایەک بیەوێ قەلاتی هەولێر بگرێت با بەهاوین بێت تاکو رەشیدەدین فەزلوڵلا بەتەنیا ئەم قسەیە دەکات.. کارێکی لەم جۆرە رووی نەداوە. پاش ئەوەی بەیارمەتی و بە راوێژکاریی بەدرەدین لوئلوء قەلاتەکە کەوتە دەست مەغۆلان، بەدرەدین بە حەفتا هەزار دینار لێی کڕینەوە بەهۆی نوێنەر و کاربەدەستانەوە بەسەری دا رادەگەیشت. بەلام شەرەفەدین جەلالی کە میرێکی کورد بوو توانی بە رازەمەندیی مەغۆلان هەولێر لەدەست کاربەدەستانی بەدرەدین دەربهێنێ. هەمووی وەدەرنان، ئەمەش کاتێک بوو کەشەرەفەدین جەلالی دابوویە پاڵ مەغۆلان هەرچی بەدرەدینە وازی نەهێنا هەندێ پیاوی خۆی نارد تاکو ئەم میرە کوردە لەناوببەن، ئەوەبوو بەپیلانێک گەیشتنە ناو تاولەکەی و لە خەودا کوشتیان هەروەکو مێژوونووسێکی دی باسی دەکات کەخۆی لەنزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بووە (٥٨).

وابزانین لێرەدا پێویست بەوە ناکات لەو

قۆناغانە بدوێین کە شارەکە دوای ئەم سەردەمە پێیدا تێپەڕیەوە کە مێژوونووسە تازەکان بە«سەردەمی تاریک» -الفترة المظلمة- ناوی دەبەن چونکە لەجێیەکی تردا باسی ئەوەمان کردووە (٥٩).

ئەوەی ئێمە لێرەدا لامان گرنگە، باسی قایمکاریی قەلاتی هەولێرو ئەو ڕۆڵەی لەمێژووی هەولێردا گێراویەتی چۆن پتەویی قەلاتەکە چەرخاوچەرخ داگیرکەرانی تووشی نارەحەتی کردووە، هەروەها باسی سەختی و دەزگا بەرگری یەکانی و دۆزینەوەی ئەو شتانەی کە بشێت لەگەڵ قەلاتی حەلەبدا بەراوردی پێبکەین.

لەم ڕووەوە عەبدوڵلای کوڕی فەتحوڵلای ناسراو بە ئەلغەیاثیی مێژوونووس(٦٠) کە یەکێکە لە دیارترین ئەو کەسانەی بە زمانی عەرەبی ڕووداوەکانی ئەو«ماوە»یەی نووسیوە، باسی ئەو هێرشانەی کردووە کە براوەتە سەر شارەکەو ڕەنگ بێ بەناوبانگترینیان(تەیمووری لەنگ) بێت، بەڵام باسی گرنگیی قەلاتەکەو چۆنیەتی وێرانکاریی ئەم هێرشە دووبارە لە بیابانەکانی ئاسیاوە هاتوو ناکات، تەنیا لەناو ڕووداوەکانی ساڵی ٧٩٦/١٣٩٧ز دا باسی ئەوەی کردووە کە فەرمانڕەوای هەولێر- شێخ عەلی ئەویرات- توانی بەر لە هێرشەکە بگرێت ئەویش بەسەر بۆدانەواندن و چوونە ژێر ئاڵای تەیموور (٦١).

لەماوەی حوکمڕانی دەوڵەتی (قەرەقۆیونلو- بەرخ ڕەشاندا- کە لە ساڵی ٨١٤هوە تا ٧٨٤ کۆچی واتا(١٤١١- ١٤٧٠ز) درێژە کێشا، مێژوونووسی ناوبراو باس دەکا کە سوڵتان ئەسپان کوڕی قەرەیوسف ساڵی ٨٣٩ک/ ١٤٣٥ز هەوڵی دا هەولێر بگرێت، فەرمانڕەوای شار(میرزا عەلی) کە ئەمەی بەرگوێ کەوت فەرمانی بەسەربازانی خۆی دا سیاسەتی وێران کردنی هەموو ئەو شتانەی دوژمن سوودی لێ دەبینێ بەکاربهێنن و پارەوسامان لە قەلات بشارنەوە« کە ئەسپان گەیشتە شار دیتی کاول بووە، کەوتە گەمارۆدانی قەلاتەکە»(٦٢).

گەمارۆدانەکە تا ساڵی دواتر بەردەوام بووە(غیاثی) ی مێژوونووس دەڵێ لەو ماوەیەدا زۆر جار شەڕ دەقەوما لە نێوان سوڵتانی تورکمان و قەلات پارێزان دا، پاش ئەوەی سوڵتان نەیتوانی بەرگریی قەلاتەکە بشکێنێ، کەوتە داونانەوەو فروفێڵ کردن، ئەوەبوو چەند پیاوێکی خۆی ناردە قەلات داوای لێ کردن کەوا پێشان بدەن وازیان لە سوڵتان هێناوەو ئامادەن بێنەریزی جەنکاوەرانی قەلات و شەڕ دژی بکەن، و توانییان کاربەدەستانی قەلات لە خشتە بەرن و تەواو دڵنیایان بکەن. توومەزانە سوڵتان هەندێ ژەهری کوشندەی پێ دا ناردبوون کە لە بیرەکانی ناو قەلاتی بهاون، تا جەنگاوەران بە تایبەتی میرزا عەلی فەرمانڕەوای هەولێر ژەهر خواردوو بن. بەڵام توانییان ژەهرەکە لە چەند بیرێک بهاون و بۆیە ژمارەیەکی زۆر مردن، پێستیان شین هەڵگەڕاو دەمیان بۆگەنی بوو هەروەکو(غیاثی) دەڵێ ئابڵوقەدانەکەی ساڵێک و چەند مانگێک درێژەی کێشا، پاشان میرزا عەلی ناچار بوو داوای ئەمان لە سوڵتان بکات، ئەویش بەڵێنی

ئاشتیی دایە و سوێندی بۆ خوارد كە نایكوژێت، ئەوسا هەولێری كەوتەدەست ، ئەمەش بەهۆی كزبوونی هێزی بەرگریی جەنگاوەران بوو نەك بەهۆی شكانی قەڵاتەكە ، لەوانەیە گرنگترین هۆیەكانی نەمانی بەربەرەكانیش، ژەهراوی كردنی هەندێ بیری قەڵات و تەواوبوونی ئازووقەی خەڵكی گەمارۆدراوی ناو قەڵاتەكە بووبێت. گرنگ ئەوەیە كە ئەم رووداوە بەناوبانگە لە مێژووی هەولێردا جارێكی تریش بە روونی چەسپاندی كە قەڵاتەكە چەند قایمە و توانای خۆگرتنی هەیە لەبەرامبەر گەمارۆدان دا. دواجار میرزا عەلی خۆی و خێزانەكەی لە قەڵات هاتنە خوارێ و خۆی دا بەدەست سوڵتانەوە، پاشان رازی بوو كە بەلقیسی كچی شوو بە سوڵتان بكات(٦٣).

پێش ئەوەی باسی رۆڵی گەورەیی قەڵات لە بریاردانی چارەنووسی هەولێر لە مێژوودا كۆتا پێ بهێنین، وا چاكە لەوە بدوێین كە سەرچاوەكان دەربارەی ئەو رۆڵە لە ماوەی حوكمی عوسمانیداو لەكاتی ململانێی دوورودرێژی دا لەگەڵ فارسەكان باسیان كردووە. ئەوەبوو قەڵاتەكە ساڵی ١٧٣٢ ز توانی لەبەردەم هێرشی نادرشادا (١٦٨٨-١٧٤ز) نەبەزانە بەربەرەكانی بكات. ئەمەش دواسەردەمی ناخۆشیی هەولێر بوو هەروەكو م. سترك(٦٤) دەڵێ و دوا رووداوی بەناوبانگی شارەكەش بوو.

میرزا مەهدیی مێژوونووسی هاودەمی هێرشەكە دەڵێ، نادرشا دەیزانی لەم هەڵمەتەدا تووشی زۆر گیرو گرفت دەبێت بۆیە فەرمانی لێبوردنی بۆ هەموو ئەو كەسانە دەركرد كە لەرووی ناوەستن! پاشان بەرهەڵستكارانی خەڵات كرد بۆ دڵكێش كردنیان، بەڵام ئەم كردەوەیە لەهەولێر دادی نەدا چونكە قەڵاتەكە خۆی بەدەستەوە نەدا. كاتێك كە دیتی قەڵاتەكە ئامادەیە بەرگری بكات سەرەڕای تەسلیم بوونی هەندێ لە میرەكانی، سوپایەكی نارده سەر بەخۆو بە تۆپی گەورەوە هەروەكو ئەم مێژوونووسە باس دەكا(٦٥).

ئیتر قەڵاتی ئاگرباران كردو ماوەی دوو مانگ شووره سەختەكانی كوتایەوە، تا لەئەنجام دا شورەكەی چەند كەلێنێكی تێ كەوت و بەرگریی قەڵات دوایی هات. دوژمنی داگیركەر چوونە ناو قەڵاو شارە ئازاكە.

## كۆتایی

بەم جۆرە مێژوو گەلێ چیرۆكی خۆگریی هەولێرمان بۆ دەگێڕێتەوە كە رەنگدانەوەی خۆگریی قەڵاتەكەیە . ئەمەش وا دەگەیەنێت كە بوونی قەڵاتێكی قایمی وا لەو ناوچەیەدا كاریگەریی لە نەخشەكێشانی وێنەی رووداوەكانی ناوچەكەدا هەبووە. بەڵام لێكۆڵەرەوە دوای ئەوەی دەنگوباسەكانی قەڵات بە گردی سەیر دەكات ئەم مەسەلە گرنگانە سەرنجی رادەكێشن.

یەكەم: سەرچاوەكان لە نزیكەی چوار سەدەو نیوی مێژووی ئیسلامی قەڵات یان شاری هەولێر بێ دەنگن، بۆیە مێژووی ئەم ماوەیە نەزانراوە.

دووەم: رووداوە بەرودواكان لە سەردەمی

ئەتابەگییەوە کە دوای سەردەمی سەلجووقی دەستی پێ کرد، سەلماندوویانە کە قەلاتەکە شوورەی پتەوو بەرگریی بەهێز بووە، بۆیە داگیرکردنی کارێکی ئێجگار سەخت بووە تەنانەت بەلای سەرکردەو سولتان و مەلیکە گەورەکانیشەوە.

سێیەم: شتێک لە پێداویستییەکانی بەرگری. یان بەشێک لە شوورەکەی نەماوەتەوە تا بنی بەبەلگەی پتەوی قەلاتەکە، لەناو قەلاتیش دا شوێنەواریکی ئەو سەردەمانە نەماوەتەوە بە پێچەوانەی قەلاتی حەلەب. جا ئەگەر ئەو چەند هەوالە نەبوایە کە بەپەرت و بلاوی لە هەندێ کتێبان دا نووسراون شتێکمان دەربارەی قەلاتەکە نەدەزانی تەنیا ئەوەندە نەبێت کە مالی مالەگەورەو خەلکی دی هۆی ئەوەشمان لە ناواخنی باسەکەدا شی کردوەتەوە.

پەراوێز:

**«ناوەکان هەر بەرێنوسی بنەرەتی عەرەبی یەکە دەنووسین»**

(١) یاقوت الحموی. معجم البلدان،١/١٣٨.

(٢) ابن خلکان، وفیات الاعیان،٦/١٢٨.

ابن العماد، شذرات الذهب،٥/١٢١.

(٣) ابن المستوفی،نباهه البلد الحامل(تاریخ اربل) ج٢ ق١ ص٣١٩.

(٤) ابن المشعار، مخطوط.عقود الجمان) ج٩ ور قپ ١٧٠.

(٥) ابن خلکان، وفیات الاعیان ٦/١٢٨.

(٦) یاقوت الحموی، معجم البلدان،١/١٣٨.

(٧)پەراوێزەکانی(٣.٤.٥)ی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٨) معجم البلدان، هەمان لاپەڕە.

(٩) معجم البلدان، مادەی(حەلەب) /٢٨٤.

(١٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٥- ٢٨٦.

(١١) ابو القاسم بن عبدالله الخراسانی (لە دەوروبەری سالی ٣٠٠ی کۆچی دا مردووە) کتێبەکەی (المسالک والممالک) ل٦.

(١٢) ابو الفرج قدامه بن جعفر الکاتب(لە دەوروبەری ٣٣٠ ک مردووە، کتێبەکەی(الخراج و صنعه الکتابه)ل ٢٣٥.

(١٣) ابو اسحق ابراهیم محمد الکرخی الاصطخری (٤٣٢ک مردووە).

(١٤) ابو القاسم محمد بن حوقل النصیبی (٣٦٧ک مردووە) کتێبەکەی (صوره الارض).

(١٥) المقدسی (٣٨٧ک مردووە) کتێبەکەی (احسن التقاسیم فی معرفه الاقالیم، ل١٣٦.

(١٦) کاتی ئامادەکردنی نامەی دکتۆرا سەردانێکی قەلای حەلەبم کرد بۆ دیتنی دەزگا سوپاییە مێژووییەکانی شام و بۆ بەراورد کردنی ئەو قەلا گرنگە لەگەل قەلاتی هەولێر لە پاشەرۆژدا.

(١٧) ابن شداد، الاعلاق الخطیره، ج٢ ق١ ص٢٥.

(١٨) ابن العدیم، زبده الحلب، ٣/١٦٦.

(١٩) ابن الشحنه، الدر المنتخب، ص٣٤.

(٢٠) بروانە، د. محمود احمد، الایوبیون فی شمال الشام. والجزیره، ل٣٩٨، لاپەرە ٤٢٦ کە لە (هەرسفلید) و(سوفاجیه)ی وەرگرتووە.

(٢١) معجم البلدان، ١٣٨/١.

(٢٢) نیپور، رحله الی العراق، لاپەڕە ٩٠.

(٢٣) ئێستاش گەڕەکێک هەیە لەقەڵات پێی دەگوترێ گەڕەکی (سەرای) کە نزیک دەرگای باشوورە.

(٢٤) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ١٧٠/٣.

(٢٥) الحوادث الجامعه، لاپەڕە ٤٦.

* بڕوانە: کتێبی ابن المستوفی، تاریخ اربیل بەشی یەکەم، ژێننامەی (٤١) لاپەڕە (١١٥).

(٢٦) ابو شامه، الروضتین ٣٠/١.

(٢٧) ابن واصل، مفرج الکروب ٩٧/١.

(٢٨) هەر ئەو سەرچاوەو لاپەڕەیە.

(٢٩) وفیات الاعیان ٢٧/٣.

ابن الاثیر، الکامل: ٣٣١/١١، الباهر: ١٣٥. سبط ابن الجوزی، مراه الزمان ٢٧٣/٨.

هەروەها بڕوانە وتارێکی من (مدفن السلطان مظفرالدین کوکبری بین الحقیقه والوهم) گۆڤاری (کاروان-المسیره) ژمارە (١).

(٣٠) پێویست بەوە ناکات لێرە باسی بکەین، چونکە دوورو درێژ لە کتێبی (اربیل فی العهد الاتابکی) لاپەڕە ٦٥-٦٧، ٨٨-٨٩داباسمان کردووە.هەروەها بڕوانە: وتارێکی من (مظفرالدین کوکبری حین طرد من اربیل) مجله المجع العلمی العراقی/ الهیئه الکردیه، الجلد السابع لسنه ١٩٨٠.

(٣١) پێوەندیی نێوان بەغداو هەولێر (لە سەردەمی کوکبری دا ) ماوەیەکی زۆر کرژو ئاڵۆز بوو، پاشان خۆش بۆوە بەڵام سەرلەنوێ دوای ساڵێک لەسەردانی بەغدای دا ساڵی ٦٢٨ک/ ١٢٣٠ز تێک چووە، بڕوانە: کتێبی ئێمە (اربیل فی العهد الاتابکی) لاپەڕە ١٦٤-١٦٥.

(٣٢) ئەمە ئەو عیمادەدین زەنگییەی دامەزرێنەری ئەتابەگیی موسڵ نییە، بەڵکو ئەمە کوڕی ئەتابەگ نورەدین ئەرسەلان شای یەک لەنەوەکانی دامەزرێنەرە ناوبراوەکەیە.

(٣٣) موزەفەرەدین کۆکبوری دوو کچی لەو ژنەی کە خوشکی سەلاحەدینی ئەیوبی و رەبیعە خاتوونی ناو بوودا بە هەر دوو کوڕی نورەدین ئەرسەلان شا، واتا عیزەدین مەسعوودی دووەم و عیمادەدین زەنگی باسکراو.

(٣٤) الحوادث الجامعه، ل: ٤٥.

(٣٥) الذهبی، دەستخەت (تاریخ الاسلام) ق ٢ لاپەڕە ١٨٠.

(٣٦) ابن العبری ، تاریخ الدول السریانی، مجله المشرق. مجلد ٤٩لاپەڕە (٧٣٩).

(٣٧) الحوادث الجامعه، ل ٤٥.

(٣٨) هەر ئەو سەرچاوە، ل ٤٦.

(٣٩) ابن العبری، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٤٠) الحوادث الجامعه، ل٤٧. هەروەها بڕوانە: (الغسانی: العسجد المسبوک)، ل ٣٣١.

(٤١) بڕوانە: د. جعفر حسین خصباک، العراق فی عهد المغول الایلخانیین ل٥٧، ٦٠.

(٤٢) القزوینی، اثار البلاد، ل ٢٩٠.

(٤٣) الباکوی، تلخیص الاثار، ل ٣٥.

(٤٤) شیخ الربوه الدیمشقی، نخبه الدهر، ل ١٩٠.

٤٥) قاموس الاعلام، تركی، مجلد ٢ ، ل ٨٠.

٤٦) جامع التواریخ، مجلد ٢، ج ١، لاپەڕە (٢٩٨).

٤٧) سبط ابن الجوزی، مرآه الزمان، ٦٩٩ هەر بڕوانە: الذهبی، العبر، ١٣٦/٥. ابن تغری بردی، النجوم الزاهره، ٢٩٦.

* لەوانەیە مەبەستی ئەوەبێ بڵێ چەک و ... رۆقەیان پێ نەبووە

٤٨) ابن العبری ، تاریخ الدول السریانی، مجله المشرق) المجلد ٤٩، ص ٧٤٣. ابن العبری، تاریخ مختصر الدول، ص ٢٥٠.

٤٩) ابن ابی الحدید شرح نهج البلاغه ٨١.

٥٠) پاش ئەم رووداوە کە مەغۆلەکان هەولێر دەرچوون، میر (باتکین) یش شاری ... جێ هێشت و لەبەغدا دانیشت و وازی ... سیاسەت هێنا هەتا لەساڵی ٦٤٠ک/ ١٢٤٢ز مرد. ابن خلكان، وفیات الاعیان، ١٧٢.

هەر بەم جۆرە وەزیرو مستەوفی و ... مێژوونووسی بەناوبانگی هەولێر (ابن ... مستوفی)ش لە هەولێر و دەرچوو لە ... سەرخواستی بەدرەدین لوئلوء لەموسڵ دانیشت، هەتا لەساڵی ٦٣١ک ١٢٣٤ز دا لەوێ مرد.

(٥١) ابن ابی الحدید، شرح نهج البلاغه، هەمان لاپەڕە.

(٥٢) الحوادث الجامعه، ل٩٩.

دەربارەی ئەم رووداوە بڕوانە (ابو شامه، الذیل علی الروضتین، ل ١٦٥) و المقریزی، السلوک: ج١ق١، ص٢٥٥.

(٥٣) الذهبی، العبر، ٢٣٦/٥.

(٥٤) الیونینی، ذیل مراه الزمان، ج١ص٨٧.

ابن تغری بردی، النجوم الزاهره، ج٧ص٤٨.

(٥٥) رشید الدین، جامع التواریخ، مجلد ٢ص ٢٩٨.

(٥٦) الیونینی، سەرچاوی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٥٧) رشید الدین، جامع التواریخ، ل٢٩٩.

(٥٨) ابن العبری، تاریخ الدول السریانی، المجلد ٥٠ل ١٣٤.

(٥٩) بڕوانە: وتارێکی ئێمە (لمحه من تاریخ اربیل) گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە ٢٦/٢٥ ساڵی ١٩٧٥، ل ١٢-٢٠.

(٦٠) د. طارق نافع الحمدانی ئەم کتێبەی ساغ کردۆتەوەو پلەی ماجستێری پێ وەرگرتووە لەزانکۆی بەغدا. کتێبەکەش لەچاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٧٥ چاپ کراوە.

(٦١) التاریخ الغیاثی، ل ١٨٩.

(٦٢)هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٢٦٨.

(٦٣) هـ.س. ل ٢٦٩.

(٦٤) م. سترک، دائره المعارف الاسلامیه/ ماده اربل، ج١ ص ٥٧٠.

(٦٥) میرزا علی خان استرابادی، جهانگشای نادری، ل ٣٨٥.

## سەرچاوەکان

(١)ابن ابی الحدید، عبدالحمید بن هبه الله المدائنی (لە ٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز مردووە)، شرح

نهج البلاغه. ط. دار مكتبه الحياه. بيروت، ١٩٦٣.

(٢) ابن الاثير، ابو الحسن عزالدين على بن ابى الكرم محمد الجزرى الشيبانى (له ٦٣٠ک/ ١٢٣٣ز مردووه)، التاريخ الباهر فى الدوله بالموصل. تحقيق د. عبدالقادر احمد طليمات. ط. دار الكتب الحديث. القاهره ١٩٦٣.

(٣) ابن الأثير (هەر ئەو نووسەری پێشوو) . الكامل فى التاريخ. ط..دار صادر- داربيروت. لبنان ١٩٦٦.

(٤) ابن تغرى بردى ، ابو المحاسن جمال الدين يوسف الاتابكى (له ٨٧٤ک/ ١٤٦٩ز مردووه).

النجوم الزاهره فى ملوک مصر و القاهره.ط. دار الكتب المصريه. القاهره.

(٥) ابن جعفر، ابو الفرج قدامه الكاتب البغدادى (پاش ساڵی ٣٢٠ک/ ٩٣٢ز مردووه).

نبذه من كتاب (الخراج و صنعه الكتابه، ط/ بريل ١٨٨٩ز)

(٦) (ابن) خرداذبه، ابو القاسم عبدالله الخراسانى (له ٢٨٠ک/ ٨٩٧زمردووه). المسالک واعمالک ط ابريل ١٨٨٩.

(٧) ابن خلكان، شمس الدين احمد بن محمد الربلى (له ٦٨١ک/١٢٨٢ز مردووه). وفيات الاعيان و انباء ابناء الزمان. مطبعه السعاده. القاهره ١٩٤٨. (جارو باريش) چاپی بيروت. ساغ كردنەوەی د. احسان عباس.

دار الثقافه- مان بەكارهێناوە.

(٨) ابن الشحنه، ابو الفضل محب الدين الحلبى (له ٨٨٤ک/١٤٦٨ز مردووه).

الدر المنتخب فى تاريخ مملكه حلب، تحقيق يوسف بن الياس سركيس. ط. المطبعه الكاثوليكيه . بيروت ١٩٠٩.

(٩) ابن شداد، ابو المحاسن بهاءالدين يوسف بن رافع الآسدى(له ٦٣٢ک ١٢٣٤ ز مردووه).النوادر السلطانيه والمحاسن اليوسفيه. تحقيق د. جمال الدين الشيال.ط. الدار المصريه. القاهره ١٩٦٤.

(١٠) ابن شداد ابو عبدالله عزالدين محمد بن على بن ابراهيم(له ٦٨٤ک/ ١٢٨٥ز مردووه). الآعلاق الخطيره فى ذكر أمراء الشام و الجزيره.

قسم حلب. تحقيق دومينيک سوريل.ط. المعهد الفرنسى. دمشق ١٩٥٣.

(١١) ابن الشعار، ابو البركات كمال الدين المبارک بن ابى بكر بن حمدان الموصلى(له ٦٥٤ک/١٢٥٦ز مردووه)، عقود الجمان فى شعراء هذا الزمان، دەستخەتێكی وێنەگیراوی سيكرو فليمی دانەيەكی تاقانەيە كە لە كتێبخانەی(السليمانيه)دا لە ئەستەمبۆل د هەيە. دانەی دكتۆر بشار عواد معروفه.

(١٢) ابن العبرى، ابو الفرج غريغوريس أهرون الملطى(له ٦٨٥ک/١٢٨٦ز مردووه). تاريخ الدول السريانى، ترجمه الخورى اسحق أرمله السريانى من اللغه السريانيه الى العربيه.

لە گۆڤاری (المشرق)دا بلاوكراوەتەوە چاپخانەی الكاثوليكيه. بيروت. مجلد ٤٩،

.٥٠.

(١٣) ابن العبری، ناوبراو تاریخ مختصر الدول. المطبعه الكاثوليكيه ط.٢. بيروت ١٩٥٨.

(١٤) ابن العديم، ابو القاسم كمال‌الدين عمر بن أحمد بن هبه الله الحلبی (له ٦٦٠ك/ ١٢٦١ ز مردووه)، زبده الحلب من تاريخ حلب. تحقيق د. سامی الدهان. المطبعه لكاثوليكيه.بيروت ١٩٥٣.

(١٥) ابن المستوفی، ابو البركات شرف لدين المبارك بن أحمد اللخمی الأربلی(له ١٦٣٧ك/١٢٣٩ز مردووه). نباهه البلد لخامل بمن ورده من الأماثل(تاريخ أربل) . تحقيق د. السيد سامی السيد خماس لصقار.ط. وزاره الثقافه و الاعلام. دار رشيد. بغداد ١٩٨٠.

(١٦) ابن واصل، جمال‌الدين محمد بن سالم بن واصل(له ٦٩٧ك/١٢٩٧ز مردووه)، مفرج لكروب فی أخبار بنی أيوب، تحقيق. جمال لدين الشيال. مطبعه جامعه فؤاد الاول. لقاهره ١٩٥٣.

(١٧) ابو شامه ، ابو محمد شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل القدسی.
(له ٦٦٢ك/ ١٢٦٦ز مردووه). كتاب لروضتين فی أخبار الدولتين.
مطبعه وادی النيل ١٢٨٧- ١٢٨٨ ه.

(١٨) ابو شامه(ناوبراو)، الذيل علی لروضتين«تراجم رجال القرنين السادس و لسابع الهجريين». طبع باعتناء محمد زاهد لكوثری (ط. القاهره ١٩٤٧).

(١٩) استرابادی، میرزا مهدی خان(نزیکەی سالی ١١٨٢ک/ ١٧٦٨ز مردووە).
جهانگشای نادری. چاپ بهمن. تهران ١٣٤٢ک/

(٢٠) الاصطخری، ابو اسحق ابراهيم محمد(پاش سالی ٣٤٠ ک/ ١٩٥١ز مردووە)المسالک و الممالک . تحقيق د. محمد جابر عبدالعال الحسينی.
دار القلم. القاهره ٩٦١.

(٢١) الباكوی، عبدالرشيد صالح بن نوری(کتێبەکەی لە نێوان سالی ٨٠٦- ٨١٦ ک نووسیوە).
تلخيص الآثار وعجائب الملک القهار. مطبعه دار النشر(القلم) موسكو ١٩٧١.

(٢٢) الحموی، ابو عبدالله شهاب الدين بن عبدالله الرومی(له ٦٢٦ك/١٢٢٩ز مردووه) . معجم البلدان. دار صادر- دار بيروت . لبنان ١٩٥٥.

(٢٣) الذهبی، أبو عبدالله شمس الدين محمد بن أحمد الدمشقی(له ٧٤٨ك/١٣٤٧ ز مردووه). تاريخ الاسلام. دەستخەتێکی وێنە کێشراوە لە کتێبخانەی الدراسات العليا- کۆلیجی ئاداب، زانکۆی بەغدا.

(٢٤) الذهبی (ناوبراو) ، العبر فی خبر من عبر، تحقيق د. صلاح الدين المنجد و فؤاد سيد. مطبعه حكومه الكويت. الكويت.

(٢٥) سبط ابن الجوزی، ابو المظفر شمس الدين قز أوغلی التركی(له ٦٥٤ك/١٢٥٦ز مردووه).
مراه الزمان فی تاريخ الاعيان. مطبعه محلس

دار المعارف العثمانيه. حيدر اباد. الهند.جزء بقسميه ١٩٥١-١٩٥٢.

(٢٦) شيخ الربوه، شمس الدين محمد الانصاري الدمشقي(له ٧٢٧ک/١٣٢٧ز مردووه). نخبه الدهر في عجائب البر و البحر. ط. الاكاديميه الامبراطوريه الروسيه. بطرسبورغ ١٨٦٥.

(٢٧) الغساني، اسماعيل ابن العباس(له ٨٠٣ک/١٤٠٠ز مردووه). المسجد السبوک. دراسه و تحقيق د.شاكر محمود عبدالمنعم مكتوب على الاله الطابعه. بغداد ١٩٧٠.

(٢٨) الغياثي، عبدالله بن فتح اللهپاش سالی ٨٩١ک/١٤٨٦ز مردووه) التاريخ الغياثي، دراسه و تحقيق د. طارق نافع الحمداني. مطبه اسعد. بغداد ١٩٧٥.

(٢٩) فضل الله، رشيد الدين(له ٧١٨ک/١٣١٨ز مردووه) جامع التواريخ، تاريخ المغول الايلخانيين، ترجمه محمد صادق نشاه وجماعته. ط. دار احصاء الكتب العربيه. القاهره ١٩٦٠.

(٣٠) القزويني، زكريا بن محمد بن محمود(له ٦٨٢/ ١٢٨٣ز مردووه) . آثار البلاد و اخبار العباد، دار صادر- دار بيروت، لبنان ١٩٦٠.

(٣١) مجهول(له سەدەی حەوتەم، یان سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچی مردووه). الحوادث الجامعه والتجارب النافعه في المائه السابعه. (وا دەزانرا کە ابن الفوطي کە له ٧٢٣/ ١٣٢٣ز مردووه نووسیوویەتی). تحقيق د. مصطفى جواد. مطبعه الفرات. بغداد ١٩٣٢.

(٣٢) المقريزي، ابو العباس تقي الدين احمد بن علي (له ٨٤٥ک/١٤٤٢ز مردووه). السلوک لمعرفه دول الملوک، تحقيق. د. مصطفى زياده. مطبعه دار الكتب المصريه ١٩٣٤.

(٣٣) البوءيني، ابو الفتح الدين موسى بن محمد البعلبكي(له ٧٢٦ک/١٣٢٦ز مردووه) ، ذيل مراه الزمان ، چاپی حيدر آباد. الدكن. الهند ١٩٥٤.

(٣٤) د. جعفر حسين خصباک- العراق في عهد المغول الايلخانيين ٦٥٦-٧٣٦ک/١٢٥٨-١٣٣٥ز، مطبعه العاني. بغداد ١٩٦٨.

(٣٥) شمس الدين سامي- قاموس الاعلام. مهران مطبعەسی. باب عالی جادەسندە، استانبول ١٣٠٦- ١٣١٤هـ.

(٣٦)م. سترک- ماده(اربل) في دائره المعارف الاسلاميه. طبعه (٩١ القاهره ١٩٣٣.

(٣٧) د. محسن محمد حسين- أربيل في العهد الاتابكي. مطبعه أسعد. بغداد ١٩٧٦.

(٣٨) د. محمود ياسين احمد التكريتي. الايوبيون في شمال والجزيره- وزاره الثقافه والاعلام، دار الرشيد. بغداد ١٩٨١.

(٣٩) نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر. ترجمه عن الالمانيه د. محمود حسين الامين. ط. بغداد ١٩٦٥.

# دارەبەن و مەدرەسەی فەقێیان

* فاتیح دارەبەنی



لەســەرەتادا دەمــەوێ کورتـە باسـێکی گـوندی دارەبەنتـان بۆ باس بکەم ینجا بێمەسـەر باسـی مـەدرەسـەکە، داربەن گوندێکە لەناوچەی بەڕانەتی ـەر بەشـارۆچکەی عـەینکاوە بووە تا سـەرەتای هەشـتاکـان، پاشـان کردویانە سەربەشارۆچکەی خەبات، ئەم گوندە لەناوچەی بەڕانەتی لەپاش گوندی (بەحـرکـە)لە هەمـوو گـوندان گـەورەترو قـەوغـەتربووە، خـەڵکێکی ـەکجار پاگژونایین پەروەری تێدابووە، ئەم گوندە دڵگیرە لەسێ بنەماڵە ێک هاتووە، بنەماڵەی حاجی نەبی، بنەماڵەی حاجی خدر، بنەماڵەی قادر ـەحـمـەد، هیـتـریشـی تێـدابووە ئاوخـۆرەوەو رێنـجـبـەر بووینـە، ئەوەی دەوڵەمـند بووە خـەریکی مـەڕداری وکـشـتـوکـاڵ بووە، ئەدارو دەست کورتەکان شوانی وجوتیاری وسەپانیان کردووە، لەسـەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧ دارەبەن (٤٢٥)کەس بووە کەئەو کات شارۆچکەی عەنکاوە (٢٦٠٠)کەس بووە وە هەولێر لە(٢٢٠٠٠)کەس زیاتر نەبووە.

لەناوەندی گوندەکە مزگەوتێکی گەورە هەبووە، ـ مەزندە دەکرێ درێژی مزگەوتەکە (١٥) مەتر بووبێت وپانی سێ مەترو نیو، لەلای پێشەوە هەیوانێکی هەبووە وەبەخشت وقوڕ دروست کراوەو جزیری بووە، لەلای ڕۆژ ئاوا دوو حوجرە هەبووە ـەنزیک یەک مابەینەکەیان هەیوانێک هەبووە، دەرگەی هەردووو حوجرەکە لەبن هەیوانەکە بووە، ئەوە تایبەت بەفەقێیەکان بووە، حوجرەکیتر بەرامبەر بەودوو حوجرە هەبووە پێیان گوتیە حوجرەی (سید ملا عبدالله).

لەحەوشەی مزگەوت سەکۆیەکی بەقوڕ دروست کراو هەبووە نزیکەی مەترێک بڵندبووە، ئەوە تایبەت بووە بۆ نوێژ لەکاتەی گەرمەکان، وەلەلای ڕۆژ ئاوا بیرێک هەبووە بۆ مزگەوت وماڵی مەلا. بەم جۆرە مایەوە تا ساڵی ١٩٦٥ لەو ساڵەدا سیمای مزگەوتەکە گۆڕدرا، بووە خۆڵەبان گەورەتر کرا، لەبیرمە (٢٧) کاریتەی تێدابوو لەوسەری لۆ ئەوسەری، ئەوەش مایەوە تاساڵی ١٩٨٤ لەوساڵەش مزگەوتەکە تێک درا بەنوێترین شێواز دروست کرا. وە لەساڵی ١٩٦٠ بیری ئیرتوازی بۆ گوند لێدرا، لەساڵی ١٩٦١ قوتابخانەی سەرەتایی بۆ دامەزرا.



لەساڵی ١٩٦٠ لەحکومڕانی عەبدولکریم قاسم زەوی کشتوکاڵی بەسەر جوتیاران دابەش کرا کە (٧١) جوتیار بوون هەریەک (٨٠) دۆنم زەوی بەرکەوت، لەساڵی

١٩٧٣ قوتابخانەی ناوەندی بۆ کرایەوە، لەساڵی ١٩٧٧ هێڵی کارەبای بۆ کێشرا، لەساڵی ١٩٨٤ حکومەت بۆ نەهێشتنی کۆچەرو ڕەوەند بەزۆرە ملێ (٢٥) خێزانی هەرکی سەپاندە سەر گوندی دارەبەن جێنشینی کردن، دیسان زەوی کشتوکاڵ دابەش کراوە، ئەم جارە هەرجوتیارێ (٥٠) دۆنمی بەرکەوت .

لەساڵی ١٩٩٩ قوتابخانەی ئامادەیی بۆ کراوە، لەساڵی ٢٠٠٠ بنکەی تەندروستی بۆ کراوە لەساڵی ٢٠٠١ پرۆژەی ڕێگای قیرتاو کردن عەینکاوە بۆ ئیفراز کە ٣٧ کیلۆمەترە بەگوندی دارەبەن تێپەڕ دەبێت وا لە کاردایە.

*** مەدرەسە**

زۆر حەزم دەکرد ئەو بەڵگانەی کە لەسەر دامەزراندنی مەدرەسەکە بەنووسین وبەرواری تەواو بەدەست بێنم پاش هەوڵێکی زۆر بەتەمەنترین پیاو لەگوندی دارەبەن(حاجی عوسمان سەلیم)ە تەمەنی (٩٥) ساڵ دەبێت لەدیدارێکی یەک کاتژمێری تایبەت بەهەبوونی مەدرەسە لەدارەبەن مام حاجی گوتی! منداڵ بووم مەلایەک مەلای دارەبەن بوو بەناوی (مەلا حسێن) خەڵکی گوندی بەحرکە بوو مامی مەلا عەولای بەحرکەیی بوو، مام حاجی گوتی: مەلا حسێن پیاوەکی بەتەقواو زۆر گران و سەنگین بوو هیچ کوڕی نەبوو تەنیا دووکیژی هەبوو، دەیگوت: مامۆستا هەموو جار کەناوی بویستبا بۆ ماڵێ لەبیرەکەی پێش ماڵیان بەخۆی کندری دەولکەکەی ڕادەکێشا، مەلاژنیش وەری دەگرت بەهیچ جۆرێک نەی دەهێشت کەس یارمەتیان بدات، بەڵام مام حاجی گوتی: نازانم ئەوکات مەدرەسە هەبوو یان نەبوو.

گوتی: پاشان مامۆستا مەلا حسێن ئەمری خوای کرد، لەقەبرستانی بەینی دارەبەن و ئاشۆکان نێژرا، گوتی: پاش مەلا حسێن مەلا عەولای بەحرکە هات بووە مەلای دارەبەن، پاش چەند مانگێک جەمیلی کاکل ئاغای بەحرکەی سواری هەناردن مامۆستایان بەماڵەوە بردەوە، دارەبەن بێ مەلا مایەوە پاش بەینەکی مەلا خدری (دەشتی)یان هێنا بووە مەلای دارەبەن ڕاستەوخۆ مەدرەسەی کردەوە لەساڵی ١٩٣٥،

**مەلا خدر (دەشتی)**

مەلا خدر کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەلی یە لەتیرەی نانەکەلیەو لەساڵی ١٩٠٩ لەگوندی (مەلا کاغە)لە دایک بووە، مەلا کاغە گوندێکە سەربە قەزای مەخمورە، پاشان لەبەر هەژاری ئەم گوندە جێدێڵن لەهەولێر لەگەڕەکی سەرای کۆن دەگیرسێنەوە دەشتی لەمزگەوتی شێخ موحیەدین دەست دەکات بەخوێندن بەماوەیەکی کەم قورئانی پیرۆز خەتم دەکات، وەدەست دەکات بەخوێندنی کتێبە هوردەکان، دەشتی هەوڵدەدا لەمەدرەسە پێش کەوتوەکانی سەردەم بخوێنی، لەبەر ئەوە ڕوودەکاتە ناوچەی خۆشناوەتی زۆربەی مەدرەسەکان بەسەر دەکاتەوە وەک و مەدرەسەی شەقڵاوە - بالیسان - سپی گرە - کونە فلوسە- بێتواتە- خەتێ- هیران - گەلێ شوێنی تریش ساڵی ١٩٢٩ دەگەڕێتەوە هەولێر مزگەوتی قادر



دەباغ لای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا حەمەدەمین کونە فلوسەیی دەخوێنێت تا ساڵی ١٩٣٤ ئیجازەی مەلایەتی بەدەست دێنێ، وە لەهەمان ساڵ ژنیش دێنێ لەساڵی ١٩٣٥ دەبێتە مەلای گوندی دارەبەن لەبەر ئەوە لەناوچەی بەڕانەتی هەتا ئێستا بەمەلا خدری دارەبەن ناسراوە، مامۆستای پایە بەرز هەرلەگەڵ گەیشتنی بۆ گوندی دارەبەن راستەوخۆ مەدرەسەی دەکاتەوە (١٧)ساڵ بەردەوام بووە لەدەرس گوتنەوە، مامۆستا هەتا ئێستا وتارو ئامۆژگاریەکانی کاریگەری خۆی هەرماوە لەسەر دانیشتوی دارەبەن بەتایبەتی بەتەمەنەکان، مامۆستا زۆر توندو تیژ تەبیعات بووە لەسەر حەق، مامۆستا بێجگە لەزانیاری ئایینی، لە زانیاری ئەدەبیات وزمانەوان دەستێکی یەکجار باڵای هەبووە، مەولود نامەیەکی یەکجار خۆشی هەبووە کەموحەمەدی کوڕی بەچاپی گەیاندوە وەدیوانێکی گەورەی دەست نووسی هەیە کەچەندین هۆنراوەی دینی و نیشتمانی وکۆمەڵایەتی لەخۆوە گرتووە بڕیارە ئەحمەدی کوڕی بەچاپی بگەینی، وەچەندین نووسراوی تریشی هەیە کە لەسەر شەریعەت و قەواعیدی عەرەبی نووسیوە، مامۆستا زمانی فارسی وعەرەبی بەڕەوانی زانیوە، حاجی مەلا ڕەسولی مامم دەیگوت: مامۆستا لەسەفەری حەجێ یان لەمەکە یان لەمەدینە ڕێگایان پێدابوو ووتارێک بخوێنێتەوە،لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٢دارەبەن بەجێدێلی دەچێتە گوندی گردەچاڵ لەهەمان ناوچە تا ساڵی ١٩٥٤، پاشان دەگەڕێتەوە هەولێر تاکۆتایی ساڵی ١٩٥٦، ئەم جارە دەبێتە مەلای گوندی خرابەدراو کەچوار کیلۆمەتر لەڕۆژ ئاوای دارەبەن دوورە، لەم ماوانەش مامۆستا فەقێ و موستەعیدی هەرهەبووە، لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندی خرابەدراو کۆچی دوایی کردووە هەرلەوێ نێژراوە، هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی بێت.

وا لێرە ناوی ئەو سوختەو موستەعیدانەی کە لەخزمەت مامۆستایان خوێندوە لەگوندی داربەن بۆتان دەنووسم.

١- مەلا سەید عەبدوڵڵای قەرادگەی.
٢- مەلا ردسولی شاوێسی.
٣- مەلا ئەحمەد حەمەدەمین دارەبەنی.
٤- مەلا موحەمەد قادر جوبرائیل قەلانچۆغەیی.
٥- مەلا جەمیل گەزنەیی.
٦- مەلا تاهیری گەزنەیی.
٧- مەلا جامی قەرەبەگی .
٨- مەلا سید حەمەدەمینی گەزنەیی.
٩- مەلا تاهیری دووشیوانی.
١٠- مەلا شێخول ئیسلامی بادینی.
١١- مەلا عوسمان ئاشۆکەیی.
١٢- مەلا ئەحمەدی هەرشەمی.
١٣- مەلا سالح کەوڕەبەنی.
١٤- مەلا مستەفای بنبێرزی.
١٥- مەلا یوسف زێباری.
١٦- مەلا مەجید حاجی رەسولی دارەبەنی.
١٧- مەلا ئەبوبکر رحمان دارەبەنی.
١٨- مەلا حامد ئیبراهیم دارەبەنی.
١٩- مەلا عومەر سەیدانی.
٢,- مەلا سەدیق شێخ سەعید خرابەدراوی.
٢٢- مەلا ئەمجد گاینجی.
٢٣- مەلا رەسول حاجی خدری دارەبەنی.
٢٤- مەلا ئیسماعیل موستەفا گەزنەیی.
٢٥- مەلا ڕەسول قەراتە سۆرانی.
٢٦- مەلا حوسێن سەیدانی.
٢٧- مەلا عەلی خرابەدراوی.
٢٨- مەلا عومەر سلێمان گردەشێری.
٢٩- مەلا یاسین گردەشێری.
٣,- مەلا قاسم کارەباچی.
٣١ - حاجی سەید کەریم دارەبەن.

ئەو مەلابەڕێزانە چ بەموستەعیدی چ بەسوختەیی کەناومان هێناون لەوانەیە زۆرتریش هەبووینە لەبیرکراون ئەمانە تەنها لەمەدرەسەی داربەنیان نەخوێندوە، هەموو فەقیێیەک بەدەیان مەدرەسەی دیوەو چەندین ناوچە گەڕاون، ژیانی چەند مەلایەک دەخەینە ڕوو.

**مەلا ڕەسول یونس**

مەلا ڕەسول یونس کوڕی موستەفایە، لەساڵی ١٩٢٦ لەگوندی شاوێسی نزیک هەولێر لە دایک بووە لەحەوت ساڵیدا دەچێتە حوجرەی فەقێیان لەشاوێس لای مەلا ئەحمەدی شێروانی دەخوێنی، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز دەچێتە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مەلا عەولای کونەفلوسەی دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی گڕاو لای مەلا ئەبو بەکری گڕاوی دەخوێنێ، پاشان چوێنە گوندی سورێژە لای مەلا قادر سورێژەی، خوێندووە، پاش ماوەیەک دەچیتە گوندی دوسەرە لای مامۆستا مەلا خەلیل (مخلص) دەخوێنێ پاشان گەڕایتەوە سورێژە لای مەلا عەبدوڵلای فەرهادی دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی دارەبەن لای مەلا خدری دارەبەن دەخوێنێ، وە مەلا ڕەسول دەیفەرموو زۆربەی کتێبە قورسەکان وبەپێزەکانم لای مەلا خدر خوێندوە، پاشان چوینە گوندی کەوری سەربەناوچەی خەبات لای مەلا عومەری کەوری خوێندوە پاشان دەگەڕێتەوە هەولێر لای مەلا عەولای کونە فلوسەی دەخوێنێ، مامۆستا مەلا عەولا قەول دەداتە مەلا ڕەسول کە ئیجازەی مەلایەتی پێبدا، بەداخەوە مامۆستای پایە بەرز نەخۆش دەکەوێ... ئیتر خوای شیفای نادا ئەمری خوای بەجێدێنێ، مەلا ڕەسول دەبێتە مەلای تۆبزاوە، هەر لەوێ ژن دێنێ، لەساڵی ١٩٥٥ دەبێتە نەهات (دەست هەلقەنە). مامۆستا تۆبزاوە بەجێدێڵێ دەچیتە گوندی (براغ) سەر بەناحیەی سەلاحەدینە، دوانزە ساڵ دەمێنێتەوە پاشان دەگەڕێتەوە هەولێر، بۆ ماوەیەک دەبێتە مەلا لەقەزای ئاکرێ پاشان دەگەڕێتەوە هەولێر دەبێتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی حاجی عەبدوڵلای حەمامچی لەهەولێر پاشان دەچێتە مزگەوتی (شێخ سانی) دەبێتە ئیمام وخەتیب ئەوە ١٨ ساڵیشە لەو جێگەییە، خوا تەمەنی مامۆستامان بۆ درێژ بکات بۆ خزمەتی ئەم ئایینە پیرۆزە.

**مەلا عوسمان هەمزە**



مەلا عوسمان کوڕی هەمزەیە لە ساڵی ١٩٣٥ لەگوندی گەزنە سەر بەناحیەی عەینکاوە لەدایک بووە، لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دەچێتە مەدرەسەی دینی لە گوندی دارەبەن، تا قۆناغی سوختایەتی تەواو دەکا، دەگاتە قۆناغی موستەعیدی، لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٢ مامۆستا مەلا خدر دارەبەن بەجێدێڵێ دەچێتە گوندی گردەچاڵ کە شەش کیلۆمەتر لەدارەبەن دوورە، مەلا عوسمان بەدوایدا دەچیتە گردەچاڵ و دووساڵ بەموستەعیدی لای مەلا خدر دەخوێنێ پاشان مەلا خدر گردەچاڵ بەجێدێڵێ دەچیتە هەولێر گەڕەکی تەیراوە، مەلا

ـرسمان دەچێتە گوندی گەزنە لای مامۆستا مەلا ـحمەد دەخوێنێ، پاشان ماوەیەک دەچێتە گوندی ـیرژە سەر بەناحیەی سەلاحەدین لای مامۆستای ـیە بەرز مەلا موحەمەدی قیرژەی دەخوێنێ، پاشان ـچێتە کۆڕێ لای مامۆستا مەلا تەهای کۆڕێ ـخوێنێ پاش ماوەیەک دەچێتە گوندی یارمجە ـەر بەناحیەی دارەمانی کەرکوک لای مەلا حەمەدەمینی سوێری دەخوێنێ، وە ماوەیەکیش لای ـمۆستا شێخ عومەری بالیسانی لەسێتاقان ـخوێنێ، وە گەلێ جێگای تریش گەڕاوە بەڵام ـوەکەیان کورت بووە، مامۆستا مەلا عوسمان زۆر خۆشەویست بووە لەناو فەقێ وموستەعیدان ـنگێکی یەکجار خۆشی هەبووە لەخوێندنی قورئانی پیرۆز لەبانگ وکەبار لەخوێندنەوەی شیعرو قەسیدەو هۆنراوە، ئەم مەلایە رووخۆشە ـێستا لە مزگەوتی سەلاحەدین ئەیوبی لەگەڕەکی سەلاحەدین لەهەولێر ئیمام وخەتیبە.

**مەلا مەجید حاجی رەسول**

لەساڵی ١٩٤١ لەگوندی دارەبەن چاوی هەڵیناوە، لەحەوت ساڵیدا چوویتە حوجرەی فەقێیان لای مامۆستا مەلاخدر خوێندوویەتی پاش خەتمی قورئانی پیرۆز چەند کتێبێکی هوردی خوێندو، پاشان کەمەلا خدر دارەبەن بەجێدێڵی، [مەلا حەمەدەمین] سوێری دەبێتە مەلای دارەبەن، مەلا مەجید بەردەوام دەبێ لەخوێندن پاش دووساڵ مەلا حەمەدەمین سوێری دارەبەن بەجێدێڵێ دەچێتە گوندی یارمجە سەربەناحیەی دارەمانی شاری کەرکوک، مەلا مەجید دەچێتە یارمجە ماوەیەکی باش دەمێنێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە شاری هەولێر لەمزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مامۆستا مەلا فائز دەخوێنێ، وە مەلا مەجید لەگەڵێ جێگای تریشی خوێندووە، لەساڵی ١٩٧٥ دەبێتە مەلا لەشاری موسل ماوەیەک لەموسل بەسەردەبات



پاشان دەبێتە مەلای یەکێک لەمزگەوتەکانی ئامێدی ماوەیەکیش لەوێ ژیان بەسەردەبات ئینجا دەگەڕێتەوە هەولێر ئێستا مەلای مزگەوتی حاجی موحەمەد بەرحوشتریە لەهەولێر گەڕەکی تەیراوە.

**مامۆستا جەمیل مجید**

مامۆستای بەڕێز لەساڵی ١٩٣٢ لەگوندی گەزنە



سەر بەناحیەی عەینکاوە چاوی هەڵێناوە لەحەوت ساڵی دەچێتە مەدرەسەی دارەبەن لای مامۆستای پایە بەرز مەلاخدری دەشتی دەست بەخوێندن دەکات پاش تەواوکردنی قورئانی پیرۆز چەند کتێبێکی هوردیش دەخوێنێ لەساڵی ١٩٥١ کە مەلا ئیسماعیل موستەفا بروانامەی مەلایەتی وەردەگرێ، مەلا ئیسماعیل دەبێتە مەلای گوندی (سمایل ئاوا) مەلا جەمیلیش لەگەڵ خۆی دەبا بۆ خوێندن پاش سێ ساڵ مەلا جەمیل دەگەڕێتەوە گوندی گەزنە لای مەلا ئەحمەدی گەزنە بەردەوام دەبێ لەخوێندن، پاش ماوەیەک گەزنەش بەجێدێلێ دەچێتە خزمەت مامۆستای بلیمەت مەلا کەریمی سێبیران، ماوەیەکی باش دەمێنێتەوە لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ مەلا کەریم خەونەکی دەبینی ، سبەینێ گازی فەقێیان دەکا، دەڵێ: فەقێینە ئەوشۆ خەونەکم دیتیە لۆتان دەگێرمەوە خەونەکەش ئەوەیە: لەخەوێ پێیان گۆتم بانگی فەقێیەکانت بکە بەخشت و قوڕ دەرکێ حوجرەی فەقێیان قەپات بکە دەڵێ: ئێمەش هەستاین بەخشت و قوڕ گرتمان.

مەلا کەریم دەفەرمووێ تەعبیری خەونەکەش والێک دەدەمەوە ئەوساڵ دەبێتە نەهاتی، مەلا جەمیل گوتی: چوارمانگی بەسەرخەونەکە تێپەڕی گەیشتینە بەهاری ١٩٥٥ باران زۆر بەکەمی باری دەغل و دان بەداس نەدوراوە بەدەستی هەڵیان دەکێشا بۆیە هەتا ئێستاش ئەوساڵە لەبیر نەکراوە بەساڵی (دەست هەلقەنە) یاد دەکرێتەوە، مەلا جەمیل گوتی: مەلا کەریم هاتە حوجرەی گوتی: فەقێینە ساڵەکە نەهاتە، خەلکەکە لۆخۆی نیتی لۆ ڕاتبەو فەقێیان لە کێ بینی، وای بەباش دەزانم لۆ یەک ساڵ خوێندنی ڕادەگرم، فەقێ قوریان گرتەوە پوختە دەرکێ حوجرەیان گرت. مەلا جەمیل پاش ماوەیەک ڕادەوەستێ دیسان دەڕوا دەچێتە گوندی (براغ) سەربەناحیەی سەلاحەدین لای مامۆستا ڕەسول شاویسی دەست بەخوێندن دەکا ماوەیەکی باش دەمێنێتەوە، پاشان دەبێتە مەلای گوندی دەربەندی سەیدی سەربەناحیەی سەلاحەدین پاشان دەبێتە مەلای گوندی میرئاخور لەهەمان ناوچە، سەر ئەنجام مامۆستا ئێستا ئیمامە لەمزگەوتی حاجی عەزیز خرابەدراوی لەهەولێر.

**مەلا ئیسماعیل موستەفا**



مەلا ئیسماعیل کوڕی موستەفای کوڕی عەبدوڵلایە، لەساڵی ١٩٢٢ لەگوندی گەزنە سەربەناحیەی عەینکاوە چاوی هەڵیناوە، لەحەوت ساڵی دەچێتە حوجرەی فەقێیان لەگوندی خەتێ لای مامۆستا ئیبراهیم دەخوێنێ، پاشان دەچێتە بالیسان ماوەیەک دەخوێنێ دیسان دەگوازیتەوە گوندی هەرتەلی سەر بەقەزای ڕانیە لای مامۆستا فەتحوڵلا دەخوێنێ، ماوەیەک دەمێنێتەوە ئەوجارە دەگەڕێتەوە لای ناحیەی گوێر گوندی زەمزەمۆک لای مامۆستا سەعید دەخوێنێ، لەسەر بەرگی یەکێک لەپەرتووکەکانی دەست نووسی خۆی ساڵی ١٩٤١ ی نووسیوە پاشان دەچێتە گوندی نۆغەران لای مەلا موحەمەدی نۆغەران دەخوێنێ دیسان لەسەر پەرتووکێکی تری دەست خەت نووسیتی نۆغەران ١٩٤٣. [ لەگەڵ کاک نامیق کوڕی مامۆستای بەرێز زۆر لەپەرتووکەکانی خوالێخۆشبوومان تەماشا کرد لەوەی زیاترپێمان ڕوونتر نەبۆوە]. پاشان دەچێتە گوندی دارەبەن لای مامۆستا

مەلاخدر دەخوێنێ تا ئیجازەی مەلایەتی بەدەست دێنێ، باوکی رەحمەتیم کەحاجی موحەممەدی حاجی خدره دەڵێ حەفت رۆژ ئاهەنگی ئیجازەی مەلا ئیسماعیل بەردەوام بوو، دەیگوت هەرچی مەلاو مودەریس هەبوو مەلاخدر لێیگێرابۆوە، شێخ موستەفای نەقشبەندی و شێخ موحیەدین و شێخ کاکەو مەلا عەولای بەحرکەی، مەلا ئەحمەدی گەزنەیی و مەلا عەلی و مەلا فائزی کونەفلوسەیی، باوکم دەیگوت پێش ئەوەی لەخەڵکەکە بگێریتەوە پرسی بەخەڵکی گوندی کرد گوتی: ئەگەر ئەو خزمەتەو پیبکرێ بەتەمای شتەکی وامە، خەڵکەکە هەموو ئامادە باشیان دەربڕیبوو. باوکم دەیگوت گەلەک جار لەحاجی شێخ کاکەم دەبیست دەیگوت هەتا ئێستاش لەگەڵ دابی دارەبەنم خۆش دەوێ کە ئاهەنگی ئیجازەی مەلا ئیسماعیل حەفت رۆژی خایەند کوو ئەو گوندە نانی ئەوهەموو حەشاماتەی پێدرا!. کەلەساڵی ١٩٥١ ئیجازەی پێدرا دەبیتە مەلای گوندی (سمایل ئاوا) سەربەناحیەی خەبات دە ساڵ دەمینێتەوە پاشان دەبیتە مەلای گوندی پیرزین کەلەبن هەولێرە تاساڵی ١٩٩٣ ئەمری خوای بەجێ گەیاند هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی.

**مەلا عومەر سەیدانی**

مەلا عومەر کوری مەلا مستەفای کوری مەلا عەبدول رەحمانە لەساڵی ١٩٢٣ لەگوندی سەیدان سەربە شارۆچکەی عەینکاوە لەدایک بووە، بنەماڵەی ماموستا لەعەشیرەتی خۆشناون



وزبارەتین. ماموستای بەرێز لەحەوت ساڵی لای باوکی دەستی بەخوێندن کردوە، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز چەند کتێبێکی هوردیش دەخوێنێ، لەساڵی ١٩٣٨ دەچێتە گوندی تەرجان لای ماموستای پایە بەرز مەلا عەبدوڵڵای تەرجانی دەخوێنێ، تاساڵی ١٩٤٣ پاشان دەچێتە گوندی سێبیران لای ماموستای بلیمەت مەلا کەریمی سێبیران دەخوێنێ ماوەیەکی باش دەمینێتەوە پاشان دەچێتە گوندی ماوەران سەر بەشارۆچکەی سەلاحەدین لای ماموستا مەلا ئەحمەدی حەیدەری دەخوێنێ، پاش ماوەیەک دەگوازرێتەوە دەچێتە گوندی ئاشگە لەهەمان ناوچە لای ماموستا عبدالقادر بالیسانی دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی دارەبەن لای ماموستا مەلا خدری دەشتی دەخوێنێ ماموستا مەلا عومەر دەبێتە مەلایەکی یەکجار زیرەک لەحوکمرانی عەبدولکەریم قاسم دەبێتە ماموستای قوتابخانەی سەرەتایی لەگوندی سەیدان، زباتر لە(٣٠) ساڵ خزمەتی کرد پاشان خانەنشین کرا بووە ووتارخوێن لەمزگەوتی پیربال ئاغا لەگەرەکی سەلاحەدین لەهەولێر تارەمەزانی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی خۆی وماموستاکانی.

**مەلا حەمەدەمین سوێری**

مەلا حەمەدەمین کوری ئەحمەدە لەگوندی سوێرە لەساڵی ١٩٠٥ لەدایک بووە، سوێرە گوندێکە (١٠) کیلۆمەتر لەرۆژئاوای هەولێر دوورە، دایک وباوکێکی لەخوا ترس وموسولمانی هەبووە، باوکی



لەعەشیرەتی(زێد بەگی)یە و دایکی لەعەشیرەتی(گەردییە) باوکی سۆفی بووە موریدی شێخ نورەدین بریفکانی بووە، لەحەوت ساڵی دەچێتە حوجرەی فەقییان، هەر لەسەرەتا مامۆستا زیرەکی پێوە دیاربووە، مامۆستا لەمەدرەسەی شێخ عومەری قەرەداغی ومەدرەسەی بیارە لای مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ولای مەلا ئەحمەدی ئەلبانی لەگوندی(چەغەمیرە) وەلەمەدرەسەی باداوە لای مەلا فەندی وەهەر لەوێش ئیجازەی مەلایەتی بەدەست دێنێ، لەئاهەنگێکی قەشەنگ کەزۆر شایستە بووە ئیجازەکەی پێدراوە.

وەبەفەرمانی مەلا فەندی لەگوندی کەسنەزان دەبێتە مەلا کە مەدرەسەکی گەورەی هەبووە وەمامۆستای پایە بەرز گەلێ مەدرەسەی تری بەرێوە بردووە وەک(عەلیاوە- دارەبەن- خرابەدراو- مەعمەر- ئەسبینداره- شیوەرەش- یارمجە)شارۆچکەی دبس سەر بەشاری کەرکوک، وە لەوماوەیە دوورو درێژە مامۆستا بەدەیان مەلای چاک وزیرەکی پێگەیاندوە لەساڵی ١٩٥٧ مامۆستا فەرزی حەجی بەجێ گەیاندووە ولەساڵی ١٩٦٤ لەشارۆچکەی دبس گیانی پاکی سپاردوە، هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی بێت.

ناوی چەند مەلایەکی زیرەک وناسراو کەلەخزمەت مامۆستایان خوێندوە:-

١- مەلا عەبدولرەحمانی گرد جوتیاری.
٢- مەلا سەید موحەممەدی پیرداودی.
٣- مەلا عەلی بیرەعارەبانی.
٤- مەلا عەبدوڵلای سێبەردانی.
٥- مەلا ئەحمەدد گرد عازەبانی.



٦- مەلا سالح جەعفەری.
٧- مەلا عەزیز دوکەلەیی.
٨- مەلا ئیبراهیم ماوەرانی.
٩- مەلا عەبدولقادری گۆمەسپانی.

وەبەدەیانی تر کەبەداخەوە ناوەکانیان بەدروستی بۆم روون نەبوویتەوە.

*** مەلا عومەر حاجی مەحمود**

مەلا عومەر کوڕی حاجی مەحمودی کوڕی موحەمەدە لەساڵی ١٩٠٥ لەگوندی تەرجان لەدایک بووە پاشان تەرجان بەجێدێڵن دەچنە گوندی (شێخە شەل) سەر بەشارۆچکەی عەینکاوە، هەر لەو گوندە لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دەچێتە حوجرەی فەقێیان تاختمی قورئانی پیرۆز تەواو دەکات، مامۆستا لەگەلێ شوێن گەڕاوە وەک وهەموو فەقێیەک بەڵام بەدروستی بۆمان روون نەبوویتەوە کەچۆن بووە، مامۆستا پاش خوێندن بۆ یەکەم جار بویتە مەلا لەگوندی رەشوان سەر بەشارۆچکەی سەلاحەدین، پێنج ساڵ دەمێنێتەوە پاشان دەچێتە گوندی ئاشۆکان دەبێتە مەلا، ماوەیەکیش بەمەلایەتی دەمێنێتەوە لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٥ مەلا حەمەدەمین سوێری دارەبەن



کەسایەتی ناسراوی بنەماڵەی (حاجی نەبی) حاجی تەها شێخ موحەممەد



کەسایەتی ناسراوی بنەماڵەی (حاجی خدر) حاجی موحەممەد حاجی خدر



کەسایەتی ناسراوی بنەماڵەی (قادر ئەحمەد) حاجی حەسەن حاجی قادر

بەجێدێڵێ مەدرەسەی دارەبەن قەپات دەبێ

ماموستا دەبێتە مەلای گوندی دارەبەن، لەساڵی ١٩٥٧ ماموستا دەرگای مەدرەسەکە دەکاتەوە کە جارەکیدی مەدرەسەکە بەگڕ بکەویتەوە، چەند فەقێیەک لای ماموستا دەست بەخوێندن دەکەن وەک :-

١- مەلا موحەممەدی مەجید بارەکی.
٢- مەلا بەکر ئیبراهیم .
٣- مەلا خورشید حاجی کەریم.
٤- مەلا حەمید مەلا عومەر.

وەگەڵێکی تریش، بەداخەوە لەتەمموزی ١٩٥٨ مەدرەسەکە یەکجارەکی لەخوێندن وەستا هەتاکوو ئێستا، لەڕۆژی ١٩٧٥/٢/٧ ماموستای بەڕێز ئەمری خوای بەجێ گەیاند هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی.

لەپاش ماموستا، مەلا حەمیدی کوڕی ئەرکی مەلایەتی گرتە ئەستۆ هەتاکو ئێستا .

*** سوپاس وپێزانین.**

١- بۆ بەڕێز: موحەممەد دەشتی.
٢- بۆ بەڕێز: عەبدوڵڵا مەلا عومەر دارەبەنی.
٣- بۆ بەڕێز: حەمە رەشید حاجی خورشید.
٤- بۆ بەڕێز مەلا عومەر سوێری.
٥- بۆ بەڕێز: کەریم دەشتی بۆ چاو پێخشاندن وتێبینییەکانی.
٦ - بۆ ئەوانەی کەم و زۆر ئاسانکارییان بۆ کردووم.

# شاعیرو رەچەڵەکناس ناسیح حەیدەری (١٨٩٨-١٩٨٦) ژیاننامەو بەرهەمەکانی

نەزیرە حەویز سالح بەسەرپەرشتی پ.ی. دکتۆر عەبدوڵلا حەداد ئامادەی کردوە



* ئەم لێکۆڵینەوەیە بەناونیشانی :(ناسیح حەیدەری (١٨٩٨ - ١٩٨٦).. لێکۆڵینەوەیەکە سەبارەت بەژیان و بەرهەمەکانی) بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆری یاریدەر دکتۆر عەبدوڵلا حەداد لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٠ - ٢٠٠١) لەبەشی کوردی - کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین پێشکەش کراوە. لەبەرگرنگی بابەتەکەو پەیوەندی بەشاری هەولێرەوە، گۆڤاری (هەولێر) بە خۆشحاڵییەوە (پێشەکی) و (بەشی یەکەمی) بڵاودەکاتەوە.

## پێشەکی:-

لەم کورتە لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین لە ژیاننامەو هەندێ لەشیعرەکانی شاعیری کورد مامۆستا ناسیح حەیدەری بکۆڵینەوەکەلە نێوان سالانی 1898 - 1986 دا ژیاوە، ئەم لێکۆڵینەوە هەنگاوێکە بۆ تیشک خستنە سەر لایەنەکانی ژیانی شاعیرو ورد بوونەوە لە چەند سووچێکی شیعرەکانی.

ئەم زاتە کەسەر بە خانەوادەیەکی مەلازادەی ناسراوی کوردستانە، سەرەڕای ئەوەی شاعیرێکی بەسەلیقە بووە ،لە بواری مێژوو و رەچەڵەکناسی و کاروباری ئیداریشدا شارەزاو پسپۆر بووە، یەکێکە لە پێشەنگەکانی شاعیرانی هەولێر کەلە زووەوە بەکوردی شیعریان نووسیوە، ئەویش لەتەک مەلا حوسەینی موفەسیر (فانی)(١٨٨٣-١٩٨٣) و عەبدولجەببار ئاغای دوغرەمەچی (کانی) (١٨٩٧-١٩٥٨) و مەلا شەریف میهری (١٩٠٣-١٩٤٢)و شێخ جەلال شێخ جەمیل (نوری) و رەشاد موفتی (١٩١٥-١٩٩٢) و سەید ئیبراهیم (هۆشیار) (١٩١٧-١٩٩٦) و بورهان جاهید (١٩١٨-١٩٩١) و د. عەبدوڵلا نەقشبەندی (هەرشەمی) (کەلەساڵی ٢٠٠٠ وەفاتی کرد) و هی ترکەخزمەتی کاروانی ئەدەبیاتی کوردییان کردووە.

لەم دەرفەتەتەدا هەوڵمان داوە کۆمەڵێک زانیاری نوێ دەربارەی ژیاننامەی شاعیر کۆبکەینەوە و گەشتێک بەنێو دیوانەکەیدا بکەین.

هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بەپلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم زاتە وەکو شاعیرێک، زۆر کەم ناسراوەو تەنانەت زۆر کەم شتی لەسەر نووسراوە، دیوانەکەیشی زۆر درەنگ بەم دوواییانە، واتە ساڵی (٢٠٠٠) لەچاپ دراوە، تاکو ئێستا زۆرکەم ئاوڕی لێدراوەتەوە، بۆیە ئێمە لەخۆمان رادیت خەریکی ئەم بابەتە بین و بەپێی توانا، ژیان و شیعرەکانی شرۆڤە بکەین. دیوانی ناسیح حەیدەری بریتییە لەکۆمەڵێک شیعر

لەبواری ئایینی و ئەڤینی وکۆمەلآیەتی و لاواندنەوەو... هتد.

هەروەها شیعری چەند شاعیرێکی گەورەی وەک مەولانا خالید (١٧٨٧-١٨٢٧) و نالی (١٨٠٠-١٨٧٣) و حاجی قادری کۆیی (١٨١٨-١٨٩٧) و شێخ رەزای تالەبانی (١٨٣٥ - ١٩٠١) و صافی و محوی و نووری شێخ سالح و زیوەرو هی تری تەخمیس کردووە.

لەئامادەکردنی ئەم باسەدا سوودم لەچەند سەرچاوەیەک بینیوە، گرنگترینیان دیوانەکەیەتی، بەلآم بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، زیاتر پشتم بەهەندێ دیدارو چاو پێکەوتن بەستووە کە لەگەڵ هەندێ شارەزاو نووسەراندا سازم داون، وەک : بەرێز کاک شێروانی کوری شاعیر و، کاک مومتاز حەیدەری کوری خالی و، مامۆستا کەریم شارەزا. هەروا لەم بوارەدا مامۆستای سەرپەرشتیاری باسەکەم د.عەبدوللا حەداد بەچەند لایەنێکی ژیاننامەی شاعیر ئاشنای کردم و کۆمەڵێک زانیاری وردی پێشکەش کردم.

ئەوەی راستی بێ کەمیی سەرچاوە دیارترین گیروگرفت بوو لەئامادەکردنی باسەکەدا روو بەرووم بۆوە، پێم وایە ئەگەر سەرچاوەی زیاترمان لەبەر دەست بووایە لێکۆڵینەوەکەمان دەولەمەندترو بەپێزتر دەبوو.

لەکۆتاییدا هیوادارم بەم چەند وشەی سادەو ساکارانە تیشکێکم خستبێتە سەر لاپەرەیەکی تری ئەدەبیاتی کوردی لەشاری هەولێری دێریندا و ، خوازیارم وەکو بەشدارییەکی زۆر بچووک لێم قبووڵ بکرێ.



## بەشی یەکەم :

## ژیاننامەی شاعیر:

**ا- ساڵ و شوێنی لەدایک بوونی:.**

ئاشکرایە کەشاری هەولێر دێرینترین شارە لەجیهاندا، تاکو ئێستا ژیانی تێداماوە، چەندین کەڵە پیاو لە ئامێزیدا پەروەردە بووە، کە ناوبانگیان لەجیهانی ئیسلامی و لەدنیادا بلآوبۆتەوە، وەکو: ئیبن خەلەکان و (ئیبن المستوفی)و سولتان موزەفەرەدین و مەلا جەرجیسی ئەربیلی و ئیبراهیم حەقی حەیدەری و مەلا ئەفەندی .. کە هەریەکێکیان لەبوارێکدا خاوەن بەهرەی هەمە جۆر بوون و ، لەئاسمانی مێژووی کوردستاندا وەکو ئەستێرەی پرشنگدار دەدرەوشێنەوە. جا لەبەر ئەوەی هەولێر مێژوویێکی درێژی هەیە، چەندین جار دووچاری کێشەو گرفت و شالاوی شەرو شۆر بۆتەوە، هەندێ جاریش کەوتۆتە ژێر رکێفی بێگانان کەرەفتاری ناشایستەیان بەرامبەر خەڵکەکەی ئەنجام داوە.

ناسیح حەیدەری لەناو قەلآ سەرکەشەکەی هەولێر، لە گەرەکی (سەرا) کۆلآنی (ئاغاکان) چاوی بە ژیان هەڵێناوە، دراوسێی تەکیەی شێخ شەریف و دیوەخانی پیرباڵ ئاغای کوری عەبدولرەزاق ئاغای عوزێری و ماڵی حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حەداد و محەمەد عەلی موختار ئەفەندی و چەندین پیاوی دیاری تر بوود (١) ..

سەبارەت بەژیاننامەی لەساڵی ١٩٨٥، بە خۆی فەرموویەتی:

(ناوی تەواوم ناسیحی کوری عەبدوللای کوری

سەبغە تولڵای بچووکی کوڕی سەبغە تولڵای گەورەی حەیدەری ماوەرانییە، لەساڵی ١٨٩٨ دا لەقەڵای هەولێر لەدایک بووم. لەتەمەنی شەشساڵی لەقوتابخانەی میریدا خراومەتە بەر خوێندن، لەساڵی ١٩١٦ لەگەرمەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەستم لە خوێندن هەڵگرتووەو دووبارە رووم کردۆتەوە مەدرەسەی ئایینی، کە ئینگلیزەکان عێراقیان داگیر کرد (لەپایزی ساڵی ١٩١٨ دا) گەیشتنە هەولێر، من دەستم لەخوێندن هەڵگرتبوو و بوو بووم بە خوێندەوارێکی باش و هەرکتێبێکی عەرەبی و تورکی و فارسی و دیوانی شیعری کەڵە شاعیرەکانی کوردم دەست کەوتبایە، بەوردی هەمووویانم دەخوێندەوەو شارەزاییەکی تەواوم ( لەئەدەبیات) پەیدا کرد. لەساڵی (١٩٥٥) ەوە بە خانەنشینی لەهەولێر دەژیم و تەمەنم ٨٧ ساڵە) (٢).

**ب- کەسایەتی شاعیر:**

بێگومان ژینگە دەورێکی کاریگەر لەدەست نیشانکردنی سیمای کەسایەتی و زیرەکی ئەندامانی ناو کۆمەڵ دەبینێ (٣) دیارە هەر بنەماڵەیەکیش خاوەن پەیام و داب و نەریتی تایبەتی خۆیەتی، نەخاسمە ئەو بنەماڵانەی کەلە مەیدانی زانست و رۆشنفکریدا جێی پەنجەیان دیارە. سەبارەت بە (مامۆستا ناسیح) ەوە دەبینین کە بنەماڵەکەو ئاستی زانست بەرزی باوک و براکەی (سەعید حەیدەری) و خاڵی (ئیبراهیم حەقی حەیدەری) تا رادەیەکی باش کاریگەرییان بەسەریدا هەبووەو رۆڵێکی هەست پێکراویان لەدارشتنی کەسایەتییەکەیدا بینیوە.

مامۆستا ناسیح ڕێچکە ئەدەبیەکەی گرتووەو، زیاتر لەبواری شیعریدا بەهرەمەند بووە، بەڵام لەهەمان کاتدا بایەخێکی تایبەتی بەمێژووی کوردستان و بەرەچەڵەکی بنەماڵە هەولێرییەکان داوە، بەتایبەتی بنەماڵەی حەیدەریان، لەم بارەیشەوە گەلێ زانیاری دەگمەن و سوود بەخشی کۆکردبۆوە. ئەویش بە سوود وەرگرتن لەپیاوە بەساڵاچووەکانی سەردەمەکەی و سەرچاوەو دەستنووسی جۆراو جۆر. شیاوی باسیشە خاوەنی بیرێکی تیژو حافیزەیەکی بەهێز بووە، ئەم خەسڵەتەی تا دوا ساتەکانی ژیانی لەدەست نەدابوو.

کاک مومتاز حەیدەری دەڵێ: «شاعیر لەژیانیدا تەواو ئاگاداری دەورو بەری خۆی و مێژووی بنەماڵەکان بوو، بۆ نموونە: - دەیزانی چەند بنەماڵە لەهەولێردا هەبوو... کێ هاتووە و کێ ڕۆیبوە!.. چەند (متصرف) هاتووە، زاناو مەلاکان کێ بوون؛ بنەماڵە ئاینیەکان کێ بووینە... وە ئەو ڕووداوانەی کە لەواقیع دا دیبووی لەبەری بوو، هەندێکیشی بەشیعر تۆمار کردووە، وەک:-

ئەمە باسێکە دەیکەم بەتەواتر
وەکو بیستوومە لەبیست کەس زیاتر

سەلیم ئاغا بەگوڕجی شوهرەتی بوو
لە ئاغای هەولێری بەقووەتی بوو

**نادر ئاغاش هەبووە ئازاو بەدەنگ**
**خاوەنی قونیان، جەلیل و مەیتەر بەگ**

هەبوو خزمانی لەبەینیان هەر بەژن(٤)
سەلیم ئاغاو نادر ئاغای زۆر مەزن

هتد..

هەروا بەبۆنەی مردنی کەسایەتی دیارو

نوسەکانی کۆمەڵێک شیعری لاواندنەوەی نووسیوە. تیایاندا بەپێی سیستەمی حروفی ئەبجەدی» مێژووی وەفاتیانی تۆمار کردووە، وێرای ئەمەش ئەو ڕووداوانەی لە سەردەمی ئەودا لەئەستەمبوڵ یا لەبەغدا یا لەشوێنەکانی دیکە ڕوویان دابوو، لەیادیدا نەقش کرا بوون، بەڵام بەداخەوە تۆماری نەکردوون تەنها بەقسە لە دیوەخانەکەیدا بۆ میوانەکانی دەگێڕانەوە. (٥)

**ج- بنەماڵەی حەیدەریان و ڕۆڵی ئایینی و کۆمەڵایەتیان:-**



ئەگەر چاوێک بەمێژووی بنەماڵەی حەیدەریاندا بخشێنین ئەوا دەبینین هەر لەحەیدەری یەکەمەوە، چەندین مەلاو زانای ناوداریان لێ هەڵکەوتووە؛ کە خاوەنی فیکرو مەعریفەتێکی بێ مەودا بوون بۆ نموونە:- ئیبراهیم حەقی حەیدەری زادە کەدوای جەنگی یەکەم گەیشتبووە پلەی«شیخ الاسلام» خاڵ و ئامۆزای شاعیرمانە.

عەبدوڵلا ئەفەندی حەیدەری باوکی مامۆستا ناسحیش پیاوێکی خاوەن پلەو پایە بووە، ماوەیەک لە(جزیرەی-بۆتان) قازی بووە، بەداخەوە لەتەمەنی گەنجیدا لەساڵی (1910)کۆچی دوایی کردووە، دوای وەفاتی ، ناسیح حەیدەری و سەعیدی برای گەڕاونەتەوە بۆ شاری هەولێر.

سەعیدی براشی وەکو باوکی لەتافی لاویدا لەساڵی 1918ز کۆچی دوایی کردووە کە ئەو کاتە لەتەمەنی 22-23 ساڵان دا بووە. (6)

حەیدەری یەکەم بەگەورەترین زاناو پێشەوای ئایینی لە کوردستانی عوسمانی و جیهانی ئیسلامیدا دەژمێرێ، ئەو زاتە مەزنە مامۆستای تایبەتی سولەیمان بەگی میری سۆران و خانزاد خانی خوشکی بووە، لەهەزارو ئەوەندە ساڵەی ساڵنامەی هیجری لە هەریر کۆچی دوایی کردووە، دوای ئەو ئەحمەدی کوڕی کە ناودار بووە بە(ئەحمەد بەینە لحەیدەرەین) لە شوێنی دا دانیشتووە، دوای ئەویش حەیدەری دووەم هاتووە، ئینجا ئیبراهیم حەیدەری جێی گرتووەو تا ئەو حەلە زانایانی حەیدەری لە(هەریر) بوون، پاشان بنەماڵەی حەیدەریان هاتنە(ماوەران)ێ(۷)

**ماوەران:** گوندێکی نزیک شەقڵاوەیەو سەر بە پارێزگای هەولێرە، شوهرەتێکی لەم سێسەد ساڵەی دوواییدا هەبوو ئەویش لەسایەی بنەماڵەی حەیدەرییان، کەوا بنکەی ڕووناکبیرانی ئایینی بووە، دەیان قوتابی زانست و فەقێ و مەلای ناودار ڕوویان تێدەکرد بۆ فێربوون لەقوتابخانە ئایینی یەکان و لەسەر دەستی زانا بەناوبانگە حەیدەرییەکاندا، لەو قوتابخانانەداسەدان کتێب و دەستنووسی بەنرخی دەست دەکەوت، بەڵام بەداخەوە لەدوای داگیرکردنی کوردستانی خواروو لەلایەن ئینگلیزەوە، سووتان و لەناوچوون، هەروەها کتێبخانە بەناوبانگەکەی ماوەرانیش سوتێنرا. (۸)

مامۆستا ناسیح فەرموویەتی: لەسەردەمی ئیبراهیم حەیدەری دووەمدا، بنەماڵەی حەیدەرییان هاتوون بۆ گوندی (ماوەران) ی سەربەشەقڵاوە و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوەو کردوویانە بە بنکەیەکی ئایین و زانست فێربوون، فەقێو مەلای زیرەک و ناودار لەهەموولایەکی کوردستان و دەرەوەی کوردستانیش ڕوویان تێکرد، وردە وردە

ئەو گوندە گەورە بووە تاكو بووە بە گوندێكی فراوانی بەهات و بات و مەدرەسەو مزگەوتی گەورەی لێ بنیات نراو گەلێ زانای ناوداری وەكو مەلا عەبدوڵلای بێتوشی (١٧٤٦-١٨٠٧) رویان تێكردووەو لەكانیاوی ساردو سازگاری زانستی عەقلی و نەقلی ئەو مێرە دێیە سوودمەند بوون و لەدوای ماوەیێكی دیكەش شاعیرو زانای كوردی وەكو (نالی ١٨٠٠-١٨٧٣) رویان لەماوەران كردووە. (٩) .

د - بنەماڵەی حەیدەری لە بەغدا:

لەبەر شەڕ وشۆڕی ناخۆیی میرەكانی كوردستان لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم، هەندێ لەزانا گەورەكانی بنەماڵەی حەیدەریان ناچار دەبن (ماوەران) جێ بهێلن، روو لە شاری بەغدا بكەن لاییێكی وڵاتی موسلمانان ناو بانگیان بڵاوببێتەو. لەم بارەیەوە مامۆسا ناسیح فەرموویەتی:

«یەكەمین زانا لە بنەماڵەی ئیمە چووبێتە بەغدا و لێی نیشتەجێ بووبێ (سەبغەتوڵلای گەورەی كوڕی ئیبراهیم كوڕی حیدەری دووەم» بووە كە لە نێوان ساڵانی ١١١٤ - ١٢٠٠)ی هیجری بەرامبەر (١٧٠٢ - ١٧٨٥) زاینیدا ژیاوە.

لە بەغدا هەمدیسان مەلا عەبدلڵای بێتووش مەلا مەحموودی برای، سەبغەتووڵلای مامۆستایان دەدۆزنەوەو لە خزمەتیدا خوێندنیان تەواو دەكەن، لەگەڵ (مەلا جەرجیسی ئەربیللیدا كە لەساڵی (١٧٩٢) كۆچی دوای كردوە، ئیجازەی عیلمی لەو زاتە وەردەگرن (١٠).

شارەزا لەزاری مامۆستا ناسیح دەگێرێتەوە كە سەفەوییەكان جلەوی حوكمڕانی ئیرانیان گرتە دەست، داوایان لە خەڵك و زانایان كرد كە یان ئەوەتە ببنە شیعە مەزهەب، یا ئەوجێگەیە بەجێبێڵن، ئەوە لە دەوری حەیدەری یەكەم بوو كە لەناوچەی (ئەردەبیل) دەژیا. جا حەیدەریەكان ناچار بوون جێگاكەیان بەجێ بهێلن و هاتنە ژێر سێبەری عوسمانلی سوننی مەزهەب(١١) كە مەلا گەورەكانی سوننەیان دەپاراست.

هەرچی ئێرانیش بوو (مەزهەبی (شیعە) یان پەیڕەو دەكرد، كە مەسەلەی ململانێی نێوان سوننە و شیعە بوو، جا لەوەوە هاتنە كوردستانی عوسمانی (عێراقی)، كە یەكەم جار لە (هەریر) دابەزین، یەك لەوانە باپیرە گەورەیان حەیدەری دووەمە یان (ئەحمەد بەینەل حەیدەرەین) ە كە دەبێتە مامۆستای خانزاد خانی سۆران كە ئەو دەرسی پێ گوتیە و ئەو لەهەریرێ بوو كە (ئەو كات) پایتەخت بوو (١٢)، دوایی ئەمارەتی سۆرانیان گواستەوە بۆ رەواندوز لەدەوری (محەمەد پاشا)، جا پاشان لە هەریرێ هاتنە گوندی (ماوەران) ماوەران بووە گوندێكی زۆر گەورە، لەم گوندە بنەماڵەی حەیدەریان تەدریساتیان دەكرد ،وەك سبغەتووڵلای گەورەو عوبێدوڵلا ئەوانە لەماوەران تەدریساتیان دەكرد(١٣).

پاشان زانیان كەناخۆشی لەنێوان میرەكانی كورد هەیە (سۆران و بابان)كە سۆران ناوچەی رەواندوزو هەولێر، بابانیش لەناوچەی سلێمانی و هەتا كۆیە جاربەجار دەكشانەوە لەبەر ئەو شەڕو كوشتارەی وازیان هێناو بەشێكیان هاتنە هەولێرو بەشێكیان چوونە بەغدا(١٤).

كەواتە حەیدەری یەكان لەچوار شوێن ژیاون، بێجگە لە ئێران (كەلە ئێران هاتن) چوونە (هەریر) دوایی لە(ماودران) پاشان (هەولێر)، دوایی(بەغدا)، كەسایەتی زۆر گەورەیان كەوتنە بەغدایێ وەك:-

سیغەتوڵڵاو ئیبراهیم فەسیح حەیدەری ، ئەوەی ئەو کەسایەتیانە کەوتنە ئەوێ دوایی چەند کەسایەتییەکی تر هاتنە هەولێرو ئێستاش گۆڕستانی بنەماڵەکەیان لەهەولێرە لە پاڵ مزگەوتی شێخەڵلایە، لەپێشەوە وا دەزانی خانووەو ماڵە، بەڵام کە دەچییە ناوی دەبینی قەبرستانی کەسایەتییەکانە. (١٥)

بەپێی قسەکانی مامۆستا کەریم شارەزا کە لەمامۆستا ناسیح حەیدەرییەوەی بیستووە، پێدەچێ کە خانەوادەو بنەماڵەی حەیدەرییان لەسەردەمێکی زۆر زووەوە هەڵکەوتوون و هاوشان لەگەڵ صەفەوییەکان لەسەردەمێکدا ژیاون و کێشەشیان لەنێواندا هەبووە، بۆیە ڕەچەڵەک و ڕەگ و ڕیشەیان لەهەولێریش سەری هەڵداوە، چونکە لەئەنجامی ئەو کێشەیەی کە لەنێوانیان، واتا لەگەڵ ئێران پەیدا بووە ناچاری کردوون ڕوو بکەنە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانلی.

دیارو ئاشکراشە هەر لەگەڵ پەیدابوونی بنەماڵەکەیاندا زاناو مامۆستاو مەلای گەورەیان لێ هەڵکەوتوودو ناوبانگیان پەیدا کردووە، بۆیە دەتوانین بڵێین مامۆستا ناسیح بەتەنها ناوی دیارو بەناوبانگ نییە لەناو بنەماڵەکەی، بەڵکو چەندین ناوداری تریان هەبووە بەڵام مامۆستا ناسیح زۆر بەزیرەکی و بەشێوەیەکی بەهرەمەندانە و ڕۆشنفکرانە چۆتە نێو کۆڕی شاعیرانی کورد، شیعری زۆر چاکی هۆنیوەتەوە.

### هـ- خوێندن و سەرچاوەی ڕۆشنبیری و شاعیریەتی:-

زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد



سەرچاوەی خوێندەوارییان حوجرەو مزگەوتەکانی کوردستان بووە. دیارە ناسیح حەیدەری وەکو ڕۆڵەیەکی بنەماڵەی(حەیدەری - مەلازادە) سەرچاوەی خوێندن و فێربوونی لەپاڵ قوتابخانەی میری دا . حوجرەو مزگەوتەکانی کوردستان بووە.

شایانی باسە زۆربەی زۆری مەلاو فەقێیەکانی کوردستان لەرێگەی خوێندنی مەلایەتییەوە ئاشنایەتییان لەگەڵ شیعرو ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی پەیدا کردووە. مامۆستای خوالێخۆش بوو (ناسیح حەیدەری) کەتەمەنی بووە بەشەش ساڵان هەروەکو لە سەرەوە وتمان خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی و سەرەتای خوێندن قورئانی پیرۆزی لەلای (مەلا ئەییوب) کە مەلای مزگەوتەکەی قەڵات بووە ختم کردووە * ئەو مەلا ئەییوبە باوکی دایکی مەلا شەریفی میهری یە ، ئینجا خراوەتە بەرخوێندنی میری ماوەی خوێندنەکەی لەقوتابخانەی میریدا لەساڵی(١٩١٠)ەوە تاکو ساڵی(١٩١٦) بەردەوام بووە، ئینجا لەبەر گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهان ، دەستی لە خوێندنی قوتابخانەی میری هەڵگرتوودو چۆتە مەدرەسەی ئایینی(١٦)

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ناسیح حەیدەری لەگەڵ ئەوەی کە ئیجازەی عیلمی وەرنەگرتووە، بەڵام شارەزاییەکی باشی لەزانستە ئایینییەکان و تازەکاندا پەیدا کردووە، ئینجا وردە وردە خۆی خزاندۆتە نێو دنیای شیعرو ئەدەبیاتەوە لەم بوارەدا گەیشتۆتە پلەو پایەیەکی بەرزەوە کە لە ئەنجامدا دیوانێکی شیعری نایابی بۆ بەجێ هێشتین.

مامۆستا ناسیح چەند ساڵێک

(صــرف)و(نحــو)ی عــارەبی خــوێندووە، لە (صرف)دا(تصریف)ی مەلا عەلی و (زنجانی)و (مراح)و(کأفیە)و(إظهار)و(عوامل)ی جورجانی و (أنموذج)ی تەواو کردووە.

هەروەها لەزانستی (منطق)یشدا(فناری)و(قول أحمد)ی خوێندووە، ئەمجا لەبەر گرانی و درێژە پێدانی شەڕ بەیەکجاری دەستی لەخوێندن هەڵگرتووە.(17)

**و- ناسیح حەیدەری و ئەدەبیات:**

مامۆستا ناسیح حەیدەری هاوڕێ ی بەردەوامی ژیانی، کەخۆی پێوە خەریک کردبێت دیوانی شاعیرە گەورەو ناودارو کۆنەکانی سەردەم و قۆناغی کلاسیک بووە، زۆر بەوردی لەشیعرەکانی ئەم شاعیرە کلاسیکانە کۆڵیوەتەوەو چۆتە ناو ناخی شیعرەکانیانەوە، بۆیە ئەگەر سەیری دیوانەکەی ئەویش بکەین، دەبینین ڕێبازی ئەوانی گرتۆتە بەرو سیمای شیعری کلاسیکی هەڵگرتووەو شیعری پێ یان هۆنیوەتەوە.

شاعیر بەپێی سەردەمی خۆی زیاتر چێژی لەشیعری کلاسیکی وەرگرتووە، ئینجا پەیتا پەیتا ڕووی کردۆتە نووسینی ئەم جۆرە شیعرە، تەنها لەقاڵبی کلاسیکیدا شیعری نووسیوەو پشتی لەنووسینی (شعری ئازاد) کردووەو وەلاوەی ناوە، هەر وەکو خۆی وتوویەتی: شیعری ئازاد بەشیعر دانانێم(١٨).

مامۆستا ناسیح حەیدەری هەروەکو خۆی فەرموویەتی لەو کاتەی کەلە قوتابخانە ئایینی یەکەی قەڵات بووە، لەڕێگەی خوالێخۆشبوو (سەعید حەیدەری) براگەورەیەوە بەدنیای ئەدەب شاد بووە، ئاشنایەتی لەگەڵ شیعردا پەیدا کردووە. یەکەم جار ئارەزوو مەیلی بەرەو دنیای چوارینەکانی (خەیام) چووە جگە لە شیعرەکانی ئەو شاعیرە گەورەیە، لەکاتی خوێندنی دەرسی فارسیدا لەلای (مەلا عەبدولڕەحیمی سابلاغی) دا شیعرەکانی سەعدی شیرازی (١١٩٣ک-١٢٩١) ز لەبەر کردووە کەبەرەو جیهانی شیعری بردووە، لەدواییشدا لەڕێگەی زۆر خوێندنەوەی سەرچاوەی زانیاری هەمە جۆرەوە، بەچاکی فێری زمانەکانی عەرەبی و تورکیو فارسی بووە، جگە لەزمانی کوردی کە زمانی خۆیەتی)

لەشیعری شاعیرە ناودارەکانی کورد شیعرەکانی (نالی و کوردی و مەحوی و وەفایی و غەزەلەکانی حاجی قادری کۆیی) زۆر لای پەسەند بووە، بەتایبەتی مەستی شیعرە پڕ وردە کاریەکانی (نالی)و شیعرە ناسک و پاراوەکانی (وەفایی)بووە بۆیە هەندێ لەشیعرەکانی ئەو شاعیرە گەورانەی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی و، لەو بوارەدا سەرکەوتنێکی باشی وەدەست هێناوە.(١٩)

مامۆستا ناسیح حەیدەری لە ئەنجامی کاریگەری شیعر بەسەریداو چێژ وەرگرتن لەخوێندنەوەی شیعر و پشکنینی دیوانی شاعیرە ناودارەکانەوە، بەهرەی شیعر نووسینی لا چەکەرە کردووە، ئەمەش بۆتە هۆیەک وەک ئەستێرە لەئاسمانی بنەماڵەکەیان بدرەوشێتەوە.

هەر لەهەرەتی لاوییەوە هەرچی دیوانی شاعیرێکی بە دەست بکەوتایە، ئیتر تا نەیخوێندبایەوە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، تەنانەت زۆر جاریش لەبەریشی کردووە، جا ئەو شیعرەی کە خوێندوویەتیەوە ئەگەر غەیرە کوردیش با، واتا فارسی، تورکی، یا عەرەبی بووایە، هەر دەیخوێندەوە.

مەلا سالح حەیدەری یەكێكە لەشاعیرە ناو ون بووەكانی كوردستان، لەشاری قاهیرە پایتەختی (میسر) دا چوارینەیەكی نووسیوە، شانازی بەماوەران كردووە، چوارینەكەشی بەزمانی فارسی بووە (ناسیح حەیدەری بە دەستی كەوتووەو لەبەری كردووە)(٢٠)

ئەمەش نیشانەیەكی ترە كە ناسیح حەیدەری گرنگی بەشیعر داوەو چێژی لێ وەرگرتووە، تەنانەت بەزمانی فارسیش بووایە، بە وتەیەكی ترناسیح حەیدەری چێژی شیعر لەبەركردنیشی هەبووە، شەیدای بووە، بۆیە ئەو كۆمەڵە بەهرەیەی لا گەلاڵە بووە.

**ز- فەرمان و سەرچاوەی ژیانی:-**

ناسیح حەیدەری وەك رووناكبیرو رۆشنبیرێكی ئەو سەردەمە، لەئاستی خزمەت گەیاندن بەنەتەوەكەی و بەرێوەبردنی كاروباری، سەرەتای ژیانی بەپیشەی فەرمانبەرایەتی دەست پێدەكات و ئامانجیشی ئەوە بوو كەلێنێك ئەگەر بچووكیش بێت لەنێو دام و دەزگا حكومیەكاندا پڕبكاتەوەو ببێت بەئەندامێكی سوود بەخشی ولاتەكەی بۆ خزمەت كردنی هاوولاتیان و پێكەوەنانی ژیانێكی نوێ.

مامۆستا ناسیح، فەرمانبەرێكی لێهاتوو و دەست پاك بوو، بەهۆی فەرمانەكەیەوە چەندین شوێن و شاری كردووە.

بۆیەكەم جار لەرێی خاڵیەوە (ئیبراهیم حەیدەری شێخ الاسلام) لەدایەرەی (مالیە) دامەزراوە.(٢١)

(٣٠) ساڵ خزمەتی كردووە، ئینجا خانەنشین كراوە ، لە ماوەی ئەو سی ساڵەدا تەنیا لەشوێنێك و لە دائیرەیەك دا كاری نەكردووە بەڵكو لەشارەكانی (سلێمانی و كەركووك)یشدا كاری كردووە.

كەحكومەتی عێراقی لەسەرەتای بیستەكانی سەدەی بیستەم دا دامەزرا، كوردستانی باشوور بەو حكومەتەوە لكێنرا، ناسیح حەیدەری بۆیەكەم جار بەنووسەری دادگای (سولحی كەركوك) دامەزراوە، لەساڵی (١٩٢٦)دا گوێزراوەتەوە بۆ هەولێر، لەساڵی ١٩٣٠ دا كراوە بە (نووسەری یەكەمی دادگای بیدائەی هەولێر) لە دواییدا بووە بە (كاتبی عەدلی هەولێر) لەهەمان كاتیشدا فەرمانبەری تەنفیزو فەرمانبەری قاسیرینیش بووە.(٢٢)

لەساڵی ١٩٣٤دا گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی و هەمان فەرمانی بینیوە، تاكو ساڵی ١٩٣٧ لەوێ بەردەوام بووە، ئینجا گوێزراوەتەوە بۆ هەولێرو لەدواییدا لەساڵی ١٩٥٠ بووە بەفەرمانبەری تەنفیزی كەركوك و شەش مانگی لێ ماوەتەوەو ئەمجا گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر، تاكو لە ساڵی ١٩٥٥ دا خانەنشین كراوە. (٢٣)

وەك بەرنامەیەكی رۆژانەی شاعیریش دوای ئەوەی كاتی دەوامی تەواو بووەو هاتۆتە ماڵەوە، ئیتر لەبەر خۆشخوانی و قسە خۆشەكانی دیوەخانیان لێی چۆڵ نەدەكرد، هەروەكو كاك مومتاز حەیدەری دەڵێ: «ناسیح حەیدەری دیوەخانی هەردەم ئاوەدان بووە، دیوەخانی جارانیش وەك دیوەخانی ئێستا نەبووە؛ هەموو كەسێك تیایدا ئامادە دەبوو، بەشێكیان رۆشنبیرو قسەزان و مەلاو فەقێ و نووسەرو گەلێك پیاو ماقوڵی تری تێدا میوان بووە، وەكو بڵێین جۆرە یانەیەك بووە قسەی خۆش و نوكتەو حیكایەت و شیعرو هونەری دیكەی تێدا باس دەكرا»(٢٤).

هەروەها شاعیر لەپاڵ ئەوەی فەرمانبەر بوو، شارەزاییەکی زۆری لەبواری فەلاحەتی و دەغڵ و دان دا هەبووە، هەروەکو م. کەریم شارەزا دەڵێ:- (ماموستا ناسیح شارەزاییەکی زۆری دەربارەی فەلاحەتی و دەغڵ و دان و هەموو ئەو کەرەستەو ئامێرانەی کەبەکاردەهاتن ناویانی دەزانی) (٢٥) چونکە خاوەن زەوییەکی زۆر بوو بۆیە پەیوەندی بەبەروبوومی بەفەلاحەکان هەبوو.

لێرەشدا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر دیوانەکەی دەبینین لەپاشکۆکەی بەشێکی بچووکی تەرخان کردووە بۆ ئەو ئامێرو کەرەستانەی کەبۆ فەلاحەتی بەکاردێن دەستنیشانی کردوون وەک: (هەوجار، گاسن، نیر، کۆیەلان، داس، شفرە، بەن قادە، گوریس.... گەلێکی تر). (٢٦)

**ح - دۆست و برادەرەکانی:-**

ماموستا ناسیح حەیدەری یەکێکەلەو پیاوانەی کەزۆر ئارەزووی هاورێیەتی کردووە، لەبەر ئەوەی کەبەخۆشی پیاوێکی خۆش مەعشەرو خۆش گۆ و زیرەک بووە، خەڵک دەچوونە خزمەتی، ئەویش هاموشۆی دۆست و برادەرانی کردووە، پەیوەندییەکی تایبەتیشی لەگەڵ بنەماڵە دیارەکانی سەردەمەکەی هەبووە.

وەک لەدێرەکانی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کرد کەشاعیر بەهۆی وەزیفەکەیەوە چەندین شوێن گەڕاوە ، بەم هۆیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ چەندین نووسەرو شاعیرو ئەدیبی ئەم شارانەشدا پەیدا کردووە، سوودی لێ بینیون و ئەوانیش سوودیان لێ بینیوە، ئەوانەی کە ناسیویانە زۆریان خۆشویستووەو رێزیان لێ ناوە، هەروا لەبەرئەوەی بەخۆی چێژی شیعری هەبووەو حەزی لێ کردووە بۆیە هەمیشە لەخاوەن بەهرەو شاعیرو نووسەران نزیک بۆتەوە.

ئاشکرایە کەجگە لە هەولێر، لەهەردوو شاری کەرکووک و سلێمانیشدا دۆست و برادەری هەبووە. هەولێر چونکە شاری خۆیەتی، زیاتر خەڵکانی هاوشانی خۆی ناسیوەو لەگەڵیاندا ژیاوە، لێرەدا دەتوانین بڵێین دۆستی دڵسۆزی خوالێخۆش بووان جەبار ئاغای دۆغرەمەچی - کانی (١٨٩٨ - ١٩٥٨) و مەلاشەریفی میهری (١٩٠٣ - ١٩٤٢) و شێخ جەلال شێخ جەمیل نەقشبەندی (نووری) و سەید ئیبراهیم هۆشیار (١٩١٧-١٩٩٦) و بورهان جاهید (١٩١٨-١٩٩١) و رەشاد موفتی (١٩١٥-١٩٩٢) و حوزنی موکریانی(١٨٩٣-١٩٤٧) (٢٧) و گیوی موکریانی بووە، هەروەها لەگەڵ شاعیرە گەنجەکانیش وەک دڵدار کە خاوەنی شیعری (ئەی رەقیب) ە (٢٨)سەرەڕای ئەمەش ئاشنایەتییەکی رێک و پێکی لەگەڵ خوالیخۆشبووان مەلا ئەفەندی (١٨٦٧-١٩٤٢) و شێخ مستەفای نەقشبەندی (کمالەددین) و عەبدولرەزاق ئاغای عوزێری و عەلی پاشای دۆغرەمەچی و عزەدین مەلائەفەندی و داودئاغای یەعقوبی و موحسین ئاغاو موسا رەشید ئاغا و نورەدین ئاغاو حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حەداد و حاجی عوسمانی باوکی حاجی حەیدەر و م. عزەدین فەیزی و عەبدوڵلا فەیزی ئەفەندی باوکی و حاجی حوسێن حاجی مستەفا دەباغ و مەلا ساڵح دەباغ و ، زۆربەی ئاغاکانی دزەیی و گەردی و سیاسەتمەداران وەکو پارێزەر عەونی یوسف (٢٩٠٨ - ١٩٨٦) و شێخ ئەحمەد عەبدولقادر نەقشبەندی و ماموستا جەودەت ئەحمەد ناجی..

سەبارەت بە خوالێخۆش بوو ئیبراهیم حەققی ئەفەندی حەیدەری زادەوە (١٨٦١-١٩٣١) کە (شێخ الاسلام )بووەو پاشان لە بەغدا وەزیری ئەوقاف و سەرۆکی یانەی سەرکەوتن بووە، پەیوەندییەکی زۆر تایبەتی هەبووە، ئەم زاتە خاڵی مامۆستا ناسیح حەیدەری بووە، لەمەقامیدا دەیان زاناو شاعیری گەورەی عێراقی ناسیوە وەکو زەهاوی. (٢٩)

مامۆستا حەیدەری لەدوا سالانی ژیانیدا ئاشنایەتی لەگەڵ چەندین روناکبیردا پەیداکردووە، لەوانە مامۆستا کەریم شارەزا کە زۆر هاموشۆی کردووە، یەکێکە لەوانەی کەلە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا زۆری لە سەر نووسیوە، ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا سوودمان لێی وەرگرتووە.

ئەوەی راستی بێ مامۆستا کەریم شارەزا کە ناسیوویەتی کردووەو، بۆ ماوەیەکی کورتیش بووبێ بەهەلی زانیوەو زانیاری جۆراو جۆری لێ وەرگرتووە هەروەکو خۆی دەڵێ:- (من یەکێک بووم لەو کەسانەی کەدەچوومەلای و هەر جارەی کە دەچوومە لای لەگۆڤاری (کاروان)و (رۆشنبیری نوێ) دا وتارم لەسەری بلاو دەکردەوە، کەزانی من واحەزم لەقسەکانیەتی و جدیم بۆ بلاو کردنەوەیان، خۆی بە دوای من دا دەینارد و دەیگوت: (کەتۆ قسەم بۆ دەکەی و شتم بۆ دەخوێنییەوە دڵم زۆر پێ خۆشدەبێ و زۆرم خۆش دەویی) (٣٠).

لەدوا ساتەکانی ژیانی، واتە لە ٨٥-٨٦ ی تەمەنی توانای پێشوازی کردنی کەسی نەمابوو، بەڵام کە خێزانەکەی دەیگوت مامۆستا کەریم شارەزایە ناسیح حەیدەری دەیوت بابێتە ژوورەوە، تەنانەت ئەگەر نەخۆشیش بایە هەر دەچوومە لای، کە دەچوومە لای قسەی زۆر خۆشی بۆ دەگێرامەوە. (٣١)

هەروەها نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە د. عەبدوڵلا حەداد هاورێ یەکی نزیکی شاعیرو هەروەها باوکیشی هاورێی و دراوسێی ناسیح حەیدەری بووە، بەڵگەش بۆ ئەمە بەبۆنەی وەفاتی حاجی محەمەدی باوکی د.عەبدوڵلا حەداد شیعری لاواندنەوەی نووسیوە (٣٢):

لاواندنەوە بۆ کۆچی دوایی (حاجی محەمەد مەلا ئەحمەدی حەداد):

**مونزەوی گۆشەی عیبادەت، زۆر وەفی و تەبعی کەریم**
**حاجی محەمەد بوو ئەمرۆ رۆیی بۆ (دار و لنەعیم).**
**زۆر دراوسێکی بەنرخم بوو، مەردێکی جەننەت مەکان**
**کارو کرداری پەسەند و خۆش خولق و رووبەسیم**
**تا دەڵێ:**

تا بڵێ ی مولزەم بوو بەوەعدی زۆر بەدین و موحەتەرەم
و موعینی بێ نەواو بێ کەس و لات و سەقیم
ئینجا دەڵێ:
گەر کەسێ لێت پرسی لە تەئریخی وەفاتی (این فقید)
پێی بڵێن نووسرا بەقەلبی پڕ لە ئالام و ئەلیم (غفر الله)لەو تەئریخی وەفاتی بوو بەلام، کەئیزافەی کەی بەسەریا حەرفی (ها)و (یا)و (جیم).

**(دیوان. ل (١٧١-١٧٢)**

**سەرنج**

رستەی (غفر الله) +ە+ی+ج بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (١٣٩٩) هیجری واتە (١٩٧٩)

زایینی کەساڵی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەد مەلا ئەحمەدی) ناودار بەحاجی مامەند ئەوەی راستی بێ، لەرێگەی د. عەبدوڵڵا حەدادەوە، کەریم شارەزاو د. موحسین محەمەد حوسێن و زوبێر بلال ئیسماعیل و کاک ئازاد عەبدولواحیدو کاک محسن ئاوارە ئاشنایەتیان لەگەڵ مامۆستا ناسیح پەیداکرد.

**ط/ کۆچی دوایی ناسیح حەیدەری :**

دوای هەموو ئەو ژیانە پڕ لە خزمەت کردن و خەم خواری و دڵسۆزی و هاورێیەتی و وەفادارییە، دوای ئەو خزمەتەی بەشیعر و ئەدەبیاتی کوردییە، ناسیحی شاعیرو مێژووناس لەساڵی (١٩٨٦) لەشاری سەرکەشی هەولێر و لەتەمەنی ٨٨ ساڵیدا ماڵئاوایی لەدنیای شیعرو شاعیران و بنەماڵەو خێزانەکەی کردو دڵە ماندووەکەی لە لێدان کەوت و لەگۆڕستانی حەیدەریان لەپاڵ ئارامگەی (شیخەڵڵا) تەرمە پیرۆزەکەی بەخاک سپێردرا.

هەر چەندە تەمەن درێژی کاری کردبووە سەر رەنگ و روو و سیمای مامۆستا ناسیح حەیدەری بەڵام بەهیچ جۆرێک کاری لەبیرو زەینی نەکرد بوو هەرچەندە چاوو دەنگی کزبوون بەڵام مێشک و هۆشی هەر تیژو بەکاربوون، کاردساتی زەمانەو جگەر سووتانی بەکۆچی دوایی کوڕە گەورەکەی لە ئاوارەییدا هیچیان لەمێشک روونی و بیرتیژی کەم نەکردبۆوە. (٣٤) ژیانی پڕ شکۆمەندی شاعیر بووە مایەی ئەوەی کە ماڵئاوایی کردنەکەی ببێتە رووداوێک لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا، ژمارەیەکی زۆر لەرۆشنبیرانی سەردەمەکەی فرمێسکی دڵسۆزی و خەم خۆریان بۆ رشت.

جا بۆ ئەوەی ناوی هەمیشە بەزیندوویی بمێنێتەوە لەساڵی ٢٠٠٠ دیوانە نایابەکەی لەلایەن پارێزەرو پەرلەمانتار کاک شێروان حەیدەری یەوە لەچاپ درا، ئەم هەنگاوە بووە هۆی ئەوەی، نەوەندی رۆشنبیری کوردی، پتر ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا بکات.

***

**پەراوێز:**

١- دیدار لەگەڵ د.عەبدوڵڵا حەداد: هەولێر، کۆلیجی پەروەردە، بەشی کوردی، سەعات ٩:٤٠، ٢٠٠٠/١٢/١٩ سێ شەممە.

٢. کەریم شارەزا: هەندێ لەبیرەوەری و زانیارەکانی ناسیح حەیدەری، گ. رۆشنبیری، ژ، (١٠٨)ساڵی ١٩٨٥، لا ٢١٦.

٣- دیدار لەگەڵ م. کەریم شارەزا: هەولێر، رۆژنامەی برایەتی، سەعات، ١٠:٣٠تا٢٠٠١.١.١٥ دووشەممە.

٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاک مومتاز حەیدەری: هەولێر، سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، سەعات ١١ر٠٠، ٢٠٠٠.١١.١٦ پێنج شەم.

٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ رێزدار شێروان حەیدەری : هەولێر ، سەندیکای- پارێزەرانی کوردستان، سەعات ١٠:٣٠، ٢٠٠٠/١١/٩ پێنج شەممە.

٦- د. عەبدوڵڵا حەداد: هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیجی پەروەردە بەشی کوردی، سەعات٩.٥، ٢٠٠٠/١٢/٢٤ یەک شەم.

٧- کەریم شادزا: هەندێ لەبیرەوەری و زانیارییەکانی ناسیح حەیدەری

. گ. رۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٨)، ساڵی ١٩٨٥، لا ٢١٦-٢١٧.

٨- د. عماد عبدالسلام رؤف: مراکز ثقافیە مخمورة فی کردستان، جمهوریە العراق وزارة

الثقافة والاعلام دار الثقافة والنشر الكردية، التسلسل (٣١٠)، بغداد . ١٩٩٧.

٩- کەریم شارەزا: هەندێ لەبیرەوەری و زانیارییەکانی ناسیح حەیدەری، گ رۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٨) ساڵی ١٩٨٥لا ٢١٧.

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١- چاوپێکەوتن لەگەڵ م. کەریم شارەزا: هەولێر، رۆژنامەی برایەتی، سەعات٩.٥، ٢٠٠١/١/٨ دووشەم

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٦- کەریم شارەزا: ناسیح حەیدەری شاعیر. گ کاروان، ژ(٣٢)، مایسی ١٩٨٥ ساڵی سێیەم لا٢٥-٢٦.

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاک مومتاز حەیدەری: هەولێر سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، سەعات ١١.٠٠، ٢٠٠٠/١١/١٥ پێنج شەم.

١٩- کەریم شارەزا: ناسیح حەیدەری شاعیر، گ کاروان، ژ(٣٢) مایسی ١٩٨٥ ساڵی سێیەم، لا ٢٦.

٢٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاک مومتاز حەیدەری: هەولێر، سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، سەهات ١٠:٤٠، ٢٠٠١/٣/٥ پێنج شەم.

٢١- د. عبدالله حەداد: هەولێر، کۆلیجی پەروەردە، بەشی کوردی کات ١٠.٠٠، ٢٠٠٠/١٢/٢٤ یەک شەمە.

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٣- کەریم شارەزا: ناسیح حەیدەری شاعیر، گ کاروان، ژ(٣٢)، ساڵی مایسی ١٩٨٥ ساڵی سێیەم لا (٢٦).

٢٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاک مومتاز حەیدەری: هەولێر، سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، سەعات ١١.٠٠، ٢٠٠٠/١١/١٦ پێنج شەم.

٢٥- چاوپێکەوتنی لەگەڵ م. کەریم شارەزا: هەولێر، رۆژنامەی برایەتی سەعات ١٠.٠٠ ٢٠٠١/١/٨ دووشەم.

٢٦- دیوانی ناسیح حەیدەری ٢٠٠٠، لا٢٦٦-٢٦٧ ئامادەکردنی شێروان حەیدەری هەولێر.

٢٧- دیدارێکی کورت لەگەڵ د. عبدالله حەداد: هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیجی پەروەردە، بەشی کوردی، سەعات ١٠.٠٠، ٢٠٠١/١/٧ یەک شەم.

٢٨- هەردوو دیداری مامۆستا کەریم شارەزاو مومتاز حەیدەری: هەولێر، رۆژنامەی برایەتی، سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، ٢٠٠١/١/١٥، دووشەمە، ٢٠٠٠/١١/١٦ پێنج شەم.

٢٩- دیدار لەگەڵ د. عەبدوڵلا حەداد: هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیجی پەروەردە، بەشی کوردی سەعات ١٠.٠٠ ٢٠٠١/١/٧ یەک شەم.

٣٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ م. کەریم شارەزا: هەولێر رۆژنامەی برایەتی، سەعات ١٠.٠٠، ٢٠٠١/١/٨ دووشەم.

٣١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٣- شێروان حەیدەری: دیوانی ناسیح حەیدەری، لا١٧٢.

٣٤- کەریم شارەزا: هەندێ لەبیرەوەری و زانیارییەکانی ناسیح حەیدەروی ، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٨) ساڵی ١٩٨٥، لا ٢١٦.

# هۆکارەکانی گەشانەوەی ژیانی زانستی لە هەولێر لە سەدەی شەشەم تا نیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی زانستە ئاوەزیەکان

## زانستە تەجریبیەکان

ئومێد جۆزەلی

**زانستە تەجریبیەکان لەلایەن زانایانی هەولێر بایەخێکی زۆری پێدراوە، قورئانی پیرۆز داوای کردووە کە مرۆڤ لەئەنجامی بیرکردنەوە لەدروستبوونی ئاسمان و زەوی زۆر لەنهێنی دیاردە زانستیەکانی بۆ بەدیار دەکەوێت، ئەمە بووژانەوەیەک بوو بۆ رزگارکردنی ئاوەزی مرۆڤ لە وەهم و بتپەرستی و کاریگەریەکی زۆریشی بەسەر موسڵمانانەوە هەبوو تالەو دیاردانە بکۆڵنەوە، موسڵمانەکان بەشێوەیەکی زانستی لەزۆر بواردا بەشداریان تێداکرد. پزیشکی و ماتماتیک و گەردوون ناسی و کیمیا لە گرینگترین ئەو زانستە تەجریبیانە بوون کە موسڵمانەکان لەبواری توژینەوەو تاقیکردنەوە بایەخیان پێدان. (١)**

هەولێر لەو زانستانە بەدوور نەبووە بەڵام ئەگەر لەگەڵ زانستەکانی شەرع و زمان ناسی و ئەدەبیات بەراورد بکرێت ئەوا کەمتر بووە.

ئێستاش باس لە گرنگترین ئەو زانستە تەجریبیانە دەکەین:

### ١- پزیشکی:

بیمارستان شوێنی سەرەکی توژینەوەو چارەسەری دەروونی بوو، بەزۆری قوتابخانەکان لەتوژینەوەی ئەو زانستەدا بەشداریان دەکرد، لەهەولێردا چەند دامەزراوێک هەبوون خزمەتی ئەو بوارەیان کردووە، ئەو بیمارستانەی کەسوڵتان موزەفەر کوکبوری دروستیکرد باشترین کاریگەری بەسەر تەندروستی گشتی کۆمەڵگەوە هەبوود، نەخۆش روویان تێ دەکردو سوڵتانیش سەردانی دەکردن و لەهەواڵی دەپرسین و پێویستەکانی دابین دەکردن. (٢)

یەکێک لەبەڵگەکانی بایەخدانی سوڵتان موزەفەر بەنەخۆشان ئەوەبوو کەرایسپارد چارەسەری شێخ ئەبو محەمەد عەبدولەتیف ئەبی نەجیب(٣) عەبدولقاهیر عەبدوڵلا

مـحـەمـەد عـەبدوڵلای شـەهرەوەردی بکرێت کـەتووشی چەند نەخـۆشـیـەک هاتبـوو، ڕووی لەهەولێـر کرد تاله ٦١٠ ک - ١٢١٣ز کـۆچی دوایی کرد. (٤)

ئەمە بەڵگەی دەوری پزیشکان پیشاندەدات و هەروەها گـەشـەکـردنی ئەو زانسـتـە لەهەولێـر بەدیار دەخـات، دیسـانەوە پەیوەندیەکـان و ئەوانەی ڕوویان لە هەولێـر دەکـرد ڕۆڵێکی گـەورەیان لەزانستی پزیشکیـدا بینی لەمانە: عـەبدولڕەحیم عـەلی ئیسـحاق شیت بیسـانی (٥) (٦٢٣ک - ١٢٢٦ز) کـەزانـای بواری پزیشکی و هەروەها شاعیریش بوو. (٦)

لەدیارترین ئەو پزیشکانەی کـەهاتوونەتە هەولێرو ماوەیەک تیایدا ماونەتەوە: ئیبراهیم ئیسماعیل محەمەد غازی عوبێدوڵلا حەرانی ناسراو بە ئیبن نەقیب بوو (٦٢٢ک - ١٢٢٥) کە لەبیمارستانەکەی سوڵتان موزەفەر لەئەهلی ئەدەب و خۆش مـەعشـەرو قسـەزان و پزیشکی چاو بوو. (٧)

هەروەها هەولێـر چەند پزیشکێکی لێ پەیدابوو کەلەم زانستـەدا ڕۆڵیان هەبوو لەمانە: ئەبو ئەحـمـەد یوسف جامـیح ئەحـمـەد مـحـەمـەد حوسێن حەسـەن ئەربلی (٦١٥ک - ١٢١٨ز) کە سـەرپەرشـتی دەرمـانخانەی بیـمارسـتـانی هەولێری دەکرد. (٨)

لێرەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە لە هەولێر پیشـەسـازی دەرمـانسـازی سـەری هەڵداوەو زانایانی هەولێر داودەرمانیان بۆ نەخۆشەکانیان دەستەبەر کردووە، جگە لەمەش موزەفەرەدین کوکبوری سوڵتانی هەولێر پیاوێکی خێرەوەمەند بووەو پارەیەکی زۆری لە دامەزراوەکانی سەرف کـردووەو بیـمـارسـتـانەکـەش بەشی خـۆی بەرکەوتووەو پزیشک وکارمەندان مووچەیان بۆ بڕا بۆوە.

لەوزانا هەولێـریانە کـە لەدەرمـانسـازی شـارەزابوون ئیسـحـاق مـەعـالی شـەمـاس هەبەتوڵلا ئیبـراهیم شـەمـاس ئەبو ئیبـراهیم ئەربلی بوو«٦١٧ ک- ١٢٢٠ز» کـە زۆر خـوێندەوارو شـارەزای دیوان و ئەندازەو پزیشکی بوو وسەرپەرشتی دیوانی «الأهراء»ی (٩) دەکـرد بەڵام دوایی لەلایەن سـوڵتـان موزەفەرەوە دەستگیرکرا چونکە پارەیەکی زۆری لەسەر بووە ماڵ تا لەبەندیخانە کۆچی دوایی کرد. (١٠)

هەروەها پزیشک عـەلی روکنەدین مـحـەمـەد عـیسـا مـەسـعـود ئەربلی کـە لە ٧١٥ ک- ١٣١٥ز کـۆچی دوایی کـردووە لەدەرمـانسـازی زۆر شـارەزا بوو، لە بەغـدا دەزگای پزیشکی بە ئاراسـتـەی قـوتابخـانەی موسـتـەنسـەریە گـرتە دەست. (١١)

لێـرە دەبێت ئامـاژە بەوە بکەین ئەو ژمـارە کەسەی لەزانایان کە ئێمە باسمان لێوە کردن بەڕای ئێمە زۆر کەمن و هێشتا هیتر ماون کە لە هەولێر خزمەتیان کردووە بەڵام لە دەرەنجام دەگـەینە ئەو ڕاستـیـەی کـەزانسـتی پزیشکی بایەخـێکی زۆری پێـدراوە بەتایبـەتی دەرمـانسـازی کـە لەبنەمـا سـەرەکـیـەکـانی پزیشکیە.

هەرتەنیـا زاناکـان بایەخـیـان بەپزیشکی نەداوە. بەڵکو ئەدیبان وشاعیرانیش شارەزای

ئەو زانستــە بوونە، تەها ئیـبراهیم ئەبی بەکر جــەمــالەدین هۆزبانی ئەربلی «٦٧٧ ک-١٢٧٨ز»ئەدیب وشاعیر بەشیعرەکانیەوە دیارە کە شارەزای زانستە تەجریبیەکان بەتایبەتی زانستی پزیشکی بووە:

یقول لی الکحال عینک قد هدت

**فلا تشتغلن قلبا علیها وظن نعسا**

**ولی مدە یاشمس لم أرکم بها**

وایە برای العین أن ینظر الشمسا (١٢)

**٢) ژمێر یاری:**

ژمێریاری لقێکی گرنگی بیرکاریە کە جگە لە ژمێریاری ئەندازەو گەردوون ناسی ومۆسیقاو پزیشکیش دەگرێتەوە، سوودەکەشی لەوەدایە کە موعامەلات رێکدەخا پارەو مولّک دەپارێزی وقەرزەکان تۆماردەکات. (١٣)

ئیبن موستەوفی دەربارەی ئەبوبەکر غەریب ئەربلی دەگێرێتەوە: لەئاین وبیرکاری زۆر ناودار بووە، خەڵک سەردانیان دەکردو لەئادابی شتیان وەردەگرت. (١٤)

لەو زانا هەولێریانە کە لە ژمێریاری شارەزابوون:

عەبدوڵلا عومەر سامیح ئەبو محەمەد ئەربلی، ساڵی ٥٧٦ ک-١١٨٠ز لەهەولێر لەدایک بووە، لەژێر فەرمانڕەوایی سولّتان موزەفەر کاری زۆرچاکی کردووە، لەژمێریاری زانابووەو شاعیریش بووە، ساڵی ٦٣٤ ک-١٢٣٦ز لەقەڵای هەولێر کۆچی دوایی کردووە، ناوبراو جگە لە ژمێریاری شارەزای زۆر زانستی دیکە بووە، ئیبن شەعار دەڵێت: لەکوڕی موتەسەریفەکان بووە، لەتەسەوف و ژمێریاری وروپێوی دا زانا بووە. (١٥)

لەبەر ئەوەی هەولێر لەشارە بازرگانیە گرنگەکانی ناوچەکە بوو و کاروانسەرای رێگا بازرگانیەکان بوو بۆیە بازاڕەکەی ئاڵوویری تێکەوت وئەمەش زیاتر پێویستی بە ژمێریاری بوو. لەلایەنی ئابووری وکۆمەڵایەتیشەوە کە بایەخ بە دابەشبوونی «ترکات»و میرات وزەکات دەدات، ژمێریاری رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەئاسانکاری ئەو ئیشانەداو هەروەها پاڵنەرێکیش بوو بۆ پەیدابوونی زانستی «الغرائض»کە ژمێریاریەکە بایەخ بەراستکردنەوەی بەشەکان ودابەشکردنی میرات وحوکمەکانی ویراسەت و وەسایەدەدات. (١٦)

لەهەولێر چەند زانایەک هەبوون کە لەزانستی «الغرائض»دا شارەزابوون لەمانە: تەها بەشیر محەمەد خەلیل ئەربلی کەلە ٥٥٧ ک - ١١٦١ز کۆچی دوایی کود، فەقێی شافعی و زاهیدو شارەزای ژمێریاری بوو، حەوت ساڵ لە حەرەمی شەریف خوێندوویەتی، لەهەولێر کۆچی دوایی کردووە. (١٧) هەروەها فەقێی شافیعی ئەبو عەباس خدر نەسر عوقەیل ئەربلی ٥٦٧ک - ١١٧١ز زۆر لە «الغرائض» شارەزابوو. (١٨) هەروەها قازی جەعفەر مەحمود هەبەتوڵلا ئەحمەد یوسف کفر عزی «٦٠٤ ک - ١٢٠٧» لەزۆر زانست شارەزابوو لەمانە «الغرائض) و ژمێریاری. (١٩)

هەروەها لە فەقێیەکانی رێبازی حەنەفی کە لە «الغرائض»و ژمێریاری زۆر شارەزا بوو محەمەد حەسەد محەمەد ئەبی حەنیفە ئەبولقەسەم ئەبی عەبدوڵلا ناسراو بە ئەلقەرەزی

ئەربلی بوو، (٢٠) ئەو زانستە تەنیا پەیوەست نەبوو بەزاناکان بەڵکو هەندێکی دیکە کەوتنە خوێندن و لێتوژینەوەی لەمانە: شەرەفەدین ئەبو بەرەکات موبارەک مستەوفی ئەربلی «٦٣٧ـ ١٢٣٩ز» مێژوونووس و ئەدیب و خاوەنی کتێبی «تاریخ اربل» خۆی و بنەماڵەکەی کاری «الأستیفاء»یان (٢١) بەئەستۆوەگرت. هەروەها محەمەد محەمەد ئەبی حەنیفە ئەلغەرزی بەغدادیش (٢٢) ٦٠٢ک - ١٢٠٥ز لە زانستی ژمێریاری و «الغرائض» زۆر شارەزا بوو.

ئیبن مستەوفی ساڵی ٦٣٤ک - ١٢٣٦ز (٢٣) رووی لەموسڵ کردو لەوێش کۆچی دوایی کردو ئەمەش لەئەنجامی داگیرکردنی هەولێر لەلایەن مەغۆلیەکانەوە□□. (٢٤)

زاناکان زۆر ئاگاداری ئەو قوتابیانە بوون کە زانستی ژمێریاریان دەخوێند، زانا ئەحمەد حوسێن ئەحمەد ئەبی مەعالی مەنسور وەسفی زانا شەمسەدین ئیبن خەبازی «٦٣٩ک - ١٢٤١ز» زمانزان دەکات کەزانایەکی هەولێری بووەو زۆر شارەزای «الغرائض» و ژمێریاری بووەو (٢٥) خاوەنی کتێبی «الفخری فی الحساب»ە.

### ٣- زانستی ئەندازەو گەردووناسی

زانستی ئەندازەو گەردووناسی پەیوەستە بە ماتماتیک و هەریەکەیان خزمەتی ئەویتر دەکەن، ئەندازە لەو زانستانەیە بایەخ بە بروهێڵ و روپێوو تەن و شێوەو گۆشە دەدات، گەردووناسیش دەروانێتە جوولەی هەسارە گەرۆک و جێگیرەکان کە ئەمەش چەندان کرداری بیرکاری گەرەکە. (٢٦) قورئانی پیرۆز هەرزوو سەرنجی موسوڵمانانی بۆ ئەم مەبەستە راکێشاوە تا لەگەردوون رابمێنن و عەقڵی خەڵک لە خورافات و پروپووچی رزگار ببێت. (٢٧)

لەوزانایانەی کەلەم بوارەدا زۆر شارەزا بوون: محەمەد یوسف محەمەد قائید موەفەق ئەربلی بەحرانی ئەدیب و شاعیری ناسراو «٥٨٥ک - ١١٨٩ز» (٢٨) کە کتێبەکەی ئیقلیدیسی (٢٩) یۆنانی شیکردەوە جگە لەبەشێک لەکتێبی «المبحطی» (٣٠) ودوایش رووی لەچەند زانستێکی دیکە کردو تیایدا داهێنەربوو (٣١).

هەروەها قازی و فەقێی شافیعی ئەبو محەمەد جەعفەر محەمەد مەحمود هەبەتوڵلا ئەحمەد یوسف کفر غزی ئەربلی «٦٠٤ک - ١٢٠٧ز» لە ژمێریاری و «الغرائض» و ئەندازە شارەزابوو. (٣٢)

زانا ئیسحاق مەعالی شەماس هەبەتوڵلا ئیبراهیم شەماس «٦١٧ک - ١٢٢٠ز» وەسفی ئەبو ئیبراهیم ئەربلی دەکات کەلەئەندازەو پزیشکیدا شارەزابووە. (٣٣)

پرۆسەی دابەشکردنی میرات و رووپێوی زەوی مەزندەی رووبەرەکانیان بوو بەهۆی سەرهەڵدانی چەند زانایەک لەمانە عەبدوڵلا عومەر سامیح ئەبو محەمەد ئەربلی. (٣٤)

زانایانی هەولێر ئەندازەیان لەبواری بیناسازیدا بەکارهێنا بەتایبەتی لەسەر دەمی ئەتابەگی کەچەندان ئەپارتمان و دامەزراویان دروستکرد، باشترین بیناساز لەوبوارەدا سوڵتان

موزەفەرەدین بوو.

باری سیاسی جێگیرو پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەڵایەتی باشترین پاڵنەربوون بۆ بەرەو پێشەوەبردنی بیناسازی. (٣٥)

باشترین بەڵگە بۆ بیناسازی ئەو سەردەمە منارەی موزەفەریەیە لەهەولێر، لەلای چەپیەوە ناوی ئەوکەسە نووسراوە کەدروستی کردووە، کەئەمەش رۆڵی بیناسازەکان لە هەولێر وەدیاردەخات. (٣٦)

زانایانی هەولێر بایەخیان بەگەردوونناسی و ئەستێرەناسی داوە، ئەو زانستە بایەخ بەمەزەندەی ژمێریاری و دووری و نزیکی دەدات جگە لەوەی شوێنی قیبلەو کاتەکانی نوێژکردن دیاریی دەکات، لەو زانایانەی کەلەم رووەوە جێگەیان دیارە: شەرەفەدین ئەبو بەرەکات موبارەک مستەوفی ئەربلی «٦٣٧ک - ١٢٩٣ز» خاوەنی کتێبی «تأریخ اربل» کەلە کتێبی «سر الصنیعه« دا باس لەئەستێرەکان دەکات. (٣٧) هەروەها ئەحمەد قرتایا عەبدوڵلا ئەبوسەنا ئەبی ودفا ئەربلی کەساڵی ١٢٠١ز - لەگوندی دەربەندی سەربەهەولێر (٣٨) هاتۆتە دنیاوەو لەئەستێرەناسی و ئەستەرلاب (٣٩) شارەزابوودو بۆ زانیاری رووی لە حەلەب و بەغدا کردووەو ساڵی ٦٥٥ک - ١٢٥٧ز مردووە. (٤٠)

ئیبن قوتی باسی زانا ئەبوعەلی ئەبی فەرح ناسراو بەئیبن داعی ئیسرائیلی دەکات کە لەساڵی «٦٥٧ک - ١٢٥٨ز مردووەو لە ژمێریاری و گەردوونناسیدا شارەزابووە. (٤١)

تەها ئیبراهیم ئەبی بەکر ئەحمەد بەختیار جەماڵەدین هوزبانی ئەربلی «٦٧٧ - ١٢٧٨ز» فەقێ شافیعی و ئەدیب و شاعیر لەئەستێرەناسیدا شارەزابووەو ئەمەش لەو شیعرەدا بەدیاردەکەوێت کەبۆ (الملک الصالح) لەقاهیرەدا هۆنیویەتیەوە:

دع النجوم لطرقی یعیش بها

بالعزیمه فأنهض ایها الملک

ان النبی واصحاب النبی نهوا

عن النجوم وقد أبصرت ماملکوا (٤٢)

لەو زانستانەی کەلەهەولێر زۆر جێگای بایەخ بوو گەردوونناسی بوو، ئیبن خەلدون واباسی دەکات کە کردەیەکی ژمێریاریە دەربارەی یاسا ژمارەییەکان و هەر هەسارەیەک بەهۆی جولانەوەی حیسابی بۆ دەکرێت، ئەم زانستە رێسای تایبەتی هەیە وەک پێشەکی و ئسوڵی بۆ زانینی مانگ و رۆژو مێژووی رابردوو. (٤٣)

پەیوەندیە زانستیەکان دەورێکی گەورەیان لەبووژانەوەی ئەو زانستەدا لە شاری هەولێردا بینیوە، کاتێک زانا موهەزەبەدین حاجیب دیمەشقی (٤٤) هاتە هەولێر لەگەڵ ئەبی شوجاع فەخرەدین محەمەد عەلی شوعەیب ناسراو بەئیبن دەهان حاسیب بەغدادی «٥٩٠ک - ١١٩٣ز» کۆبۆوەو (٤٥) دوایی رووی لەدیمەشق کرد. (٤٦)

ئەم زانیاریانە بەڵگەی ئەوەن کە گەردوونناسی بایەخێکی زۆری پێدراوەو هەروەها بەڵگەی ئەوەشن کە ئیبن دەهان دوای تەواوکردنی خوێندن لەسەر دەستی موهەزەبەدین ئینجا هەولێری جێهێشتووە، ئەو زانایە لەگەردوونناسی

،فەرائیز،بیرکاری زۆرشارەزا بووە،(٤٧)

شێخ ئەبو عومەر ئەسیرەدین ئەبهەری خاوەنی «التعلیقه فی الخلاف والزیج» لەو زانایانە بوو کە لەموسڵەوە رووی کردە هەولێر ساڵی ٦٢٥ ک-١٢٢٧ز لە- دارالحدیث - دابەزی و دەرسی وتەوەو چەندان کەسی پێگەیاند لەمانە: شەمسەدین ئەبوو عەباس بن خەلەکان ئەربلی «٦٨١ ک- ١٢٨٢ز» (٤٨).

ئەمە بەڵگەی ئەوەیە - دارالحدیث - دەورێکی گەورەی لە زانستی گەردووناسی دا بینیوە، ئیبن خەلەکان لەئیبن مستەوفی دەگێڕێتەوە کە ئەبهەری لەهەموو بوارەکاندا زانا بووە بەتایبەتی ئەندازەو لۆژیک ئەوانەی لەکتێبی ئەقلیدس و سەجتی ئاماژەی بۆ دەکرێت .(٤٩)

**٤- کیمیا:**

ئەو زانستەیە کە لەپێکهاتەکانی ماددە دەکۆڵێتەوە تا دەگاتە ئەوراستییەی کە لەبارێکەوە بۆ بارێکی دیکە بگۆڕدرێت وەک کانزاکانی گۆگردو توتیا بۆ شێوەی زێڕو زیو.(٥٠)

ئەو زانستە لەسەردەمی هۆزبانیەکان لەهەولێر پەرەیسەند، عەمید فەخرولکتاب ئەبا ئیسماعیل حوسێن عەلی محەمەد عەبدولرەحمان ناسراو بە توغرائی ماوەیەک لەهەولێر وەزارەتی بەدەستەوە بووە (٥١)، ئەو زانایە لەشیعرو کیمیا (٥٢) شارەزا بووەو لە کتێبە دیارەکانی «الجوهر النظیر فی صناعه الاکسیر»و«جامع الاسرار»و«تراکیب الأنوار»و«مفاتیح الرحمه»و «مصابیح الحکمه»و«حقائق الأستشهادات فی الیکمیاء»٣(٥)، ئەو زانایە وەزیفە وەزیریەکەی خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری لەهەولێردا خستەگەڕ.

لێرەدا بەدیار کەوت کە زانستی کیمیا لای خەڵکی هەولێر بەرەواج بووەو سوڵتان موزەفەریش زۆر بایەخی پێداوە(٥٤).

دیارترین ئەو زانایانەی کە بۆ ئەم زانستە روویان لە هەولێر کردووە: محەمەد عەلی ئەحمەد محەمەد ئەبو عەبدوڵلا شەقانی خەڵکی حەلەب، ئیبن شەعار سەبارەت بەو زانایە لە زمانی ئیبن مستەوفی دەگێڕێتەوە: زانایەکی ناودارو بەهزری خۆی پەرەی بەکیمیادا.(٥٥)

تا ئێستا دەقی وامان لەبەردەست دانیە کە زیاتر باسی زانا هەولێرییە کیمیا ناسەکانی بکات جگە لەوەی ئیبن فوتی لە زمانی ئیبن مستەوفی وا دەگێڕێتەوە: کە زانا موختەسەدین ئەبو ئیسحاق ئیبراهیم محەمەد ئیبراهیم شارەزایی لەو زانستەدا هەبووە.(٥٦)

**٥- فەلسەفە و لۆژیک.**

وشەی فەلسەفە لە یۆنانی«فیلسوفی» پێدەڵێن واتە خۆشەویستی حیکمەت (٥٧)و بابەتەکانیشی گەردوون و لێتۆژینەوەی پێکهاتەکانیەتی .(٥٨)

ئەو زانستە چەند زانستێکی دیکەی بەخۆوە گرتبوو لەوانە: لۆژیک ، سروشت ناسی، ژمێریاری، ئەندازەو مۆسیقا بەڵام دوایی لەیەک جیابوونەوەو هەریەکە بوو بەزانستێکی سەربەخۆ.(٥٩)

لەزانا هەرە دیارەکانی ئەم بوارە لە

هەولێر:عزەدین حەسەن محەمەد ئەحمەد نەجار زەریر هەولێری «٦٦٠ ک- ١٢٦١ز» لە زۆربواردا شارەزا بوو بەتایبەتی لەفەلسەفە.(٦٠)

زانستێکی دیکە کەپەیوەست بوو بەفەلسەفەو لە هەولێردا بایەخێکی زۆری پێدرا زانستی لۆژیک بوو، ئەو زانستەی داواکاریە نادیارەکان داوا دەکات، راستی لەچەوتی دیار جیادەکاتەوە لەسنووری ماهیات.(٦١)

لەزانا دیارەکانی ئەم بوارە: ئەحمەد محەمەد ئەبی حەسەن ئەبو عەباس ئەربلی دانیشتووی هەریر، پیاو چاکە و لە لۆژیک شارەزا بوو (٦٢)

**دووەم: زانستی مێژوو:**

مێژوو زمانی زانینی کاتە بەرەهایی لەدیاردەو هەواڵی رۆژەکان و ولاتان و رووداوی سەدەکان دەکۆڵێتەوە، لەناوەوەشدا لێیان دەکۆڵێتەوەو دەرەنجامی دەست دەکەوێت.٦٣ مێژوناسی لە هەولێر بایەخێکی زۆری پێدراو لەزانا دیارەکانی ئەم بوارە ئەبا فەزل ئەلیاس جامع عەلی ئەربلی «٦٠١ک-١٢٠٤ز» (٦٤)

میرەکانی هەولێریش لەبوژانەوەی زانستی مێژوودا رۆڵیان بینیوە لەمانە سوڵتان موزەفەرەدین کوکبوری« ٦٣٠ک-١٢٣٢ز»، ئیبن خەلەکان دەڵێت زۆری حەزی لەزانستی مێژوو بوو (٦٥) میرەکان بایەخیان بەلقەکانی مێژووش دەداو ئیبن فوتی دەڵێت: موحیبەدین ئەبو موزەفەر نەسر عەبدولعەزیز عەبدولرەحمان ئەربلی لەو کورە میرانە بووەکە لە نەسەب ناسی زۆر شارەزا بووەو لەمبارەیەوە کتێبی چاپکردووە.(٦٦)

لەسەردەمی ئەتابەگی مێژوو لەلایەن زانایانی هەولێر بایەخێکی زۆری پێدرا چونکە شارەکە لەم سەردەمەدا بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوەبینی.

ئیبن مستەوفی هەولێری کەلەقەلا ساڵی (٥٦٤ک- ١١٦٨ز) (٦٧) هاتۆتە دنیاوە لە پێشەنگی مێژوو نووسەکانەو لەبنەماڵەیەکی ناودارو بەدەسەلات پەروەردە بووە، سەفینەدین ئەبو حەسەن عەلی مویارەکی زانا کتێبی«نصیحە الملوک» ئیمامی غەزالی «٥٠٥ک-١١١ز» لە فارسیەوە وەرگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی (٦٨) و هەروەها لەگەڵ باوکی ئیبن مستەوفی لەسەردەمی میرنشینی هوزبانیدا (٦٩) کاری ئیستیفای کردووە.

ئەبو بەرەکات لە هەولێر خۆی پێگەیاندو لەچەندان بواری زانستیدا ئەسپی خۆی تاودا لەمانە زانستی «الحدیثە» ، مێژوونووسەکان دەڵێن پیاوێکی عاریف و نزیک لەکۆڕی ئەوان بوو(٧٠)، لەسەردەستی گەورە شێخەکانی ئەو سەردەمە فێرە زانست بووە لەمانە: ئیمام ئەبو موزەفەر مویارەک زاهیر خوزاعی بەغدادی« ٦٠٠ک-١٢٠٣ز»و ئەبو عەلی حەنبل عەبدوڵلا فەرەج بەغدادی« ٦٠٤ک-١٢٠٧ز»و ئەبو جەعفەر عومەر محەمەد ئەحمەد و حەسان ئەبی حەفیس تەبەرز بەغدادی دارقزی«٦٠٧ک- ١٢١٠ز» و ئەبو موحەمەد عەبدلەتیف ئەبی نەجیب عەبدولقاهیر عەبدوڵلا موحەمەد عەبدوڵلا سەهرەوەردی (٧١)و چەندانی تر (٧٢)و

(٧٣). جگە لەمانەش، ماڵی زاناکان شوێنی حەوانەوەی غەریب میوانان بووە، زانیارو ماقوڵان تیایاندا کۆدەبوونەوە، بەمجۆرە زانست لەهەولێر گەشەی کردووە. (٧٤)

ئیبن مستەوفی وەکو ئەندامانی خێزانەکەی کاری ئێستیفای بە ئەستۆوە گرتووەو دواییش چوەتە وەزارەت و پایەی کوکبوری (٧٥). بەڵام دوای مردنی موزەفەردین لەساڵی ٦٣٠ک-١٢٢٣ز مستەوفی بەردەوام نەبوو بەتایبەتی دوای هاتنی سوپای خەلیفەو حوکمداری میر شەمسەدین باتکین عەبدوڵلای روسی(٦٤ک-١٢٤٣ک،باتکین داوای لێکرد کە لەوەزارەت بەردەوام بێت و ببێتە جێگری بەڵام مستەوفی رازی نەبووەو لەماڵەوە خۆی گۆشەگیرکرد. (٧٦)

کەمەغۆڵەکان کەوتنە خوێن رشتنی شاری هەولێرو ساڵی ٦٣٤ک- ١٢٣٧ز دەورەی قەڵایان دا ئیبن مستەوفی یەکێک بوو لەوانەی لەناو قەڵا مانی گرت، دوای رۆیشتنی مەغۆەکانیش مستەوفی رووی لە موسڵ کردو لەلایەن حوکمدار بەدرەدین لوء لوء پێشوازی گەرمی لێکراو مووچەی بۆ بریەوە (٧)، ئیبن مستەوفی سێ ساڵ لە موسڵ مایەوە تا لە ٦٣٧ک- ١٢٣٩ز کۆچی دوایی کردو لە گۆرستانی (السابلە) دەرەوەی دەرگای (الجصاصە) نێژرا (٧٨).

ئیبن مستەوفی بەکتێبی «تأریخ اربل»کە چوار بەرگی وەک مێژوونووسی هەولێر ناسراو بە «نباهە البلد الخامل بمن وردە من الأماثل»ناسراو، ئەو کتێبە هاوشێوەی کتێبی «تأریخ بغداد»ی ئیبن خەتیب بەغدادی بووەو هەروەها کتێبی«تأریخ دمشق»ی ئیبن عەساکر (٧٩).

ئەو زانایانەی کەروویان لە هەولێر کردووە جگە لەزاناو میرو پیاوانی دەوڵەت و دەست و پێوەندەکانیان شوێنێکی لە کتێبی ئیبن مستەوفی داگیر کردووە، ساڵی ٦٣١ک -١٢٢٣ز بەشی دووەمی ئەو کتێبە (٨٠) دۆزرایەوەو چوار ساڵیش دوای مردنی دانەرەکەی ٦٤١ک-١٢٤٣ز (٨١) پاکنووس کرایەوە.

«تأريخ أربل»لەسەرچاوە گرنگەکانەو لەلایەن زۆر لە زاناو هاوسەردەمیەوە پشتی پێ بەستراوە، لەمانەکە مالەدن ئەبو بەرەکات ئیبن شەعار موسڵی«٦٥٤ک-١٢٥٦ز» ئەدیب و مێژوونووس لە کتێبی «عقود الجمان فى شعراء هذا الزمان»، ئیبن شەعار ساڵی ٦٢٥ک -١٢٢٧ز هاتۆتە هەولێرو لەلای ئیبن مستەوفی خوێندوویەتی و فێرە هونەرەکانی شیعر بووە(٨٢).

هەروەها قازی شەمسەدین ئەبو عەباس خەلەکان ئەربلی (٦٨١ک-١٢٨٢ ز) لە کتێبە بەناوبانگەکەی «وفيات الاعيان و أنباء أبناء الزمان»دا زۆر سوودی لە کتێبەکەی ئیبن مستەوفی بینیوە لە زۆر بابەتدا (٨٣).

شاعیرانی ئەو کاتە لە قەسیدەکانیان هەندێک بەیتیان تێکهەڵکێش دەکرد لەباسی مێژوودا بۆ نموونە ئەبو حەفس عومەر- شەماس هەبەتوڵلا ئەربلی ٦٠٠ ک- ١٢٠٣ لەقەسیدەیەکی دووسەرەی درێژدا باس لە مێژوو

دەکات هەر لەئادەمەوە تا زەمانی خەلیفەی عەباسی ناسرلدینولـڵاە «٦٢٢ ـ ١٢٢٥ز(٨٤).

لێرەدا بەدیارکەوت ئەدیبان لەتۆمارکردنی رووداوەکانی مێژوو رۆڵیان بینیوە بەتایبەتیش شاعیرەکان ئەو رووداوانەیان تۆمارکردووە کە لەماوەی هێرشی مەغۆلەکاندا بەسەر ئەو شارەدا هاتوون، لەدیوانی«کیورکیس وردا«الأربل» شاعیری نەسرانیدا باس لەئابلۆوقەدانی قەڵای هەولێر لەلایەن مەغۆلیەکان ساڵی «٦٣٤ ـ ١٢٣٧ز» دەکات کە چەند بەر بەریانە هەڵسوکەوتیان کردووە (٨٥)

دیارترین شاعیرەکانی ئەم بوارە مەجدەدین ئەبو مەجد نەشابی ئەربلی «٦٥٧ک-١٢٥٨ز کە نەک هەر وەسفی مێژووی هەولێری کردووە بەڵکو باسی لە خەلافەتی عەباسیش کردووە(٧٦).

هەروەها شەمسەدین ئەبو عەباس ئەحمەد محەمەد ئیبراهیم ئەبی بەکر بن خەلەکان ئەربلی خاوەنی کتێبی «وفیات الأعیان وأبناء ابناء الزمان مما ثبت بالنقل أو السماع أو أثبته العیان» (٨٧) یەکێک بووە لە مێژوونووسە ناسراوەکان.

ئیبن خەلەکان ساڵی ٦٠٨- ١٢١١ز لە هەولێر هاتۆتە دنیاوە وەک خۆی بەکەمالەدین بن شەعار(٨٨)-موسڵی وتووە: ساڵی ٦٠٨ لە قوتابخانەی موزەفەریەی سوڵتانی گەورە

موزەفەرەدین کوکبوری(٨٩) هاتومەتە دنیاوە.

سەرەتا لەسەردەستی باوکی فێرە مەزەبی شافعی بوو (٩٠)، باوکی پیاوێکی زاناو لە کەسایەتیە دیارەکانی هەولێر بوو، ویستی کوڕەکەی پێبگات، لەسەر دەستی زانا خاتوو أم مؤید شەعری زەینەب عەبدولڕەحمان نەیسا بوری «٦١٥ک-١٢١٨ز» ئیجازەی بۆ وەرگرت لەساڵی ٦١٠ک(٩١).هەولێر رۆڵێکی گەورەی لەبەرۆشنبیربوونی ئیبن خەلەکاندا بینیوە، سەرەڕای ئەوەی کە زۆر حەزی لە زانست بووە لە هەمان کاتدا لەکۆڕو دەرس وتنەوەکاندا ئامادەگی بەردەوامی هەبووە، دوای مردنی باوکی لە قوتابخانەی موزەفەریەدا ئەبو فەزل شەرەفەدین منعەی هەولێری کاروباری دەرس وتنەوەی بە ئەستۆوە گرت « ٦٢٢ ک-١٢٢٥ ز»، ئیبن خەلەکانی مێژوونووس ئامادەی دەرس وتنەوەکانی دەبوو و گوێی لێ دەگرت (٩٢)، سەمیح ئەلبوخاریش کە (٩٣) لەلایەن ئەبی جەعفەر محەمەد هەبە تولڵا سۆفی«٦٢١ک-١٢٢٤ز» دەنگوباسی هەولێری بیست رووی لەو شارە کردو زانستی «الخلاف»ی لەسەر دەستی شێخ ئەسیرەدین موفەسەل ئەبهەری خاوەنی «التصانیف المشهوره فی علم الخلاف و غیره من العلوم» خوێند، ناوبراو ساڵی ٦٢٥ک - ١٢٢٥ز(٩٤) سەردانی هەولێری کرد.

جگە لەمانەش کۆڕو کۆبوونەوەی هەندێک لەزانایەکانی هەولێر کاریگەری زۆری بەسەر روناکبیری و فرە زانستییەوە هەبوو، لە پێشەوەی ئەو کۆڕانە کۆڕی مێژوونوس و ئەدیب شەرەفەدین ئەبو بەرەکات موبارەک مستەوفی«٦٣٧-١٢٣٩ز»بوو، ناوبراو هەر

بەوەندە بڕی نەشکا بەڵکو لەپێناوی زانست رووی لە زۆر شوێنان کرد بەتایبەتی موسڵ، تا لەدوا جـــار ســـاڵی ٦٢٦ک- ١٢٢٦ز بە یەکجاری هەولێری جێهێشت کە ئەوسا تەمەنی هەژدە ســـاڵ بوو، دوایی رووی لەحـــەلەب و شـــامکردو بەدیاری قـــازی بەهادین یوسف مـەعـروف ناسـراو بە ئەبو شـەداد شـادبوو کـە خـاوەنی کـتـێبی«النوادر السلطانیە والمحاسن الایوسفـیـە»یە ساتی «٦٣٥ک ـ ١٢٣٨ز» لە قـاهیـرە کردو دواییش گەڕایەوە دیمەشق و وەک قـازیەک دەسـتـبـەکـار بوو و دواییش بووە مامۆستا لە قوتابخانەی«النجیبیە»، تا لەساڵی ٦٨١- ١٢٨١ ز کۆچی دوایی کـردو لە چیـای قاسیون بە خاک سپێردرا(٩٥).

ئیبن خەلەکـان کـتـێبی «وفـیـات الأعـیـان»ی ساڵی ٦٥٤ک ١٢٥٦ز لە قاهیرە هەڵاوێر کرد بەتایبەتی کە سەرجەم رەشنووسەکانی بەگوێرەی پیـتی هیـجـا ریزبەند کـردو سـاڵی ٦٧٣ک- ١٢٧٤ز کۆتایی پێی هێنا، دەڵێن ئەو کـتـێبە زۆر کورت بووەو مەبەستی ئەوە بووە کتێبێکی گەورە لەمەڕ مێژوو بنووسێتەوە، (٩٦)، چەند هۆکارێک لەپاڵ نووسینەوەی ئەم کتێبەوە بوون لەمـانە پاڵنەری خودی وەک خۆشـەویسـتـیـەک بەرامـــبـــەر ئەو زانســـتـــە جگە لەپاڵنەری کـۆمـەڵایەتی، ئیبن خـەلەکـان هەر بەبیـسـتـنی هەواڵ و گـواسـتـنەوەکـەی نەوەسـتـاوە بەڵکو هاوسـەنگی لە نێوانیـان دروستکردووەو ئینجا دەستی بە نووسینەوەیان کردووە، (٩٧) زەهبی وا وەسفی دەکات کـەسـوارچاکێکی بەخشندەو شارەزای کاروباری خەڵک بووە. (٩٨)

هەرچەندە کــەم کــەس شـــوێن پێی ئیبن خەلەکاتی هەڵگرت (٩٩) بەڵام کـتێبەکەی لەو بەرهەمـانەیە کـەم کـەس دەتوانێت دەسبـەرداری ببـێت بەتایبــەتی ئەوانەی کــە خـــەریکی لێکۆڵینەوەی مێژووی ئیسلامن.

پێویستە ئاماژەش بەوەبکەین کەئیبن خەلەکان خاوەن کتێبی «ترجمات المتقدمین من الشعراء» یشە.(١٠٠)

زانایەکی دیکە لەبواری مێژووناسیدا محەمەد ئەبی هەیجـا هوزبانی ئەمـیـرە عـزەدین ئەربلی «٧٠٠ک - ١٣٠٠ز» بوو کـەلەپاڵ مـێـژوودا شارەزایی لەئەدەب و شیعریشدا هەبوو.(١٠١)

هەروەها لەمـێـژووناسـەکـانی هەولێـر نابێ بەدرەدین عەبدولڕەحمان ئیبراهیم ئەبو محەمەد ناسراو بە کوڕی قەنینۆ ئەربیـل مان لەبیر بچێت «٧١٧ک - ١٣١٧ز» کـە سـەرەڕای مـێـژوو لەرەوانبـێـژیش شـارەزابوو و کـتـێبی «خلاصە الذهب المسبوک المختصر فی سیـر الملوک»ی داناوە، دەڵێن ئەم کـتێبە کورتکراوەی کـتـێبی «الجامع المخـتـصـر»ی ئیبن سـاعـیـە (١٠٢)، کەتیـایدا باس لە مـێژووی خەلیـفەکـان دەکات لەخەلیـفە وەلید عەبدولمەلیکەوە «٦٥- ٨٦ک - ٦٨٥ - ٧٠٥ز» تا دەگـاتە دوا خـەلیـفـەی عەباسیان موستەعسیم بیللا «٦٤٠ - ٦٥٦ک ». (١٠٣)

**سەرچاوەو پەراوێز**

١- گـۆسـتــاف لوبوف: حـضـارە العـرب - القاهرە ١٩٥٦ ص ٤٨٨.

٢- ابن خلکان: وفیات الآعیان ٣/٢٧٢.

٣- ســـەهرەوەردی: لەناوی ســـەهرەوەردەوە

هاتووه كه شارۆچكەیەكە نزیک زنجان.
یاقـوت الحـمـوی: البلدان ٣/٢٨٩، ابن عبدالحق: مراصد الأطلاع ٢/٧٦١.
٤- ابن المستوفی: تأریخ أربل، ١/١٧٢ - ١٧٣.
٥- سامی الصگار لێكۆڵەرەوەی كتێبی ابن المستوفی دەیگەڕێنێتەوە بۆ عەبدولڕەحیم عەلی ئیسحاق شیت قەرشی میسری پزیشک و ئەهلی ئەدەب و شیعر كە لەدیمەشق ساڵی «٦٢٥ک - ١٢٢٧ز» مردووە، بڕوانە تأریخ آربل ٢/٥١٩ ک - ٥٢٠.
٦- ابن المستوفی: ن - م، ١/ ٣١٤.
٧- ابن الشعار. عقود الجهات ١/١٦ ب/ ١٧ص.
٨- ن - م، ١٠/ ١٧٣ب.
٩- دیوانی الأهراء: ئەو كۆگایانە بوون كەشتومەكیان بەئیمزای سوڵتان تێدا سەرف دەكراو دادەنرا. القلشقندی: صبح الأعشی ٤/٣٣.
١٠- ابن الشعار: عقود الجمان، ١/ ٢٤٠ آب. محسن محمد حسین: آربیل/٣٢٢ - ٣٢٣.
١١- ابن القوطی: تلخیص مجمع الأداب فی معجم الالقاب: ٤: ١٠٦٢ - ١٠٦٣، ناجی معروف: تأریخ علماء المستنصریه ١/٢٨١، عبدالحمید العلوجی: تأریخ الطب العراقی. بغداد ١٩٦٧/٤٢٤، محمد مفید آل یاسین: الحیاه الفكریه فی العراق/١٥١.
١٢- الیوتینی: ذیل مرآه الزمان: ٣/٣٠٣.
١٣- سوتر: دائرة المعارف الاسلامية (مادة الحساب)١٤، ٢٤٨، حاجي خليفة: كشف الظنون. ١/٦٦٣، حكمت نجيب: دراسات في تأريخ العلوم عند العرب، بيروت ١٩٧٧/٨١، عمر فروج - تأريخ العلوم. ٨٩٨.
١٥- عقود الجمان: ٣/١٥٢ آب.
١٦- ابن خلدون: المقدمة ٤٨٤ - ٤٨٥، احمد بدوي: الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية. /٢٩٩، حكمت نجيب: دراسات في تأريخ العلوم عند العرب: ٨٧.
١٧- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ١/٣٦٧ - ٣٦٨.
١٨- ابن عساكر: تهذيب تأريخ دمشق ٥، ١٦٨ - ١٦٩، ابن خلكان: وفيات الأعيان: الصفردي: الوافي بالو فيات ١٣/٣٣٧، ناجي معروف: عروبة العلماء المنسوبين الي البلدان الاعجمية: ٣/١٩٧.
١٩- ابن الساعي: الجامع المختصر، ٩/٢٤٣، ابن سعيد الأندلسي:الغضون اليانعة، ٢/٧٨. ١١٦، ابن كثير البداية والنهاية، ١٣/ ٥٠.
٢٠- إبن الشعار: عقود الجمان، ٧/٢٣٩ب.
٢١- الأستيفاء: واتە ڕێكخستن و زانینی ئسوڵی پارەو مولک و چۆنیەتی سەرف كردنیان.
القلشقندي: صبح الأعشي ٤/ ٣٠.
٢٢ - ابن الشعار: ن،م،٦/٢٣،
وفيات الأعيان،٣. ٢٩٤، اليافعي: مرأة الجنان، ٤/٩٦.

٢٣- عقود الجمان: ٦/١.ب،الصفدي: الوافي بالوفيات ١٤٣/١-١٤٤.

٢٤- الروشدي: امارة موصل في عهد بدرالدين لؤلؤ.

٢٥- ابن الشعار: ١٥٤-١٥٥.

٢٦- رسائل اخوان الصفا و خلان الوفاء: الرسالة الثالثة، القسم الرياض، بيروت ١٩٥٧ ,١١٤/١،ابن خلدون: المقدمة ٤٨٥-٤٨٨.

٢٧- القرآن الكريم: سورة يس الأيات ٣٧، ٣٨ ,٣٩.

٢٨- الصفدي: الوافي: ٢٥١/٥.

٢٩- ئەقليدس: كوڕى ئۆقترسى بەرينقى بوو، لە فەيلوسوفە بيركارەكان بوو بەتايبەتى لە ئەندازە بە كتێبى «ئەقليدس»ناسراوە كە ئيسلاميەكان پێى دەڵێن«الأصول». ابن النديم: الفهرست/ ٢٦٥. ابن جلجل، طبقات الأطباء والحكماء: القاهرة، ١٩٥٥ ,٣٩، قدري حافظ طوقان: تراث العرب العلمي في الرياضيات والفلك بيروت .د.ت/٨٨، حكمت نجيب: دراسات في تأريخ العلوم عند العرب ١٤٦ك.(٣).

٣٠- المحبطي: واتە گەورە ناوى كتێبەكەى بەتليمۆسە زاناى ناودار لە گەردوونناسى، ابن النديم: ن.م./٢٦٧. ابن جلجل: ن،م،٣٥. قدرى طوقان: ن.م/١١٢.

٣١- ابن خلكان: وفيات الأعيان ١٠٢/٤. ابن قاضي شهبة: طبقات النحاة و اللغويين/٢٩٣، السيوطي:٢٨٦/١. محسن محمد حسين: اربيل ٢٦٩.

٣٢- ابن السلمي الخازن: الجامع المختصر/٢٤٣/٩، ابن سعيد الأندلسي: الغضون اليانعة: ٧٨/٢، ١١٦.ابن كثير: البداية والنهاية.

٣٣- ابن الشعار: عقود الجمات/١/٢٤٠ب.

٣٤- هەمان سەرچاوە ١٥٢/٣ب.

٣٥- بۆ زياتر زانيارى بڕوانە: محسن محمد حسين. أربيل.٢٢١-٢٥٥، د. حسام الدين نقشبندى: خطط أربل/١٣٥-١٤٩.

٣٦- د. حسام الدين نقشبندى: ن،م/١٤١.

٣٧ - ابن الشعار: عقود الجمان: ٢/٢/٦، ا، ابن خلكان: وفيات الأعيان:٢٩٤/٣، اخوانساري: روضات الجنان ٧/ ٢٣٤، حاجي خليفة: كشف الظنون: ١ ,٢ ,٩٨٨/٥، محسن محمد حسين: ابن المستوفي/ ٧٠

٣٨- مەبەست لەگوندى راياتە كە بەدەربەندى رايات ناسراوەو سەر بەقەزاى رواندزەو ١٥ كم لە خەليفان دوورة. طةباقر، فواد سفر: المرشد الي مواطن الأثار والحضارة/١٤.

٣٩- ئەستەرلاب: وشەيەكى يۆنانيەوگرنگترين روانگەيە بۆ گەردوونناسى، لەگۆيەكى كانزايى دروست دەكرێ و پلەدارە، بە ئاراستەى رۆژ دادەنرێت تا بەرزايى رۆژو هەسارەكان بپێوێ جگە لەكاتەكانى نوێژكردن و كازێوەو خۆرئاوابوون . بڕوانە قدرى حافظ طوقان: تراث العرب العلمى فى الرياضيات

والفلک«١٣٤» ، حکمت نجيب عبدالرحمن: دراسات في تاريخ العلوم هند العرب ١٩٧ - ١٩٨.

٤٠- ابن الشعار: ن، م،١/١٦٧.

٤١- تلخيص مجمع الأداب في معجم الألقاب: ١/٢٢٨

٤٢- اليونيني: ذيل مرآة الزمان /٣/٣٠٣.

٤٣- المقدمة/ ٤٨٨-٤٨٩.

٤٤- لەزانا بەناوبانگەکانی پزیشکیە جگە لەشارەزایی لەئەندازە، لەدیمەشق هاتۆتە دنیاوەو سەردانی موسڵی کردووەو دوایی هاتۆتە هەولێرو دەڵێن لە ساڵی ٥٩١ک-١١٩٤ز مردووە.

ابن ابي صبيحة- عيون الأنباء في طبقات الأطباء، بيروت، د،ت،٦٠٩، محسن محمد حسين/ اربيل ٢٦٩و ه (٤).

٤٥- ابن خلكان: وفيات الأعيان٤/ ١٠٥.

٤٦- ابن ابي صبيحة: عيون الأنباء في طبقات الأطباء/٦٥٩ ،محسن محمد حسين: اربيل / ٢٧٠.

٤٧- ابن الدبيشي: ذيل تأريخ مدينة السلام. ٢/١٣٤ ،القفطي: انباء الرواة في طبقات النحاة ٣/ ١٩١

٤٨-ابن خلكان/٣٩٧-السيكي:طبقات الشافعية الكبري ٥/١٥٧ ،محسن محمدحسين/ ٢٧٠- ٢٧١.

٤٩- وفيات الأعيان،٤/٣٩٧

٥٠- ابن خلدون: المقدمة/٥٠٤.هەروەها بڕوانە: عبدالمنعم ماجد: تأريخ الحضارة الأسلامية/٢٥١-٢٥٤

٥١- ابن خلكان: وفيات الأعيان . ١/ ٤٤١ ،ترجمات المتقدمين من الشعراء/٤٤ ،ابن كثير: البداية والنهاية،١٢/ ١٩٠ ،(احمد عبدالعزيز: الهذبانيون/١٣١،

٥٢- ياقوت الحموي:معجم الأدباء، ١٠/٥٧.

٥٣- sarton, lntroduntio to the history of science vol.ll.partl,p.219.

٥٤- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ١/١٦٨-١٦٩، ٢٥٦

٥٥- عقود الجمان، ٧/١٩٧.

٥٦- تلخيص مجمع الأداب في معجم الألقاب :٣٣٨-٣٣٩.

٥٧- ابن القديم: الفهرست:٢٤٦ ،خاشع المعاضدي: دراسات في تأريخ الحضارة العربية/ ٢٢٠،د.

هاشم يحيي الملاح: دراسات في تأريخ ١٩٨٥/١٥.

٥٨- بدري محمد مهند: تأريخ الفكر والعلوم العربية/١١٨.

٥٩- الغزالي: احياء علوم الدين ، بيروت ١/ ٢٢، ابن خلدون: المقدمة: ٤٧٨- ٤٧٩، أحمد أمين: ظهور الأسلام:٢/٢٧.

٦٠- ابو شامة: الذيل علي الروضتين/ ٢١٦، اليونيني: ذيل مراة الزمان ١/ ٥٠٢، الصفدي: نكت الصميات في نكت العميات/ ١٤٣.

٦١ - ابن خلدون: المقدمة ٤٧٨ ـ ٤٨٩
٦٢- عقود الجمان: ١/ ٢٢٧.
٦٣- ابن خلدون ن ٢ ،م/٣-٩ ،حاجي خليفة: كشف الظنون، دائرة المعارف الأسلامية ٩/ ١١٥ ،عبدالعزيز سالم: التأريخ والمؤرخون العرب ١٩٨١-١٧.
٦٤- ابن كثير: البداية والنهاية/١٣-٢٤.
٦٥- وفيات الأعيان: ٣/ ٢٧٦.
٦٦- تلخيص مجمع الأداب في معجم الألعاب الألقاب ٥: ٢/ ٣٣٠.
٦٧- المنذري: التكملة لوفيات النقلة: ٦/ ٣٢٤، ابن خلكان ن م ٢/ ٢٩٨، ترجمات المتقدمين من الشعراء ٥٠/ابن أبي عذيبة: انسان العيون/٩٠ ٣، السيوطي: بغية الرعاة ٢/ ٢٧٢: تأريخ الأداب العربي ٥/ ١٧٦. محسن محمد حسين اربيل/ ٢٧٤، ناجي معروف: عروبة العلماء المنسوبين علي البلدان الأعجمية ٣/ ١٨٥.
٦٨- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ٣٠/ ٢٧٦ ،محسن محمد حسين: ابن المستوفي ٦٧.
٦٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ٦/ ٢٣ ،ابن خلكان: د-س.
٧٠- ياقوت الحموي: البلدان،١/ ١٣٨ ،ابن خلكان: د.س.
٧١- ابن المستوفي: تأريخ أربل ١، ٤١، ١١٠، ١٦١، ١٦٢، ١٧١، المنذري: التكملة لوفيات النقلة ٦/ ٣٢٢.
٧٢ابن المستوفي:

د،س،١/ ٣٩، ٥٦، ٩٥، ١٠٠، ١٠٢، ١٣٠، ١٣٢، ١٣٤، ١٣٦، ١٥٥، ١٦٣، ١٧٠، ٨١، ١، ١٨٨، ١٩١، ١٩٤، ٢١٨، ٢٢٠، ٢٢٩، ٢٦٩، ٣١٧، ٣٥٨، ٣٧٦، ٣٩١،٤٠٦،٤٤٩ .
٧٣- ابن خلكان:د،س.
٧٤- ابن المستوفي: تأريخ أربل ١/ ٢٩٣، المنذري: التكملة لوفيات النقلة:٦/ ٣٢٢ ،اليونيني:ذيل مرأة الزمان١/ ١١١.
٧٥- المنذري:د،س،ابن خلكان: وفيات الأعيان،٣/ ٢٩٧ ،ابن الفوطي: الحوادث الجامعة/ ١٣٥ ،ياقوت الحموي: البلدان ١/ ١٣٨، الخوانساري: روضات الجنان/ ٧، ٢٣٤ ،السيوطي:بغية الرعاة ٢/ ٢٧٢.
٧٦- ابن الشعار:عقود الجمان/٦، ١٢٠.
٧٧- د،س و بروانة ابن الفوطي، الرويشدي أمارة المرصل في عهد بدرالدن لؤلؤ/١٩٣-١٩٤، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٨٢.
٧٨- ابن خلكان:د،س،٣/ ٢٩٨ ،محسن محمد حسين: د،س
٧٩ محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٧٧-٢٧٨، ابن المستوفي/ ٧١.
٨٠- مامۆستا سامی سەفار بەدوو بەش لێی کۆڵیوەتەوە وەک بەشێک لەتێزەکە کە بۆ وەدەست هێنانی دکتۆرا پێشکەش بە زانکۆی کامبرگی ئینگلتەرای کردووە، لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری عێراقی ساڵی ١٩٨٠ کتێبەکە

بەچاپ گەیەندراوە.

٨١- ابن الستوفي: تأريخ أربل، ١، ١١، ٢٣، ٤٦١.

٨٢- د،س:١/٣٨٤-٣٨٦، ٥٩٨/٣، ابن الشعار: عقود الجمان ٦، ١١٩-١٢٣.

٨٣- وفيات الأعيان:٣/٢٩٤.

٨٤- ابن الستوفي:تأريخ أربل ١/٦٣.

٨٥- بابو اسحق: تأريخ نصاري العراق/٩٤، محسن محمد حسين: أربيل/ ٣٠١.

٨٦- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:
الديوان
٦٢-٧٤، ٢٥٧-٢٦١، ٢٩٢-٢٩٣.

٨٧- محسن محمد حسين: اربيل/٢٧٤-٢٧٥.

٨٨- عقود الجمان:١/٢٢٩ب.

٨٩-وفيات الأعيان : ٢/٩٢، بڕوانە ابن القاضي المكناسي: درة الجمال في اسماء الرجال: القاهرة ١٩٧٠، ١، ٧،ابو الفداء: مختصر في أخبار البشر،٣، ٢١٣،ابن الوردي: تتمة المختصر.

٩٠- المنذري: التكملة لوفيات النقلة،٤/٧،السبطي:طبقات الشافعية الكبري ١٤/٥، عباس العزاوي: التعريف بالمؤرخين/ ٩٥

٩١- ابن خلكان: ه،س.

- ئەمە مانای ئەوەیە کە بەدوو ساڵان ئیجازەی وەرگرتووە، ڕێی تێناچێ یەکێک لەو تەمەنەدا ئیجازە وەربگرێ، بۆی هەیە وشەیەک لەنێوان دا پەڕیبی.

٩٢-ابن خلكان:ه،س ١٠/ ٩٠

٩٣- ه،س،٢/٣٩٢-٣٩٣.

٩٤- ه،س،٤/٣٩٧.

٩٥- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە نووسینەکەی د. ئیحسان عەباس لە پێشەکی کتێبی الوفيات الأعيان، چاپی بەیروت ١٩٧١،-٧/٢٥-٥٣.

٩٦- بروكلمان: دائرة المعارف الأسلامية «مادة خلكان»١، ٢٧٥،احمد أحمد بدوي:الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية/٢٧٩-٢٨٠، خليل ابراهيم جاسم: منهج ابن خلكان/٣٨-٤١.

٩٧- خليل ابراهيم جاسم: منهج ابن خلكان: ٣٥-٤٢.

٩٨- العبر في خبر من عبر/٥/٢٣٤.

٩٩- الخوانساري: روضات الجنائن.

١٠٠- ه،س. ١٣٠

١٠١- الصفدي: الوافي بالوفيات٥/ ١٧٠، ابن كثير: البداية والنهاية ١٤/ ١٧٠، المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك.١/٣/٩١٨.

١٠٢-ابن جعفر العسقلاني:الدرر الكامنة ٤٢٨/٢،الزركلي: الأعلام ٢٩٣/٣، كحالة: معجم المؤلفين ١١٢/٥، عباس العزاوي: التعريف بالمؤرخين ١٣٨.

١٠٣- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالرحمن بن قينو الأربلي: خلاصه الذهب المسبوك: تحقيق مكى جاسم.



# کۆمەڵگای سێبیران و جیهانی کولتوور

عەباس سلێمان سمایل

لەزۆر لەولاتانی جیهان بەهۆی نەمانی داب و نەریتی کۆن هەولیان داوە لەناو زانکۆ کانیان بەتایبەتی لەناو کۆلێژی کشتوکاڵ و کۆلێژی ئاداب گوندیان تێدا دروست کردووەو هەموو کەل و پەلێکی بەکارهاتنی مالی کۆنی میللەتەکەیان تیادانا و بەردەوام وەکو پێشانگایەک و قوتابیانی زانکۆ نمایشی تیا دەکەن، ئەنجامدانی ئەمانەش لەپێناو مانەوەی رەسەنایەتی میللەتەکەیان و پاراستنی کولتووری نەتەوایەتیانە.

لەهەموو جیهان هەر کەسێک لەولاتێک بچێتە ولاتێکی دیکە بەتایبەتی شوێنەوار ناس و پسپۆری کەلتوور، حەز بەبینینی کولتووری میللەتەکە دەکات و چەند نموونەیەک دەکرێ و بۆ ولاتەکەی دەباتەوە، گەلی کوردیش زۆر دەوڵەمەندە لە کەلتوورو تاکو ئەمرۆش هەموو کەل و پەلێکی کولتووری لەگوندەکان بەکاردێت، بەلام بەداخەوە ئەمرۆ گرنگیەکی ئەوتۆ بەکەولتووری نادەین و ئەرکی سەرشانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە کە کارگەی تایبەت بەهەموو کەل و پەلێکی میللی بکاتەوە وەک کارگەی چنین مافورو جۆرەکانی، رانک و چۆخەرو کەل و پەلی لەقورو دار دروست کراو کەل و پەلی دیکەی ناومال و کشتوکال و کردنەوەی پێشانگای کولتووری هەمیشەیی لەهەموو شارو شارۆچکەکان جا کۆمەڵگای سێبیران بەهۆی نیشتەجێ بوونی جۆرەها هۆزی کورد لەم کۆمەڵگایە، ئەوا وەکو کۆمەڵگایەکی فۆلکلۆری لێ هاتووە، دەچیتە هەر مالێکەوە جۆرە شتێکی میللی تێدا دەبینی، جا سەرەرای هۆزەکانی گوندەکە (شێخ مەموندی، بلباس، گەردی، کورد) چوار هۆزی گەورەی کرمانجیشی نیشتەجێیە کە بریتین لەشێروانی، هەرکی، رێبازی، موهاجیر ئەمانەش بەهۆی هەستە نەتەوایەتیەکەو بەشداریان لەشۆرشی ئەیلولدا کردووەو حکومەتی عێراقی ئەوانی لەزێدی خۆیانی دورخستۆتەوەو لەم کۆمەڵگایە نیشتەجێی کردوون و دەوروبەری (١٧) سالە هیچ گرنگیەکیان پێ نەدراوە، ئەمرۆکەش دەچیتە هەرمالێک لەمانە هەستی نەتەوایەتیان تیا دەبیندرێ و زۆر شانازی بەکەلتوری نەتەوەکەیان دەکەن.

ئێمەش بە پێویستمان زانی دیمانە لەگەل چەند کەسێکی هوشیاری بەسالاچووی کۆمەلگای سێبیران دەربارەی کولتور مێژووی ناوچەکەیان سازبدەین.

**١- فەتاح مامەند تاهیر:** مام فەتاح زۆر حەز بەکەلەپوورو زانستی ئاسەوار دەکات و کەلوپەلی مالەکەشی هەمووی دەستکردی خۆجێیەتی بوون.

مام فەتاح دەلێت : بەهۆی خۆشەویستی کولتوورەوە هەستی نەتەوایەتیم بەتین بوو و بۆیە لەسەرەتای چلەکانەوە چوومەتە ریزی پێشمەرگەو

لەکۆماری مەهابادیش ڕۆڵی خۆم بینیووە بەتایبەتی لەشەڕەکانی مەلقەرەنی و نەلۆسێ.
لەکاتی تێک چوونی کۆماریش،(بارزانی



مام فەتاح دەربارەی جوولایش وتی: جوولاکانی ناوچەی بارزان هەموویان جولەکە بوون هەموو شتێکی چنراویان دروست دەکرد لەمافور، جاجم، دووگورد،

نەمر) بۆ ڕێکەوتن چووبووە تاران ،هۆزی مامەشی ویستیان هێرشمان بۆ بێنن بەلام ئێمە دەستی خۆمانمان پێش خست و (١٢)کەس و ئاغای مامەش - مان کوشتن وتوانیمان لەگوندەکانی مامەشان بچینە دەرەوەو خۆمان گەیاندە شنۆیێ پاشان سوپای ئێران بەهاوکاری هۆزی مامەش لەشنۆیێ هێرشیان کردینە سەر لەئەنجامدا هێزی پێشمەرگە سەرکەوت و (٤) چوارتۆپی گەورەو بەدەیا پارچەچەک و(١٠٠) ولاخمان کەوتە دەستی و دەوروبەری(٣٥٠) سەربازی ئێرانیشمان بەدیل گرت.

پاشان شێخ ئەحمەدی بارزانی وتی سەرباز هەژارو بێ دەسەلاتن و بەزۆر بۆ شەڕیان هێناون ، ئازادیان بکەن بابڕۆن.

پاشان مام فەتاح باسی شەڕکانی سالی(١٩٤٣)ی کردوو وتی دووکەسی فەلە هەبوون برای یەکتری بوون ناویان (سۆرۆ)و(شمۆ) بوون تۆپێکیان لەداری (بەنێ) دروستی کرد، گوللە تۆپی حکومەتیان تیا بەکارهێنا، چەند تۆپێکیان پێ هاویشت و لەقشلەی بلێیان دا بەلام بەهۆی ئەوەی تۆپەکە نەبەسترا بۆ وە، لەگەل هاویشتن تۆپەکە پارچە پارچە بوو.

پەشمەو بەگوز.. کارەکانیشیان زۆر بەساغی و بێ فرت و فێل بوو، ، جوەک هەبوو ناوی(ساسۆن) بوو، بوو، شێخ ئەحمەدی بارزانی پەشمەو بەرگوزی لەلای سانسۆنی بەڕادان دەدا. فەلەی ناوچەی بارزانیش زیاتر بەکاری دروست کردنی جەڕە،شەربە، کویە، مەسینە و جۆرەها شتی لەقوڕ دروست کراو خەریک بوون و لەناو کورە سۆریان دەکردەوەو هەمووشمان وەکو برا دەژیاین و کەس کەسی نەدەچەوساندەوە.

دەربارەی ڕەسەنی هۆزی شێروانی وتی:

زێدو هەوارو دەوروبەرەکەی لەژێر کۆنترۆلی ئەم هۆزەدا بووە واتە ئەم هۆزە وەکو شێر ناوچەکانی دەوروبەری ئەم دەریاچەیەیان لەژێر دەست دابووە. بۆیە ناوی ئەم هۆزە بەناوی هۆزی شێروانی ناسراوە.

لە دەوروبەری (٢٠٠-٣٠٠) سالێک لەمەوبەر هەندێک لەم هۆزە بەسەرۆکایەتی ئاودەل دێنە ناوچەی بارزانی ئەمڕۆ دەبێتە گەورەی ناوچەکە پاشان شەڕ دروست دەبێت لەنێوان شێروانی و هۆزەکانی دیکە لەئەنجام شێروانی هەمووی دەکوژرێن و تەنها کوڕێکی ئاودەل دەمێنێتەوە بەناوی (حەسەن) دایکی لەژێر سەبەتەی نانی دە شارێتەوە ئینجا بەشەو کوڕێ خۆی بردە ناو هۆزی

زراری و پاش چووە لای میری ئامێدیێ کەمیرێکی زۆر بەهێـز بوو، حـەسـەن لوێدێ مـەزن بوو بووە جحێلەکی بەکارەو ژلێهاتی، ڤێجا میری ئامێدیێ گۆتە حـەسەن خۆ حازرکە ئەم وێ بێنەکێ دچینە راڤێ، حـەسـەن رابوو خـۆ پەیت ڤـەکـرو شـیـرو مەتالیێت خۆ گرێدان و کەفتە دیڤ پاشای چوونە جهەکی کو پووشەلان بوو، دیت شێرەک دەرکەفت لڤی پووشەلانێ و هێ رشی پاشمای کرد، حەسەن خۆ هاڤێتە شیری وشرێ شێری کرو شێر کوشت، پاشا هاتە خوارێ ل هەسپێ خۆو ناڤچەوانا حەسەن ماچ کردو گۆت:

من ناڤێ تەدانا (حـەسەن بەگ) تو ژمـالبـاتەکا حەلالی و خانەدانی،چونکی کورێ من ئەڤە بۆ من نەکریە. ڤێجا گەریانە ڤەو پاشای سۆزدا کو ئەز نانێ بێ تە نەخـۆم هەتا ئەزوتە دگـەل ئێک سـاخ بین.

ئینجا مـیـری ئامـێـدی حەسـەنی کـردە مـیـری ناوچەکەو ناویان لێنا مـەزنی شێـروانیـان ، ناوی ئەو گوندەی کە حەسەنی تێدا دەژی بەناوی شێروان مەزن ناسرا.

تیرەکانی هۆزی شێروتنیش بریتیە لەم تیرانە:

مژدینی یا (مزدەینی)، زراری شـێـروانی کـەواتا یا (کاوانی)،میر ئاو دەلی.

میر ئاودەلی لەپارێزگای سلێمـانی نیشـتـەجێینە کـاوانی لەگـوندی کـاوانیـان نزیک شـەقـلاوە و کـاوانی بارزان نیـشـتـەجێ نەوزراری لەباکـوری بەسـتـۆرە نیـشـتـەجـێـینەو شـێـروانیش لەدەشـتی هەولێرو شـێـروان مـەزن و هەندێک لەگـوندەکـانی دەڤەری بارزان نیشتەجێن.

شـێـروانی خـۆیان بەنەوەی خـالد کـوڕی وەلیـد دەزانن و سەرجەلە یەکیشیان هەیە کەدەگاتەوە سەر خـالد کـوری وەلیـد، کـەچی خـالد نەوەی لەدوای بەجێ نەمـاوە، منیش وای بۆ دەچم کـە ئەم هۆزە نەوەی(خالد)یەکانی گەلی کۆنی کـوردسـتـان بن و بەهۆی نزیکی نـاوی خـالد(کـالد) و نـاوی خـالد کوڕی وەلیدو سۆزی ئاینییەوە خۆیان بەلای خالد کـوری وەلیـد شکاندبێـتـەوە هەروەک دەبینین ئەم بیرو رایە یان لەم پارچە شیعرەی شاعر محەمەد زێبـاری کـە لەنیـوەی چاخی ١٩ ژیاوە رەنگ دەداتەوە کە دەڵێت:

محەمەد ئەعرەجێ بەرچاییمە
ژگەوهەرێ زێبارییمە
ژ غەففارێ مەهرەچیمە
ژنەسەبێ خالیدیە.

**چەند ناوێکی جۆگرافی شێروان مەزن**

شـێـروان مـەزن: شـێـروان مـەزن گـوندی حـەسـەن بەگی شێـروانیـانە،لەبەر ئەوەی هۆزەکـانی ناوچەکە حەسەن بەگی شێروانیـان بەمەزنی خۆیان هەڵبژاردو لەو گـوندەی کـەداین نا، بەناوی شـێـروان مـەزن ناسرا،

چیـای بەرزێ: چیـایەکی زۆر بڵـندە بۆیە بەم ناو ناسـراوە، لەسـەردەمی پاشـای کـۆرە(مـەرعـاناغـا) ئاغـای ناوچەکـە بووەو لەسـەر چیـای بەرزێ قـەلاتێکی دروست کـردووە ئاسـەوارەکـەی تاکـو ئەمرۆماوە.

شکەفـتـا هەشـتـێ: ئەشکەوتێکی پیـرۆزە، بەڵام چونکە کـاتی خـۆی خلوەتی تیـاکـراوە دەچێـتـە ئەم ئەشـکەوتەوە دەڵـێـن جـارێـک مـەرێک ون دەبێت و لەو ئەشکەوتەوە حـەوت مـەرێ دیکەی لەگـەلێ هاتەدەرەوە، واتە بوونە هەشت مەر بۆیە بەشکەفتا هەشتێ ناسراوە.

بەهارانیش ئاوی ئەشکەوتەکـە زیاد دەکـات و لەبەری دەروات.

هەلانیـا ئەشکەوتێکی گەورەیەو ئاوبشی تیـایە،

وا پێدەچێت کاتی خۆی مرۆڤی تیا نیشتەجێ بووە.

مناسبی شیرو خەنجەرا: گۆڕستانێکی کۆنە نزیک گوندی برکا ژمارەیەکی زۆر لەکێلەکانی وێنەی خەنجەرو شمشێریان لێ هەڵکەندراوە، بەڵام بەداخەوە حکومەت بەبیانووی بەرشەقام کەوتن بەشی زۆری ئەم گۆڕستانەی لەناوبرد.

سەری ئەلبت: سەری ئەلبت چیاییێکی بلندو ئەشکەوتی زۆری تیایە یەک لەئەشکەوتەکان ئاوی تیایەو دوورنیە کاتی خۆی مرۆڤی تیا نیشتەجێ بووبێت.

مەیدان کۆریک: شوێنێکی حاسێیەو ئاسەواریشی زۆر تێدایە لەسالێ(١٩٤٤) لەشەڕێکا لەنێوان هێزی پێشمەرگەو حکومەتی عێراقی، حکومەت شکاو زیانێکی زۆری لێ کەوت.

**٢- مەلا حەسەن زێباری:**

مەلا حەسەن لەگوندی چاربۆت)ی بارزان لەسالی (١٩١٧) لەدایک بووە، لەمنداڵیەوە خراوەتە بەر خوێندنی ئایین و تاتەمەنی گەنجی لەسەر خوێندن لەگوندی چارپۆت و شارۆچکەی ئاکرێ بەردەوام بووە ، لەسەرەتای چلەکانیش دەچێتە ریزی پێشمەرگەوە، جا بەهۆی هەستی نەتەوایەتی و نەحەوانەوەی لەگوندی چارپۆت بەناچاری لەسالی (١٩٥٧) گوند بەجێ دێلێ و بەرەو ئاکرێ و دەشتی ناوکور دێت و تیا نیشتەجێ دەبێت پاشان ماڵەکەی دەباتە بالەکایەتی و دوای نسکۆی شۆرش لەسالی (١٩٧٥) روو لەوڵاتی ئێران دەکات دوای گەڕانەوەی لەئێران حکومەتی عێراقی لەسالی (١٩٨٨) لە کۆمەڵگای سێبیران نیشتەجێی دەکات. ئەمڕۆکەش مەلا حەسەن نابینایەو کتوپری هەردوو چاوی لەدەست دایە. مام حەسەن گوندی چارپۆت و ناوە جوگرافیەکانی بەم جۆرە پێ ناساندین:

گوندی چارپۆت: گوندی چارپۆت کەوتۆتە باکوری رۆژئاوای بارزان زۆربەی دانیشتوانەکەی لەهۆزی زێبارینە، کاتێ خۆی چوار برا لە هۆزی پۆت ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە بۆیە بەناوی گوندی چارپۆت ناوی دەرکردووە.

ئەم گوندە ئاسەوارێکی زۆری تیایە، بەڵام بەدرێژایی رۆژگار وێران دەکرێت لەوانە:-

دۆڵی دەرێ: ئەم دۆڵە چەند بیرێکی تیایە کە نازانێ کەی لێ دراون، هەموویان بەقالدرمە دەچیتە ناویانەوە.

شکەفتا جنک: شکەفتا جنک (جنۆکە) ئەشکەوتێکی بێ بنە، دەرگایەکی گچکەی هەیە کاتێک بەسەردەکەوی و دەگەیە ناو ئەشکەوتەکە ساریجەیەکی ئاو خواردنەوەی تیا دروست کراوە، کەس نازانێ کێ و کەی دروست کراوە.

گردی دزگە: دزگە گردێکە کەوتۆتە نێوان گوندی چارپۆتێ و گوندی هیکێ و ئاسەوارێکی زۆری خانووبەرەی کۆنی لەسەر ئەم گردە ماوە، نێوان ئەم گردەو گوندی هوکێ هەمووی ئاسەواری خانووبەرەیە، دەڵێن کاتی خۆی ئەم شوێنە شاربووە. خەڵکی ناوچەکەشی بۆ خانووبەرە سوودیان لەم بەردە ئاسەوارییە چاککراوانە بینیووە بۆ دروست کردنی خانووبەرەکانیان، بەتایبەتی ئاغاکان .

کەڤری قەسرێ: کەڤری قەسرێ شاخێکە نزیک گوندی چارپۆت، کاتی خۆی قەسرێکی لەسەر دروست کرابوو کەمێژوویەکەی نازاندرێ، بەڵام ئەمڕۆکە تەنها ئاسەواری قەسرەکە ماوە.

هەروەها لەپشت مزگەوتی گۆڕستانێکی کۆن هەبوو لەسەربەک لەکێلەکان وێنەی خەنجەرێک

هەڵکەندرابوو تا ساڵی ١٩٥٧ کەمن لەوێ بووم ئەو کێلە هەرمابوو.

(ناوی کانیەکانی گوندی چارپۆت):

کانی گەرمکە، یۆتکا، کەترکا، برکا، پەژیر کانیا سپیا.

**٣- یونس ئێبراهیم ساڵح:**

کاک یونس لەگوندی بێرۆشمی سیدەکان لەساڵی ١٩٤٧ لەدایک بووەو لەهۆزی دۆسکییە.

کاک یونس دەڵێت: کاتی خۆی باوکم بەگەنجی لەگوندی (ئورەمار)ی تورکیاوە دێتە بارزان و پاشان دەچێتە لای سەید تاهای نەهری ئینجا بۆ تیرۆشی سیدەکان و لەوێ ژن دێنێت و کاک یونس دەڵێت: دوازدە گوندی باکوری سیدەکان سەید تەها کڕیبووی، جا دوای ئەوەی سەید تەها شکست دێنێت لەشەڕێکا لەگەڵ عوسمانیەکان هەندێک لەچەکدارکانی بۆ ئەو دوازدە گوندە دەگوازرێتەوە کەیەک لەمانە باوکی من بووە، ئەمەش ناوی دوازدە گوندەکەیە:

بێرۆشم، تاوکێ، بیرتێ، گولیژگێ، دێرێ، بۆلێ، بێجوانێ، باغێ،ژڤژیلێ ، بێسیوۆێ، هێردنێ، بەنی.

دانیشتوی ئەم گوندانەش زۆربەیان لەشەمدینان هاتوون کەبریتین لەم هۆزانە: گەردی ، ساتی، بیری، چێتی، هەروەها ژمارەیەک لەبرادۆستییەکانیش لەم گوندانە نیشتەجێن، بێجگە لەبرادۆستییەکان بەهەموو ئەو هۆزانە دەڵێن(موهاجیر).

هەر لەم ناوچەیە دووگوندی فەلان هەیە بەناوی (سیرۆ)و(زەروا) سەربەخان ئاودەلی برا دۆستین.

ئەمرۆکەش هەردوو گوند چۆڵن و هەندێکیان لەدیان نیشتەجێن.

ئەم دوو گوندە ئاسەوارێکی زۆریشی تێدایە ناوی کانیەکانی گوندی بێرۆشم:

کانیێ کەندێ، کانی سپینداریێ، کانیێ بن بەردی، کانیا سۆلێ، کانی بەناوەی ، کانیا دینداریێ.

کاک یونس دەڵێت : ناوچە کوێستانیەکان گیایەکی لێ دەروێت بەناوی دۆنکز کە بەقەد بەژنی مرۆڤ بەرزدەبێتەوە پەلکی وەکو پەلکی تووتن وایەو برێک درێژترە، نێرکەکەی گوڵێکی زەرد دەگرێت دوای هەڵکەندنی ئەم گیایە رەگەکەی دەشورێو سپی دەکرێ ، پاشان وشک دەکرێتەوەو ورد دەکرێت ئینجا لەگەڵ تووتن تێکەڵ دەکرێت و تام و بۆی تووتن خۆش دەکات، جابەهۆی ئەوەی من شارەزایم لەو رووکە هەبوو(بارزانی نەمر)رای سپاردم کە دۆنگزی بۆ ببەم منیش چوومە چیای هندرێن کەلەهەموو شوێنێک زیاتر ئەم رووەکەی تیایەو دوای هەڵکەندن و سپی کردن وشک کردن و وردکردنی تورەگەیەکم لەدۆنگزی ئامادەکراو بۆ بارزانی نەمر برد.

**٤-ئەحمەد شاسوار میرزایز بەم جۆرە لەریشەی هۆزی هەرکی دوا:**

هۆزی هەرکی دەوروبەری (٢٥٠) دووسەدوو پەنجا ساڵێکە دروست بووە. واتە هۆزێکی نوێیە، سەرەتا بنەماڵەیەک لەبنەماڵەکانی میرانی جزیرەو بۆتان جیادەبنەوە، جیابوونەوەکەشی بەهۆی ناکۆکی(ئەبو بەکر)ی سەرداری ئەم بنەماڵەیە بووە لەگەڵ میرانی جزیرەو دەچنە لای میری شەمزینان، ماوەیەکی زۆر لەشەمزینان دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی بەینیان لەگەڵ میرانی شەمزینان تێک دەچێت ، چەند تێک هەڵچونێک روودەدات، ژمارەیەک لەچەکدارانی هۆزی هەرکی بەرێگای بارزان دێنە ئاکرێ و واز لە چەکداری دێنن و دەست بەمەرداریی و گەرمیان و کوێستان دەکەن لەنێوان

ورمێ و شـەمـزینان و ئاکـرێ و دەشـتی هەولێـر و ژمارەیەکـیشـیـان لەگونددکـانی ورمێ و شـەمـزینان نیـــشـــتـــەجێ دەبن. بەتایبـــەت لەگـــوندەکـــان دۆڵی(هەرک و بێـدەو) کـە نزیکی کـوێسـتـانی چوارچەلی هەرکیانە.

ژمارەیەک لەم هەرکیانە ، پاییز مانگێکی دەما دەچوونە چیای قەرەچوغ و دەشتی قەراجێ و بەهار مانگێکی دەماو دەگەڕانەوە کوێستانێ.

جـارێک لەجـاران لەسـەر باجی مـەڕ لەگـەڵ عوسمانیان دەبێتە شەڕیان ، لەئەنجاما ژمارەیەک چەندرمـە دەکـوژرێن و(١٢) دوازدە هەرکـیـیش شـەهیـد دەکرێن و لەبناری چیای قـەرەچوغ دەیان نێژن.

هەروەها مـام ئەحـمـەد دەڵێت: دوای جـەنگی جیهانی یەکەم هەرکی و شەمزینان بەیەکەوە لەگەڵ مـیـری شـەمـزینان دژی حکومـەتی نوێی ئەتاتورک دەوەستن و دوای شـەڕکـردن بۆ مـاوەی مـانگێک ، هەرکـیـە چەکـدارەکـان بەرەو ورمێ رادەکـەن و گوندێکی زۆر لەتەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، دەشتەبێل و دۆڵی قاسملو دەگرن، ژمارەیەکشیان دەچێتە ڕێزی شۆڕشگێڕانی سمکۆی شکاک، بەفێلی مفاوەزات و ڕێککەوتن دەکوژرێ، چەکدارانی هۆزی هەرکی ورمێ بەجێ دێلن و دێنە کـوردسـتـانی عـێـراق- لە گـــوندەکـــانی نێـــوان کـــۆرێ و زێی بادینان بڵاو دەبنەوەو دەست بەمەڕداری دەکەن، هەندێکیشـیـان لەگوندەکانی پشووری ئاکرێ بڵاودەبنەوە.

ئەمـرۆکـەش هۆزی هەرکی لەپارێزگـای هەولێـر لەنێـوان شـەقـلاوەو کـەلەک و گـوێڕ نیـشـتـەجـێن لەئاکـرێش لەناحـیـەی گـردەسـێن و گـوندەکـانی دەوروبەری و لەتورکیاش لە شارۆچکەی شەمزینان و گەوەڕو دۆڵی هەرک و بێ دەو نیشتـەجێ ناو تا ساڵی پار ژمارەیان گەیشتە(٤٤٦٠) خێزانە.

بەڵام هۆزی هەرکی لەئێران لەنێوان شاری ورمێ تاسنووری تورکـیــا بڵاون، ژمــارەیان دەگـــاتە دەوروبەری(٢٠٠٠) هەزار ماڵ.

تاکو ساڵی پار ژمارەیان لەپارێزگای ورمێ بەم جۆرە بوو (٤٢) گـوند لەمـەرگـەوەڕو گـوندەکـانی دیکەش بنەمـاڵەی نەهری تیـا نیـشـتـەجێ بوون، (٢١) گـوند لە دەشـتـەبێل، لەتەرگـەوەڕیش دەوروبەری(١٠) گـوند هەرکـینە لەوانە:مـاوان، کوڕانە، ئەمبێ، خانەگی.

گوندی(بالاوە)ش هەمووی هەرکینە ئەمڕۆ بووەتە گـەرەکـێکی شـاری ورمێ دۆڵی (ئیـلـەو دێرا)، دۆڵێکە لایەکی هەرکـیـەو لایەکی دیکەی هۆزی (دری)یە.

گارە ، گلێشم ، بێگوزا، بێکار، نغایلا لەگوندە گەورەکانی هۆزی هەرکینە لەشەمزینان.

٥- سـمکۆ فـەتحـولڵا بەم جۆرە لەریشـەی هۆزی هەرکی دوا:

هۆزی هەرکی لەنەوەی کـوردێکی(شام)ە بەناوی شێخەک و ئیسلام نەبوو، دەوروبەری (٧٠٠) ساڵ لەمـەوبەر شـێـخـەک دێتـە گـوندی ئاژگـەی نزیک سەربەن (هاوینەهەواری پیرمام)، دوای ئەوەی سێ پشت لەم گوندە دەمێننەوە زیادیان نەکرد، تاقانەی چوارەم کـوڕ، چوار کـوڕی بوو، یەکـێکـیـان بەناوی تەیب، بەهۆی دروست بوونی ناکـۆکی لەناوچەکە، باردەکـات و دەچێـتـە لای مـیـری شـەمـزینان، لەوێ ڕۆڵێکی باشی بینی لە یارمـەتی دانی سـوپای شـەمـزینان لەدژی نەیارەکـانی ئەم ئیـمـارەتە، بۆیە میرانی شەمزینان ژنیان بۆ تەیب هێناوە.

دوای ئەوەی نەیارانی مـیـر تەیب دەکـوژن و کـوڕەکـانی تەیب تۆڵەی باوکـیـان دەکـەنەوەو بەرەو چارچەل و هەرک و بێ دەورەو دەڕۆن کـەناوچەیەکی سـەخت و حـاسێ بووە، پاشـان بەناوی چارچەلی

هەرکیـان ناوی دەرکرد، واتە ناوی هۆزی هەرکی ی نەوەی تەیبی لەناوی ناوچەی (هەرک) هاتووە. (چەل)یش لەزمانی کوردی بەو چیایە دەگوترێت کە زنجیـرە چیا نەبێت واتە یەک لوتکە بێت. تا ئەو کـاتەیش نەوەی تەیب نەبوونەتە ئیسـلام بۆیە لەلایەن هۆزی کـوردی ئیسـلام بەردەوام دژایەتی دەکران، کاک سمکۆ دەڵێت بەقسەی هەندێک لە بەتەمەنەکانیان هۆزانی کوردی ئیسلامی ناوچەکە چەند هێرشێکیـان کـردۆتەسـەر هۆزانی غـەیرە ئیسـلامی وەک هەرکی و چەند هۆزێکی دیکە، بەڵام شکسـتیـان خـواردووەو، بۆیە بڕیاریان داوە هەرکیتان دەستگیر کرد بی کوژن) جاناوی هۆزی هەرکی لەوشەی (هەرکیـتـان) هاتووەو گـۆڕاوەو بووەتە هەرکی. ئینجا هەرکیـەکـان(١٢) دوانزدە دەساڵ لەچیا مانەوەو تێکەڵ بەهۆزانی موسلمان نەبوون، پاشان ژمارەیەک مەلا چوونە ناویان و تێ یان گەیاندن کە ئیسلام ئایینێکی نوێیەو سوودی هەیە بۆیان، ئینجا هەرکی ئایینی ئیسـلام قـەبول دەکەن و مەلایەکیش بەناوی (سمایل) دەنێرنە ناو هەرکیـان بۆ ئامـۆژگـاری کـردنیـان و مـەلا سـمـایل ژنێکی هەرکی دێنێت لەناو ئەوان دەتوێتـەوەو دەبێتە هەرکی.

مـەلا سـمـایل دووکـوڕی دەبێت بەناوی (شینۆ)و(شەمۆ)، شینۆ ژن دێنێت و (٧)حەوت کـچی دەبێت، شـەمـۆش ژن دێنێت و (٧) کـوڕی دەبێت، شەمۆ بەخورتی دەیەوێت کچەکانی شینۆ بۆ کوڕەکانی بخوازێت، ژنی شینۆی زیرەک بوو رابوو چووە لای مـیـری گـەردیانی تورکـیـاو بەمـیـری راگەیاند کە شوبرایەکانی دەیانەوێت زۆرداری لێ بکەن و بەخـورتی کـچەکـانی لێ وەربگرن، منیش رازی نیـمە کـچـەکـانی خـۆم بدەمە شـوبرایەکـانم، ئەگەر تۆ رازی بی ئەوا دووکچی خۆمت دەدەمێ بۆ کوڕەکانت تۆش کچێکی خۆت بدێتە شینۆی، میر رازی دەبێ و کاتێک ژنی شینۆ چاوی بەکچی میر کـەوت و لەبەر جـوانیـەکـەی دڵی گـرت و بەڵام نەیزانی کەم عەقڵە.

دوای ئەوەی زەمـاوەندکـراو سـاڵێکی بەسـەردا رابوورد شینۆ دوو کـوڕی جمکی بوو، ناوی لێنان (مژدین)و(دۆدێ). نەوەکەیان ئەمڕۆ بەنەوەی شینۆ دەناسرێن، دەڵێن نەوەی شینۆ روخسار و سیمایان جـوانەو بەڵام زۆر زیرەک نینە واتە بەکـچی مـیـری گەردیان چووینە.

هەروەها (تەیب)یش چوار کـوڕی هەبووە بەناوی پیـرۆ، عـەیدۆ، سـۆرێ، بەدۆ، ئەمـڕۆ هەریـەک لەم کوڕانە تیرەیەکیان لێ وەپاش کەوتووە بەناوی ماڵە پیـر، مـاڵە حـەید، مـاڵە بەردخـان (بەدۆ). مـاڵی گـەورەی شـەمـۆ مـاڵە حـەجیـە سۆری پێ دەڵێن، بەشێک لەبەرەی ئیبـراهیم نەوەی شـەمـۆ چوونەتە گوندی قەرەچەتانی سلێمان.

تیرە گەورەکانی هۆزی هەرکی ئەمڕۆش ئەمانەن:
سجرهاتی، ماڵە شینۆ، شەم مەندا (ناوخۆشی)، مژدین .

کـاک سـمکۆ وتی: دەوروبەری (٧-٨) پشـتـە جارێک لەقەرەچوخ حکومەتی عوسمانی دەیەوێت غـەدر لەمـەڕ دارانی هەرکی بکات، لەئەنجـامی روودانی شەڕێک ژمارەیەک لەجەندرمەی عوسمانی دەکوژێت و (١٦) شازدە کەسیشی لەهۆزی هەرکی دەکوژرێن و هەر لەبناری قەرەچوغ دەیان نێژن تاکو ئەمـڕۆ خـەڵـک ناوی منداڵەکـانیـان بەناوی ئەم (١٦) شازدە شەهیدە ناولێدەنێن لەوانە جیهانگیر ئاغـاو سـەیدخـان بەگـە ئەمـڕۆکـەش هۆزی هەرکی لەپارێزگـای ئازربایجـانی رۆژئاوا، هەولێـر، هەکاری، موسل، جێوارن و بەشێکیان لەگوندی قەرەچەتانی سلێمانی نیشتەجێن هەندێکیشیان

لەدیالە جیاوارن و بوونە عەرەب پێیان دەڵێن ئەرکیە. هەروەها ژمارەیەک لەهۆزی هەرکی لە شەهرە کوردی بەختیاری نیشتەجێن و کاتی خۆی بۆ ئەوێ گواستراونەتەوە.

**پەراوێز:-**

* سێبیران جاران گوندێکی گچکە بووە، ناوەکەشی لەناوی ئەوسێ (بیر)ە هاتووە کە لەزۆر کۆنەوە لێدراوەو لەساڵی (١٩٨٢)ش کراوە بەکۆمەڵگا.

کۆمەڵگای سێبیران کەوتۆتە رۆژئاوای شاری هەولێر نزیک بەگردۆلکەکانی رەشکێن.

* زۆربەی تیرەو هۆز بەناوی شێروانی لەهەموو کوردستان هەیەو زۆرناوی جوگرافیش بەناوی شێروان هەیە جانازاندرێ سەرچاوەی ئەمانە هەمووی یەکە یان یەک ناگرنەوە.

* ناوی چیای حەسەن بەگ بەناوی حەسەن بەگی باپیرەگەورەی شێروانیان ناودار کراوە.

* ژمارەیەک لەکاوانی لەگوندی مام خەلیفەی نزیک گردەشێن نیشتەجێن.

* دەربارەی ریشەی هۆزی هەرکی هەندێک دەڵێن: ئەندامێکی بنەماڵەی میری جزیرەو بۆتان بەهۆی ناکۆکی دەچێتە نێو هۆزی شەممەرو ناوی ئەو کەسە (ئەبو بەکر) بووە، کچی شێخی شەمەر حەز لە ئەبوبەکر دەکات و شێخیش بەخزمایەتی ئەبوبەکر رازی نابێت، بۆیە ئەبوبەکر کچە شەممەر هەڵدەگرێت و دەچێتە لای میری شەمزینان و رۆڵێکی باشی دەبینێت لەیارمەتی دانی میر. ئەبو بەکر سێ کوڕی دەبێت لەکچی شێخی ، ئەمانەن: سیدان، مەندان، سەرهەد(سەرحەد) شێخی شەمەر چەند جارێک دەچێتە لای میری شەمزینان بۆ تۆڵە کردنەوە لە ئەبوبەکر، تامیر رازی دەکات ئەبوبەکر بکوژێت.

ئەبو بەکر رۆژانی هەینی دەچووە راوێ میریش چوا پیاوکوژی خۆی هەناردە بەراییێ تا ئەبوبەکر بکوژن، جادوای ئەوەی ئەبوبەکر لە راو دەگەرێتەوە کتوپڕ دەکەوێتە ناو بۆسەی پیاوانی میرو توشی شەڕەخەنجەر دەبێت و لەگەڵیان، لەراوەشاندنی خەنجەرێک بۆیەکێکیان، بەدرەختێک دەکەوێ و لەدرەختەکە دەچەقێت، لەراکێشانی خەنجەرەکە، دەسکەکەی دەشکێ و تیغەکەشی لە درەختەکە بەجێ دەمێنێ، ئەبوبەکر بەبێ خەنجەر دەمێنێتەوەو خۆی بەدەستەوە دەدات و دەڵێت من دەزانم میر ئێوەی رەوان کردووەتا من بکوژن جا بەرلەوەی بم کوژن، حەزدەکەم هەرسێ کوڕەکەم ببینم، ئینجا ئەبوبەکر لەدارێک دەبەستنەوەو یەک لەپیاوانی میر هەرسێ کوڕەکەی بۆ دێنن کە تەمەنیان لەنێوان (١٠-١٥) ساڵی دابووە.

ئەبوبەکر پێیان دەڵێت: کوڕەکانم من بەفەرمانی میر دەکوژرێم جا چەند ئامۆژگاریەکم هەیە دەمەوێ لەگوێی بگرن کە ئەمانەن:

١- هەرگیز باوەڕ بەمیری شەمزینان مەکەن.

٢- خەنجەرتان سێ بزمار بێت، نەوەک دەسکەکەی لەتیغەکەی بپچڕێت.

٣- هەوڵ بدەن لەچوار ژنان کەمتر نەهێنن و بەنەوەکانیشتان رابگەیەنن.

٤- لەگەڵ دایکتان لای میر دەڕۆن و دەچنە ناوچەی هەرک و بێ دەوو لەوێ مەڕداری دەکەن.

دوای ئەوەی دەچنە ناوچەکەو مەڕداری دەکەن بەدرێژایی رۆژگار ژمارەیان زۆر دەبن و هەریەک لەم سێ کوڕە تیرەیەکی لێ بەپاش دەکەوێت و بەردەوام گەرمیان و کوێستان دەکەن.

# مامۆستا نەژاد عەبدوڵڵا مشتێک لەسەربردەکانی دەگێڕێتەوە

## ئامادەکردنی/ جەمال ئیسماعیل

**مامۆستا نەژاد عەبدوڵڵا یەکێکە لەکەسایەتییە دیارەکانی شاری هەولێر، مرۆڤێکی رۆشنبیرەو لەخێزانێکی رۆشنبیریش لەدایک بووە، بڕوا ناکەم هەولێرییەک هەبێ ئەم زاتە نەناسێ و یادگاریان لەگەڵدا نەبێت، لەبەر ئەوەی زۆر شوێن گەڕاوەو گەلێک یادگاری خۆشی هەیە، بۆیە لەڕۆژی ٢٠٠١/٩/٢٠ سەردانی بەڕێزیم کردوو لەبارەی یادگارییەکانی هێنامە دواندن و ئەویش کەمێک لە سەربردەکانی بۆم دواو وتی:**

من نامەوێ بەدوورو درێژی لەبارەی ژیانی خۆم بدوێم لەبەر ئەوەی کەپێویست نییە بۆ زۆرکەس ژیانی تایبەتی مرۆڤێک بزانێ، ئێستا ژیانم بریتییە لەسێ قۆناغ، منداڵی، هەرزەکاری، پیری.

ژیانی منداڵیم: لەساڵی ١٩٣٥ لەهەولێر لەماڵێکی خوێندەوار لەدایک بوومە، ئەوکات باوکم بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەولێری ئولا بوو، لەتەمەنی (٢-٣) ساڵی چوومە باخچەی ساوایان کە لەتەنیشت قوتابخانەی ئولا بوو، لەشوێنی ئێستای بانکی رافیدەین، بەڕێوەبەرەکەمان ئافرەتێک بوو بەناو (فەریدە) مەسیحی بوو، پیاوەکەی ناوی سەلمان بوو، پیشەی مامۆستا بوو، ماڵمان ئەو کات لەپشت فەرمانگەی پۆستەو تەلەفۆن بوو، کەئێستا لەگەڵ پارێزگا تێکەڵ بووە، لەتەمەنی (٦-٧) ساڵیدا چوومە قوتابخانەی (سانیە) کە بە ڕێوەبەرەکەی (ئەحمەد ناجی) بوو باوکم منی بردە ئەم قوتابخانەیە لە قوتابخانەکەی خۆی دانەنام، بۆ ئەوەی وا پیشان نەدەم کە باوکم بەڕێوەبەرە لەخوێندندا کەم تەرخەمی بکەم، چەند ساڵێک لەم قوتابخانەیە دەمخوێند، دواتر باوکم گوێزرایەوە بۆشاری کەرکوک، لەپاشان بوو بە بەڕێوەبەری چەندین ناحیەو قایمقام، لەبەر ئەم هەموو راگوێزانە خوێندنی سەرەتایم لەچەند شارو قەزاو ناحیە تەواوکرد، وەک لەشەقلاوەو رواندوز، گەلالە، حەویجە، تاوغ، دوز، کفری، ئاغجلەر، چوارتا، لەساڵی ١٩٤٨ کە لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، کەوتمەناو دەریای سیاسەت، ئەو ساڵ پێیان دەوت ساڵی وەثبە، هەموو عێراق لەباکور هەتا باشور هەڵسان بەخۆپیشاندان دژی حکومەت منیش لەناوئەو شەپۆلە بووم، ساڵی ١٩٤٩ لەپۆلی یەکەمی ناوەندی بووم، لەهەولێر بوومە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان لەشانەی ژمارە(١) کە هەڤاڵان وریا کانی مارانی و ئەحمەد عەلی کاکە خان و لەگەڵ چەندین ئەندامی دیکە کە ناویانم لەیاد نەماون، کۆبوونەوەمان لەماڵی خوالێخۆشبوو عەونی یوسف بوو، لەساڵی ١٩٥٤ چوومە ئامادەیی کشتوکاڵ لەبەغدا، سێ ساڵ لەوێ بووم، لەوێش لەناوچەی قوتابیانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئەبو غرێب کارم دەکرد، ئەو هەڤاڵانەی کە لەیادم ماون ئەحمەد شێخ رەئوف بەرزنجی خەڵکی سلێمانی لەنەوەی شێخ مەحمودی حەفید زادەبوو، رەمزی سەعید ئاغا هەولێری، شەوکەت ساڵح بەگ میران، شەقلاوەیی بوو، دواتر هەڵبژێردرام بۆ خوێندنی باڵا نێردرام بۆ پاکستان چوار ساڵ لەوێ بووم، هەروا سەرۆکی قوتابیانی عێراق بووم لە هیندو پاکستان، نوێنەری رۆژنامەی خەبات بووم بابەتم بۆ دەناردن بەتایبەتی پاش شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ لەعێراق، بەم چوار ساڵە کۆلێژی کشتوکاڵیم تەواوکردو لەپاکستانەوە چوومە هیند لەهندستان لە زانکۆی (دەلهی) خوێندو بڕوانامەی ماجستێرم لەسەر(علم وراثە نبات) واتە (بۆ ماوەی زانستی رووەکەکان) وەرگرت لەپاشان



مامۆستا نەژاد

گەشتێکم کرد بەرەو (نیپاڵ) بەنگلادیش، سیلان، هۆنکۆنگ، یابان، دوای گەڕامەوە وڵات لەڕێگای کەشمیر، ئەفغانستان، ئێران، ئینجا چوومە کۆلیژی سەربازی یەدەگ (احتیاط) ئەو کات ئیجباری بوو دوای دووساڵ مەشق، بووم بەمولازمی یەکەم، یەک نەجمەیی پاش دووساڵ تازەم نەکردەوە، بوومە فەرانبەر لەفەرمانگەکانی کشتوکاڵی لەکەرکوک دوای چەندین ساڵ گوازرامەوە مامۆستایەتی لەئامادەیی کشتوکاڵ لەهەولێر بووم بە بەڕێوەبەر، دواتر لەکشتوکاڵی کەلەک و زاخۆو بوومەتە بەڕێوەبەریان، لەپاشان گەڕامەوە پیشەسازی کارەبایی و میکانیکی لەهەولێر، تاساڵی ١٩٨٧ لەسەر داوای خۆم خانەنشین کرام و کتێبخانەیەکم کردەوەو دانیشتم.

**بەشێک لەو ڕووداوانەی کە دیومەو لەبیرمە:-**

١- کۆڕی ئەدەبی لەهەولێر ١٩٤٠-١٩٤١.

٢- جولانەوەی ڕەشید عالی گەیلانی وە دەوری سالح زەکی ساحێب قران، کە پارێزگاری لەهەولێر بوو لەساڵی١٩٤١.

٣- جولەکە ناودارەکانی هەولێر وەکورتە باسێک لەسەر جموجۆلی ئەدەبی و هونەرییان.

٤- چەند ناودارێکی هەولێر وەکو ئەدیبەکان، عەونی یوسف، دانیال قەساب، زەکی بارۆخ، مستەفا نەعمە تولڵا لەهونەرمەندان تاهیر تۆفیق، ڕەسول گەردی، حاجی حەیدەری (حەیدەرە کەچەل)، فوئاد ئەحمەد، جەمیل عەلۆیی.

٥- بەکورتی یادەوەری نەورۆزی ساڵی ١٩٣٨.

٦- جموجۆلی حیزبایەتی ئەوکات لەگەڵ ئەدەبیاتی حزب لەگەڵ هاتنی تەرمی شەهید خێروڵلا عەبدولکەریم وەناشتنی.

٧- چەند لایەنێک لەپەیوەندی کۆمەڵایەتی و خزمایەتی لەهەولێر.

**ئەو ناودارانەی کە لەژیانمدا چاوم پێکەوتوون، چ کەم یان زۆر**

لەپێش هەموویان مستەفا بارزانی نەمر، کەسەرۆکی میللەتی کورد بوو، وەهەردەم لەمێژوودا دەمێنێ، دووجار بەدیداری شاد بوویمە جاری یەکەم لەساڵی ١٩٤٣ کەمنداڵ بووم ئەوکات باوکم بەڕێوەبەری ناحیەی بوو لەمێرگەسۆر بوو، ئێوارەیەکی درەنگ خەبەریان هێنا کە مەلا مستەفاو شەش کەسی لەگەڵ دایە، لەسلێمانیەوە هاتوونەتە بارزان، ئێستا لەسەر فلان کانی کە ئەو کانیەی دەکەوێتە خوار بەرزاییەکەی مێرگەسۆر لەبن سێ چوار دار گوێزو تاوک کەسێبەرێکی خۆشی هەبوو، دانیشتوونە، باوکم لەگەڵ یەک دوو پۆلیس و منیش چووم کە ئەوکات تەمەنم (٨-٩) ساڵان بوو چووین چاوم بە سەرۆک کەوت بەسروشتی لەناو دڵم چەسپی بوو یەک دوو سەعاتێک ماینەوە، وەخواردنی ئێوارە لەئێمەوە بۆیان چوو، وە بۆ زیاتر ڕووناک کردنەوەی هاتنەکە باوکم بەرپرسیاری دووەمی حزبی هیوا بوو، کە یەکەمەکەی ڕەفیق حیلمی بوو، بۆ جاری دووەمیش کە بەدیتنی بارزانی نەمر شادبووم لەساڵانی حەفتایەکان بوو لەحاجی ئۆمەران بەخزمەتی شاد بووم، کەشوێنی بارەگاکەی بوو، نیو سەعات لەگەڵی دانیشتم، لەیەک شت سەرم سوڕما ئەویش یەکسەر فەرمووی تۆ کوڕی عەبدوڵلای کە ساڵی چلەکان بەڕێوەبەری ناحیەی مێرگەسۆر بوو، گوتم بەڵێ، پرسی باوکت ماوە، گوتم: نەخێر وەفاتی کردووە، گوتی: خوالێخۆش بێ، مرۆڤێکی زۆر باش و کوردێکی باش بوو، منیش گوتم جەناب چۆن زانیت من کوڕی ئەوم، گوتی: لەشێوەت دیارە، بەڕاستی من ئەم زیرەکیەیَ ئەم مرۆڤە بەرزە لەبیرناکەم، کەپاش سی و ئەوەندە ساڵە بەشێوە بزانێ من کێم وەلەهەمان کاتیشا برادەرێکی وانەبوو لەگەڵ باوکم کە لەبیری مابێتەوە ئەمە واپیشان دەدا کە ئەم مرۆڤە زۆر بەوەفاو وەبیر تیژبوو، لەساڵانی دوای ڕاپەڕین لەگەڵ بەڕێز سەرۆک کاک مسعود بارزانی لەسەری بلند دیدارێکم کرد ئەم یادەوەریەم بۆ گێڕایەوە زۆری پێ خۆش بوو، هەروا لەم دیدارە کورتەدا لەگەڵ سەرۆک مسعود بارزانی بۆم دەرکەوت کە کورد لەم لایەنەوە بەختی هەیە کە سەرۆکێکی زیرەک، هۆشیار، وەکو کاک مسعود هەیە.

٢- لەناودارانی کورد کە هەمیشە لەیادمن سەید ئەحمەدی خانەقا وەشێخ حوسێنی کوڕی، لەخانەقای خۆی لەشاری کەرکوکی کوردو کوردایەتی. ڕۆژی دەیان نیشی خەڵکی بەڕێوە دەبرد وە ڕۆژێک لەدیوەخانی

سەیدو شێخەکانی عوبێد کە عارەبن، دانیشتبوون. لەشێخەکان شێخ حاسل عەلی وەشێخ حوسێن ئەلعەلی کەباس هاتە سەر مەسەلەی کورد ئەم شێخانە پێیان لێنا کەناوچەی حەویجە هەموو کورد بوون، ئەوانە بۆ لەوەڕی مەڕو ماڵات هاتبوونە ئەو دەشتە، ئەمەش ئیسپاتێکە لەسەر کوردایەتی کەرکوک وە دەوروبەری هەتا چۆمی زاب و چیای حەمرین داگیر کراوە.

٣- سەعید قەزاز:

سەعید قەزاز لەسیبیەکان لەسەردەمی پادشایەتی، برادەری باوکم بوو، بەتایبەتی لەساڵی ١٩٣٥ کە فەرمانبەرێکی بچوکی ناحیەی شەقلاوە بوو، کە بوو بە وەزیری ناوخۆ لەساڵانی پەنجاکان چوومە لای، وەنامەیەکی باوکیشم برد بۆی، کە چوومە پرسگەی زۆر قەڵەباڵغ بوو، چەندین لەشێخە عارەبەکان و ئاغایەکانی کوردەواری و بەگزادەکانی جاف، ئەو کات قوتابی پۆلی سێی ناوەندی بووم، لەناو ئەوانە لەهەموویان بچوکتر بووم بەتەمەن و بە پیشە، ئومێدم نەبوو کە ببینێ، بەڵام کە بەرپرسی پرسگە ناوی منی بردە ژوورەوە بۆ لای وەزیر، زۆر سەرم سوڕما کە یەکەم کەس منی بانگ کرد، چوومە ژوورەوە، کورسیەک لەپێش مێزەکەی بوو، گوتی: کورسیەکە هەڵگرە لەتەنیشتم دابنێ و لەسەری دانیشە، دەستی کرد بەباس و خواستی کۆن بەتایبەت زەمانی منداڵی زیاتر لەنیو سەعات لەگەڵم دوا، دوایی گوتی نابێ بڕۆی دەبێ نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین، دەوام کۆتایی هات بە خۆی و بەیەک پۆلیس حیمایەو کە لەپێشەوەی دانیشت چووینە ماڵیان، دیوە خانەیەکی سادە، سەلەخانی دایکی لەگەڵ زەکیەخانی خێزانی وە پەریخانی کچی بەخێر هاتنیان کردم، ژووری نان خواردنیان، مێزەکی سادە بەشەش کورسی، ئەوەندە بوو ماڵی وەزیری ناوخۆی حکومەتی نوری سەعید.

**سەربوردەم لەگەڵ ناوداری عەرەبەکان:**

**١- مەلیک فەیسەلی دووەم.**

دەمەوێ بەتێرو تەسەلی لەسەر دیداری ئەم مەلیکە بدوێم، ساڵی ١٩٥٤ مامم کەناوی عەبدولڕەحمان عەزیز بوو، معاون پۆلیس بوو لەعەمادیە، رۆژێک لەپشووی هاوین لەگەڵ چەند برادەرێک کە ئەو کات ئەوان دەورەی سەربازیان هەبوو بۆ دەرچوانی کۆلیژەکانی عێراقی لەسەربازگەی سکرین نزیک هاوینە هەواری سەرسەنگ، رۆژانی پێنج شەم و هەینی لەگەڵ چەند برادەرێکی کورد لەو سەربازگەیە دەچووینە سەرسەنگ تا درەنگانی شەو کە گازینۆو میوانخانەی گەورەی هەبوو کاتمان بەسەر دەبرد، رۆژێک عەسرەکی درەنگ دانیشتبووین، پۆلیسێک هات داوای لێ کردین کە ئەوێ چۆل بکەین، چونکە مەلیک دێتە ئەو شوێنە، ئەوکات مەلیک ماڵیشی لەوێ بوو، ئێمەش هەڵسایین بڕۆین، لەپێش دەرگا خۆی و مرافقەکەی کەناوی عەبدولڵا ئەلموضایفی هاتە ژوورەوە کە ئێمەی دیت دەرۆین ئێمەی گەڕاندەوە لەباخچەی میوانخانەکە لەگەڵی دانیشتین، وتی کامتان یاری تێنس دەزانن یاریتان لەگەڵ بکەم، یەک دوانەک هەبوون دەیانزانی، چەند کاتەک گەمەیان لەگەڵ کرد، دواتر نەیهێشت بڕۆین داوای کرد کە نانی ئێوارەی لەگەڵ بخۆین، ئەوە بوو نانمان لەگەڵ خواردو زیاتر لەسەعاتێک لەگەڵی بووین بەقسەی خۆش خۆش و گفتوگۆو پێکەنین ئینجا بەجێمان هێشت ئەمە بوو دیموکراتیەتی مەلیکێک.

**٢- د. سەدیق ئەتروشی:**

کە بەڕێوەبەری گشتی نێژە بوو، ساڵی ١٩٥٧ زۆر یارمەتی کوردی دەدا بۆدەرەوەی وڵات. هەروا زۆر یارمەتی منیشیدا، کەتوانیم بەکەلۆریۆس وەماجستێر لەدوو زانکۆ، زانکۆی پنجاپ لەپاکستان وەزانکۆی دەلهی لەهینستان کە ماجستێرم لێ وەرگرت، بەهۆی ئەم خوێندنە چاوم بەزۆر کەسی ناودار کەوت وەک جواهیر لال نەهرۆ، مستەر پاراسات (سەرۆک کۆماری هیند) ماریشال ئەیوب خان سەرۆک کۆماری پاکستان.

**١- جەواهیر لال نەهرۆ:**

من کە لە دەلهی بووم (پایتەختی هیند) لەشوقەیەک ژوورێکم گرتبوو خاوەنی ماڵەکەمان ژنێکی سویسری بوو ناوی (مادام جین) بوو، پێم گوت دەمەوێ بچمە لای جەواهیری لال نەهرۆ، کە ئەوکات سەرۆک وەزیرانی هیند بوو، جین گوتی: ماڵی نەهرۆ لەشەقامی پشت ماڵمانە، منیش هەروا بەپیاسە رۆیشتن چوومە

شەقامەکە یەک بەیەک ناوی ماڵەکانم دەخوێندەوە کە لەسەر دەرگا نوسرا بوو تاگەیشتمە بەر دەرگای ماڵی جواهیر لال نەهرۆ لەسەر دەرگاکە نوسرا بوو شیری لال نەهرۆ ،سەیری بەردەرگام کرد نە پاسەوان، نە ئۆتۆمبیل هیچ نەبوو دەرگای ماڵەکە والا بوو ، باغەوانچیەک بەسۆندە باخچەکەی ئاو دەدا، ئەوان ماڵیان هەرچوار دەوری بەگوڵ و سەوزایی رازاوەتەوەو خانووەکە لەناوەندیەتی و بەرێگایەکی بەردرێژ دەچیە ژوورێ، هەموو ماڵە دەولەمەندەکانی هیند لەو شێوەیەن کەشێوەی ئینگلیزی پێ دەڵێن، لەبەردەرگا بەباغەوانچیەکەم وت مستەر نەهرۆ، ئەو بەهیندی وتی: ئیدەر، ئیدەر مانای برۆ ژوورێ، چوومە ژوورێ، پاسەوان نییە، لەژوورێکی بچووک کەیەک دوو کوری لێ بوو، کاتبەک دانیشتبوو، لێی پرسیم بۆچی نەهرۆت دەوێ، وتم من قوتابیەکی عێراقیم حەزدەکەم بیبینم، ناوم و ژمارەی پاسەپۆرتەکەی نووسی و ئینجا وتی: فەرموو برۆ ژوورێ، چوومە ژوورەکی گەورە (١٠-١٥) لەسەرۆکە گەورەکانی هیندستان بوون وەک مستەر پاراسات سەرۆک کۆمار، داراسینخ وەزیری بەرگری و زۆرانی دیکە، دانیشتم پاش چەند دەقیقەیەک نەهرۆ هاتە ژوورێ یەک یەک لەگەڵ هەموویان قسەی کردو هاتە لای من، من کە جلی کوردیم لەبەربوو، گوتی: ئەفغانی، گوتم نەخێر، ئەو وەلامی داوە گوتی: کوردی،گوتم: بەڵێ گوتی کوردی عێراقی یان ئێرانی، چونکە جلەکەکانت لەکوردی تورکیاو سوریا ناکا، گوتم: بەڵێ کوردی عێراقیم، قوتابیم لێرە، وسەرۆکی قوتابیانی عێراقیم لەهیندو پاکستان، ئینجا وتی: چی دەپرسی بپرسە، بەلام بلاوی مەکەوە، لەرۆژنامەکان لە راگەیاندن منیش زۆر شتم لێ پرسی، وە ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبوو، ئەوم لێ پرسی گوتی: کورد وەکو هەموو میللەتانی جیهان هەر رۆژێک سەربەخۆییدەبینن، ئەگەر کەم ئەگەر زۆر بەلام ئێوە ئەم سەربەخۆییە بپارێزن، دەبێ هۆشیاری وە خوێندەواری بلاوبکەنەوە لەناو کۆمەڵگای خۆتان، چونکە ئێوە هەرچوار دەورتان بەدوژمنی خۆتان دەوردراوە، لەسەر گێتی کەس وەکو کورد مەغدور نییە وەلەناو دوژمنی خۆیدا دەژیت، بەلام رۆژی خۆشیتان هەیە، هەروا وتی: من لەکتێبەکەم دەروازەیەک بۆ مێژووی جیهان بەدرێژی باسی کوردم کردووە، وەبرادەری کوردیشم زۆر هەبوو لەئینگلتەرا، ئەگەر لەژیاندا مام، دەولەڵەکەتان بوو، من یەکەم کەس دێم سەرتان لێ بدەم، ئینجا لەکۆتایی قسەکان داوای وێنەم کرد کە لەگەڵی بگرم، گوتی من ئامادەم بەلام بەداخەوە خۆم کامیرەم پێ نەبوو، ئەوەندەم کرد لەسەر رەفێک وێنەکی خۆی بەتەنیا وە وێنەی جەمال عەبدولناسر وە سۆکارتۆ وەتیتۆ، دەولەتانی بێلایەت (دول عدم الانحیار) وێنەکەی ئەوم هەڵگرنە چوار چێوەکەی دەرم هێنا بردم، من زۆر بەختیار بووم کە ئەو پیاوە گەورەیە کە ئەو کاتە (٧٥٠) ملیۆن خەڵکی بەرێوە دەبرد بێ پاسەوان و وەبێ مەوعید دانان خەڵکی دەدیت، خۆزگە لێپرسراوانی ئێمەش چاوێکیان لەم پیاوە بکردایە.

**٢- مارشال ئەیوب خان سەرۆک کۆماری پاکستان:**

ئەو کاتە بینیم کە هاتە زانکۆکەمان، ئێمە کەقوتابی بێگانە بووین چووینە پێشوازی کردنی، من خۆم پێ ناسی، کەمن قوتابیەکی عێراقیم و سەرۆکی قوتابیانی عێراقیم لەهیندو پاکستان وە کوردیشم داوای کرد لەقەسری کۆماری بچم بۆ لای، باسی کوردی بۆ بکەم، ئەوەبوو کاتێکی بۆ دانام پاش چەند رۆژەک چوومە (کاراچی) ئەو وەختە پایتەخت بوو، لەوێ چوومە قەسری کۆماری نزیکەی یەک کاتژمێر باسی مێژووی کوردی تازەو کۆنم بۆ کرد دوایی کەلێ بوومەوە، ئەو لەمن زیاتر مێژووی کوردی دەزانی، گوتی ئەو کتێبەی کەکاپتن وەحید دایناوە بەناوی کوردو ولاتەکەی پێشەکیەکەی من نووسیومە، دانەیەکی پێشکەش کردم، کتێبەکە بەزمانی ئینگلیزی نوسرابوو، وەزۆر دلی لەگەڵ کورد بوو، کوردی زۆر خۆش دەویست، بەمنی وت: هەتا تۆ لێرەیی ، چ کاتێک بتەوێ بێی بۆلای دەتوانی بێ ناو نووسین بێی بۆ کۆشکی کۆماری وە چ پێویستیت هەبێ من بۆت جێبەجێ دەکەم، ئێستاش لەسەر مەسرەفی من برۆ بۆ (بلوگستان) لەوێ کورد هەیە قسەیان لەگەڵ بکە ، مێژووی خۆتان بۆیان روون بکەوە، ئەوە بوو چووم بۆ بلوگستان کە ناوچەیەک بوو، پایتەختەی ناوی

(کوێتا) بوو، ماوەی (١٠) ڕۆژ لەو ناوچەیە بووم، لەزانکۆی ئەو ناوچەیەو هەروا لەگەڵ ئیزگەی رادیۆیان چەندین محازەرەم لەسەر کوردو کوردستان و راپەینەکانی کۆن و شۆرشەکان بۆم باس کردن.

### ٣- مستەر پاراسات سەرۆک کۆماری هیندستان:

بینینی ئەو لەجێگایەکی زۆر سەیر لەبازار شتم زۆر جۆرەشتی جوانی لێ بوو، قەڵەباغ بوو، سەرەمان گرتبوو، لەسرەدا ئاوری پشتەوەی خۆمدا پیاوێکی پیر لەپشتم راوەستا بوو، کەوتمە خەیاڵەوە ئەو پیاوەم لەکوێم دیتییە، نووسەرە، ئەکتەرە، مامۆستایە، شێوەکەی زۆر لێم نزیک بوو، دوایی شێوەکەی بۆم روون بۆوە، کە ئەمە سەرۆک کۆماری هیندە، منیش بەشەرمەوە داوام لێکرد کەبێتە جێگای من، بەڵام رازی نەبوو، وتی: زۆر پیر نەبویمە، هەرچەندە هەموو سەرو ریش و سمێلی سپی بوو وتم: تۆ سەرۆک کۆماری، وتی: بەڵێ، بەسەر سورمانەوە لێم پرسی، بۆ لەسرەدایی وتی: من لەگەڵ هیچ هیندیەک جیاوازیم نییە، دەستەکی درێژ کرد بۆ ئۆتۆمبیلەکی رەش لەوێ راوەستابوو وتی: بەتەنیا ئەو بۆ ئۆتۆمبیلەو شۆفێرەکەی هەقی ئەوەم هەیە کە بە کاریان بهێنم، ئۆتۆمبیلەکەش مۆدیلەکی زۆر کۆن بوو، من ئەو شتەم زۆر پێ سەیر بوو، کەچەند جیاوازی هەیە لەگەڵ پیاوە مەزنەکانی خۆمان.

### ساڵح زەکی ساحێب قران و ئاژاوەکەی ساڵی ١٩٤١ لەهەولێر

ئەم مرۆڤە کوردێکی خاوێن، ئەدیب و وەئەدەب دۆست بەهەموو جۆرێک دەیویست خزمەتی کورد بکات، ئەم کە لەپیاوە، کە بەکورتی باسی دەکەم، خۆی ئەفسەرێکی سوپای عوسمانی بوو، بەپلەیەکی بەرز، خۆی و چەند ئەفەسەرێکی کورد بیستیان شۆرشی شێخ مەحمود دەستی پێ کردووە، لەئەستەمبولەوە هەڵاتن هاتنە ناو شۆرش، بووە سەرکردەی سوپای شێخ مەحمود، دوایی لەگەڵ شێخ بەینیان تێک چوو، پاش ئەوەی شۆرشەکەی شێخ دامرکایەوە، بوو بەموچە خۆرێکی حکومەتی عێراق لەچەند جێگایەک وەکو کوێسنجاق، ئاکرێ بوو بەقایمقام، لەساڵی ١٩٤١ بوو بە پارێزگاری هەولێر پێش ئەوەش لەبەغداد گۆڤاری (دیاری کوردستان)ی دەردەچواند کەهاتە هەولێر ئەم مرۆڤە دەستی بەچالاکی نواندن کرد، پێش هەموو شتێک هاوینە هەواری پیرمام کردیە هاوینە هەوارێکی رێک و پێک

بەشەقام و بالاخانەکانی ئەوکات، وەئەو ناوی لێنا هاوینە هەواری سەلاحەدین، ئەم ساڵانە پێشەکی بوو، بۆ شەری جیهانی دووەم لەکوردستانا بەتایبەتی لەهەولێر دوو چین هەبوون، لەناو رۆشنبیرانی ئەوکات، چینی یەکەم ئینگلیز خوازەکان کە دەیانگوت ئینگلیز هەقی کورد دەدات، پاش کۆتایی شەر لەکردەوەکانی کە دژی کورد کردویەتی پەشیمان بۆتەوە، چینی دووەم ئەڵمانخوازەکان دەیانگوت ئەڵمان ئەگەر لەشەر سەرکەوت هەقی کورد دەدات، لەبەر ئەوەی ئێمە نەتەوەیەکی ئارین وەکو خۆیان، کوردی سەردەخات بەسەر عارەب کە لەنەوەی سامین، ساڵح زەکی تاوانبار کرابوو کەسەر بەئینگلیزە، بۆیێ وازی لەشێخ مەحمود هێناوە، لەو ساڵ کوتەدا یەک لەبەغدا روویدا کەرەشید عالی گەیلانی لەگەڵ کۆمەڵەکەی خۆی هاتنە سەر حوکم مەلیک فەیسەڵی دووەم وەخاڵەکەی عەبدولئیلا هەڵاتن هاتنە ماڵی مەلافەندی لەباداوە، خۆیان شاردەوە، شەوێک لەشەوان فرۆکەیەکی ئینگلیزی هاتە سەر هەولێر، چەند بۆمبایەکی فرێ دایە سەر دەوروپشتی هەولێر هیچ زەرەری نەبوو، بۆ رۆژی دووەم لەهەولێر ئاژاوە پەیدابوو کە ساڵح زەکی ئاگادارە لە هاتنی ئەو فرۆکەیە قەڵەباڵغەکی زۆر پەلاماری پارێزگارو پارێزگایانداو ئۆتۆمبیلی پارێزگایان سوتاند کە ئەو کات لەهەولێر سێ ئۆتۆمبیلی تایبەت هەبوو، ئۆتۆمبیلی خدری پاشاو میرزاغەی کۆرێ و لەگەڵ پارێزگاری هەولێر، هەروا ئۆتۆمبیلی ئێشکردنیش دووسێ ئۆتۆمۆبیل هەبوو، بەرێوەبەری پۆلیس ناوی عەزیز بەرقی بوو، خەڵکی شاری کەرکوک بوو، هەروا گەورەی سوپا لەهەولێر ناوی ئەمین رواندزی بوو، ئەم دووە داوایان کرد لەپارێزگار کە ئەمریان بداتێ، تەقەی بکەن بەسەر ئاژاوەچیەکان، بەڵام ساڵح زەکی نیشتمان پەروەر قەدەغەی کرد هەتا پێیان گوت ئەوە قەڵەباڵغ بەرەو ماڵتان دەچن، منداڵەکانت لەخەتەردان، ئەو لە وەڵامدا وتی: ئەگەر منداڵەکانیشم

بکوژن، خۆشم بکوژن، نابێ یەک کەس لەو هەولێرە سەری پەنجەی بەخێن دابێ، با لەسالآنی ئاینده نەڵێن فلان کەس بەئەمری سالح زەکی کوژرا وەیان بریندار بوو دوایی مەلا فەندی تەدەخولی کرد، دوای ئەوەی کە ئاژاوەچیەکان دەیانویست بەرەو گەرەکی جولەکەکان برۆن، ئاژاوەکەی کوژاندەوە هەر ئەم مرۆڤە کە لەهەولێر بوو رۆشنبیرانی سلێمانی وەکو فایق بێکەس و عەبدوڵلا گۆران، رەمزی مارفو زیوەری شاعیر، شێخ سەلام، وەزۆرانی دیکە لەهەولێر بوون بەکاری فەرمانبەری خەریک بوون ئەویش بەهیمەتی سالح زەکی ساحب قران، لەلایەکی دیکە لەبەر ئەوەی سالح زەکی برایەکی هەبوو بەناوی داود بەگ، ئەم برایەی مێردی پلکم بوو، جا لەبەر ئەوەو روحی کوردایەتی پەیوەندیەکی زۆر باش و بەتینی لەگەڵ باوکم هەبوو ئێوارەی پێنج شەمەو شەوانی هەینی، یان لەماڵی ئێمەیان لە ماڵی سالح زەکی کۆدەبوونەوە لەو کۆبوونەوە تایبەتیانە دەبووە شەرەشیعر بەتایبەتی لەبەینی شێخ سەلام و فایق بێکەس وەیان قسە خۆشەکانی ئەحمەدی عەزیز ئاغا یان گێرانەوەی رووداوی کۆن.

**جولەکەکانی هەولێر لەبواری رۆشنبیری و ئابووریەوە لەچلەکان:**

بەقاڵەکانی بازاری قەیسەری زیاتر لەنیوەیان جولەکە بوون بەشێکی دیکەش مامۆستا بوون، هەروا چەند هونەرمەندێکی باشیشیان هەبوو لەوانەی کە لەبیرم ماون، دانیاڵ قەساب نیگارکێشەکی بەرزبوو، برایەکەشی کەناوی مونیر قەساب بوو ئەویش نیگارکێش بوو، هەروا برایەکی دیکەی هەبوو بەناوی ناحوم ئەویش ئەکتەرو دەرهێنەربوو شانۆگەری سەلاحەدینی ئەیوبی لەدەرهێنان و نواندن وێنەکێشانی هەرسێ برا دانیاڵ و مونیرو ناحوم زەکی باروخیش نیگارکێش و مۆسیقا ژەن بوو بەتایبەتی عودی دەژەنی، مامۆستای ئینگلیزیمان ناوی پنحاس بوو لەرووی سیاسی کورد پەروەر بوو، لەیادمە لەکۆتایی چلەکان کە جولەکەکانمان بەرێکردن و بەیەکجارەکی بەشەمەندەفەر رۆیشتن، هەر لەوێستگەی شەمەندەفەر مامۆستام زەکی باروخ بەخێرایی زەرفەکی پێدام و وتی: بۆم پری خۆڵی هەولێر بکە، منیش زەرفەکەم بۆ پڕ خۆڵ کردو دامە دەستی زۆر بەکوڵ گریا، منیش لەگەڵیا گریام، رۆژی پێشتریش مامۆستایەکم بەناوی سیۆن کۆمەڵێک کتێبی هەمە جۆری ئەدەبی کە بەعەرەبی نووسرابوون پێشکەش کردم.

**کوردایەتی و حزبایەتی لەهەولێر:**

لەسالآنی چلەکان و هەتا بەشێکیش لەپەنجایەکان لەهەولێر دوو حزب هەبوو، حیزبی کۆمینیست شوعی، کەزۆر جار ناوی دەگۆڕا، وەحزبی پارتی، هەروا کۆمەڵەی سێیەم کە حزب نەبوون، بەڵام دەوریان هەبوو، ئەویش کۆمەڵەی شێخ محێدین کە ئیسلامی بوون، وەکو جولانەوەیەکی دەروێشانە بوون، حیزبی شوعی لەگەڵ پارتی لە دەوری نهێنی زۆر رێک بوون، بەڵام لەخۆپیشاندان وەیان لەجموجۆلی پێشکەو توویانە تۆزێک ساردی دەکەوتە بەینیان بۆ نمونە لەنەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ یان ١٩٤٨ بوو، لەباغی سەعید ئاغا، ئێستا ئەو جێگایە قەسابخانەیە لەوێ نەورۆزکرا، ئێمەی پارتی بۆ پاراستنی ئاهەنگەکە چووین، داوامان لەقەسابەکانی هەولێر کرد کە زۆربەیان شوعی بوون ئاهەنگەکەمان بۆ بپارێزن، چونکە جەنابی شێخ محێدین فتوای دابوو کە ئەمە پیشاندانێکی ئاگر پەرستییە، دژی ئاینی ئیسلامە بۆیە لەترسی دەروێشانی شێخ محێدین قەسابەکانمان ئاگادار کرد ئاگاداری ئاهەنگەکەمان بن، ئاهەنگێکی زۆر خۆشمان کرد، بەوتارو شایی و هەڵپەرکێ ئەم ئاهەنگە لەهەموو کوردستان دەنگی دایەوە.

**بەکورتی ژیان و کاسبی رۆژانەی هەولێرییەکان**

کاسبکار پێش نوێژی بەیانی لەخەو هەڵدەستا دەچووە، گەرماو ئینجا بۆ نوێژ بەرەو مزگەوت دەکەوتە رێ، دواتر دەچووە دوکانەکەی شاگردی دەهات، لەم بەیانییە زووە خەڵکی گوندان بەباری خواردن لە ماست و هێلکەو مریشک، کەرەکانیان لەخانی سپی یان لەخانەکانی دی دەبەستەوە خۆیان شتەکانیان دەهێنایە بازاڕ، ئەوانەی کە لەناوچەی خۆشناوەتی دەهاتن بەقەرتاڵەی میوەجات وەک ترێ، هەنجیر، هتد..............

ئەوەی میوەجاتی نەبایە بارە دارەک بۆ سوتەمەنی

وەیان فەردە رەژوەکی بار دەکردو دەهاتە شار لەکاتی تاریک و روون دەگەیشتنە هەولێر بێینەوە سەر دوکاندارەکە دەستی بەکرینی پێویستی ناومال دەکرد وەکو گۆشت و سەوزەو میوەجات و هتد..............

حەمبالی تایبەتی خۆیان هەبوو کەمالەکانیانی دەناسی بەم حەمبالە ئەشیایەکانی دەناردەوە مالێ لەگەل مەنجەلە ماستەکی گەورە کە هەموو ئەو شتانە نەیدەکردە دوو درهەم یا سێ درهەم، خۆی لەسەر دوکانەکە دەبوو، نیوەرۆ نەدەچووە مالێ، هەر لەدوکانی خۆی کوتکە ماستاوەک بەیەک دوو نانی گەورە دەیخوارد نرخی هەمووی لەنێوان (٣) فلس و عانەک بوو، کاتی رۆژئاوا دەچووە مزگەوت نوێژی دەکرد ئینجا دەچووە مال، کە وەرزی زستان بایە، لەژووری لەپێش سۆبەی دار یان مقارەی رەژوی سینیان دادەنا، کە وەرزی هاوینیش بایە، لەسەربانان، لبادیان رادەخست سینیان دادەنا هەموویان پێکرا گەورەو بچووک بەقسەی خۆش و بەخواردنی بەلەزەت خواردنیان دەخوارد، هەر لەسەربانیش ئاویان لەناو شەربە وە یان شتێک هەروەک شەربەبوو بەلام سەری کراوە بوو پێیان دەگوت کەدینە پارچە بەفرەکیان دەهاوێشتە ناوی ئەو کاتە بەفری خوایی بوو لەچیای سەفین زستانان لەناو چال هەریان دەگرت، هاوینان دەیانهێنا شاری دەیافرۆشت زۆربەشیان بەفریان نەدەکری، ئاوەکە خۆی ساردەیەکی پەیدا دەکرد لەناو کەدینەکەی، ئەوجا پاش ماوەیەک پشوو ژن و پیاو هەلدەستان دەچوونە مالی خزمان یان دراوسێیان لەپێشان مندالەکی بچووک فانۆسی لەپێش دەگرت بۆ رێنیشاندانی، بەتایبەتی ئەو ماوەیە کۆلانەکان هەمووی قورو چلپاو و بەینیان بچووک بوون، وەبەتایبەتی لەپایزان، قوری سوریان دەگرتەوە لەگەل کا تێکەلیان دەکرد بۆ سواغدانی سەربانان، زۆرجار لەوتاریکیە خەلک دەکەوتە ناو ئەو قورانە، ئەوجا کە دەچوونە ئەومالەی لەوانەیە (٥-٦) مالی دیکەش دەهاتنە ئەوێ، هەر شەوێ لەمالێک پیاو بەتەنیا ژن بەتەنیا دادەنیشتن و مندالانیش بەگەمەو بەزمی خۆیان و هەرچینەو بەقسەی خۆش تاکاتی نوستنان دادەنیشتن، دوای دووبارە فانۆس لەدەست پێش دەکەوت، هەرکەسەو بۆ مالی خۆی، ژیانەکی سادە بێ کین و غەرەز دۆست و ناسیاری رەچاو دەکرا ئەوها رایان دەبوارد چینی موچە خۆریش دەچوونە یانەی فەرمانبەران کەتەنیا ئەویانەیە هەبوو رۆژانی هەینی هەبوو کاسبکارانیش لەعەسران تا ئێوارە دەچوونە قاوەخانەکان، وەکو قاوەخانەی جەمیل.

### مامۆستا نەژاد لەباسی گۆرانیبێژەکانی هەولێر دەلێ:-

لەتەمەنی مندالی ئاشنایی گۆرانیبێژەکان نەبووم، کە گەورە بووم حەزم دەکرد لە گوێگرتنیان، بەتایبەتی لەئاهەنگە تایبەتیەکان دادەنیشتم بەتایبەت لەکاتی بوک گواستنەوە، وەبۆنەی دیکەش ئەوکات سالانی شەستەکان و حەفتایەکان ئاشنایەتیم لەگەل تایەر تۆفیق، رەسول گەردی، فوئاد ئەحمەدو تارادەکیش ئاشنایەتی و برادەرایەتیم لەگەل حەیدەر عەبدولرەحمان (حەیدەرە بەقال) هەبوو ئێمە لەیانەی فەرمانبەران لەژووری ژمارە(١) دادەنیشتین، ئەو ژوورە نزیکی دەرگای دەرێ بوو، تاهیری رەحمەتی زۆرجار بەتەنیا یان لەگەل حەیدەر یان لەگەل مام رەسول، دەهاتنە ئەو ژوورە. کەناوی چۆل دەبوو لەکاتی شەو وردە وردە دەستیان دەکرد بەگۆرانی وتن تا درەنگانی شەو، وەهەندێ جاریش تانزیکەی بەرەبەیان دەمانەوە، بەتایبەتی خالە تایەر شیعرەکانی خەیامی بە ئاواز دەخوێندەوە کە زۆر دلگیر بوو، وەیان رەسول گەردی بەدەنگە خۆشی و رووخۆشەکەی حەیرانی دەگوت: مام حەیدەریش بەدەنگە نێرەکەی کەهەر حەزت دەکرد گوێی لێ راگری کە قۆریاتی دەگوت: هەروا جەمیلی عەلیاغەش زۆربەی رۆژەکان لەم دانیشتنە بوو، جاروبار حەیرانەکی تێ هەل دەکرد بەراستی زەمانەک بوو زەمانی خۆشی بوو، رۆیی ناگەرێتەوە لەکۆتایی ئەم بیرەوەریە وردانەم پێشکەش بە هەردوو نەوەکەم ئەحمەدو ماردین دەکەم وەسوپاسی هەلسورێنەری ئامادەکار دەکەم.

# هەولێر لەسەردەمی زێڕینیدا

سلێوە حەننا

**هەولێر چۆن توانی سەردەمە زێڕینەکەی بەسەر بەرێت و لە شارێکی ناوەدانکراو لەسەردەمی ئاشوورییەوە بۆ هەرێمێکی بەرفراوان لەسەردەمەکانی دواییدا بگۆڕدرێت؟**

**لەمێژووی دێرینیدا بەناوی (حدیاب) یان (ئدیابین)ەوە ناسرابوو، عەرەبیش لەکتێبەکانی کلدانییەکاندا ناوی (حزە)یان لێ نا وەکو کورتکردنەوەیەک بۆ ناوی حدیاب، ئەم هەرێمە سنووری یەکەمی بۆ دیجلەو سنووری دووەم و سێیەمی بۆ هەردوو زێی سەروو و خواروو(یۆنانییەکان ناوی زابوئیلو یان لینا) (١)و سنووری چوارەمیشی بۆ زنجیرەشاخی زاگرۆس دەکشێت، هەولێر دەکەوتە ناوجەرگەی ئەم هەرێمەی کەپایتەختە ئاشوورییە کۆنەکان دەوروبەریان دەگرت.**

ئەم هەرێمە ناوبانگی بەبەرهەمهێنانی باشترین جۆری گەنم دەرکردبوو و ناوبانگەکەیشی تائیستا ماوەتەوە.

بەهۆی ئەوەیش کە هەولێر دەکەوێتە سەر ڕێگای هێرشبەرەکان لەنێوان موسڵ و کەرکوکدا (ئەرابخا)، لەبەر ئەوە مێژووەکەی بۆ سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێنێتەوەو هەولێر ناوجەرگەی حدیابی داگیرکردبوو، ئاشوور ناسرپاڵ لەساڵی (٨٤٤پ. ز) ناوی (شارەکەمی) لێ نابوو، پاشا ئاشوورییەکانیش بەر لەدەستپێکردنی هەر شاڵاویکی سوپاییان سەریان لێی دەدا، بەهەمان جۆری کەسەنحاریب نواندی لەساڵی ٩٦٢ پ.ز بەرلەوەی پاشا هێرشێک بۆسەر بابلییەکان و هێرشەکانی دیکەی بەرەو ئیلام و زاگرۆس ئەنجام بدات. (٢)

بنچینەی ناوی (ئدیابین) بۆ (حدیاب) دەگەڕێتەوە، بەڵام ناوی (ئەربیلا: ئەربل، ئەربیل) ناوێکی کۆنەو لەتۆمارە مێژووییە دێرینەکاندا هاتووە، کەچی هەولێر هەندێک جار لە (ئوربیل)ەوە هاتووەو هەندێک جاری دیکەش لە (ئولیرا) واتە هەولێر هاتووە (٣)، جۆرج ڕۆ لەکتێبی (عیراقی دێرین) دا دەڵێت بنچینەی نشتینگە دێرینەکانی وەکو هەولێرو کەرکوک بۆ پتربوونی نیشتەجێبوون بە درێژایی قۆناغە مێژووییەکان دەگەڕێتەوە، چونکە شارە کۆنەکان بەسەر دەشتاییەکانی تەنیشتیدا. (٤) بەرزترو بەرزتردەبووەوە هەولێر وەکو نشتینگەیەکی هەمیشەیی مایەوە، چونکە ناوەندێکی سەرەکی پەرستنی خواوەند عەشتار بوو، ئەم پیرۆزییەشی لەدوای هاتنی ئایینەکانی دیکەی وەکو زەردەشتی و ئیسلام و مەسیحییەت لەدەستدا، بەڵام وەکو پێگەیەکی ستراتیجی و ئابووری مایەوە، لەهەرێمی (حدیاب)یشەوە (ڕێگای سوڵتانی) دەکشا کەپۆستەی لەسەر دەگوازرایەوەو ئەورێگایەیە کە لە (ماردس)ەوە بۆ (سوسە) تێدەپەڕێت.

سیتۆن لوید دەڵێت: «ڕێگایەک لەنێوان کەرکوک و هەولێردا هەبوو کەگەشتیاری پێدا

تێدەپەڕێ، زنجیرە گردۆڵکەیەک بەرچاو دەکەوت کەنیشانەی ئەو گوندو شارە کۆنانە بوون کەدەکەوتنە سەر ڕێگای سوڵتانی بەشێوەی چەند پێگەیەک خۆیان، دەنواند. (٥) بەڵام لیوناردوولی دەڵێت: کاتێ کە داگیرکارییەکانی سەرجۆنی ئەکەدی گەیشتە ئەربیلا بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەی ئاوەکانی کەلەباکووری عێراقەوە بەرەو ناوەڕاست و باشوورییەوە دەڕۆن، دەقێکیش لەسەرچاوەی ناوبراوداهاتووە کە لاکاش هەستاوە بەدامەزراندنی (سن)وەکو فەرمانڕەوایەک بەسەر (ئوربیلوم)دا کەناوی (سوبارتو)ی لێ نا. (٦)

هیرۆدۆت لەکاتی قسەکردنیدا لەبارەی (حدیاب)ەوە دەڵێت کەئەربلا فراوانییەکەی تارادەیەک وەکو ئەرمینیاوا بوو، بەوهۆیەشەوە رووبەرێکی یەکجار پان و بەرینی لەئاشوورو ماد دەگرتە خۆی و چوار رووبار دەورووبەریان گرتبوو کەیەکەمیان دیجلە بوو، دووەم و سێیەمیان زێی سەروو و خوارووبوون، چوارەمیشیان (جندیز) بوو کە کۆرش ئاوەکەی بەسەر چەند کەندرێکدا دابەش کرد.

زەینەفۆن ناوی (زاباتس)ی بەسەر زێی سەرروودا سەپاندو بەبۆچوونی (بۆشار)، (زاب) و (دیاب) و (دیاف) گورگێکەو زێی خوارووش لەشاخەکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێت، لە(ئەدیابین) خەڵکانێک هەن کە (کاردۆخ) یان پێ دەگوترێت و باپیرەی کوردن و چەند شارێکی دیکەی وەکو (کوکامبلا)ی تێدایەو هەر لەوشوێنەدا ئەسکەندەر لەدوای پەڕینەوەی لەرووباری (لیکۆس) کەرووباری (زێ)یە، بەسەر دارا دا سەرکەوت. شاری دیتریاس دەکەوێتە نزیک ئەربیلاو پاشان کانێکی نەوت لەنزیکییەوەیەتی و لەوێشەوە دارا بۆ دەروازەکانی قەزوین رایکرد.

کۆینتس روفس لەکتێبی (مێژووی ژیانی ئەسکەندەر)دا دەڵێت کەئەربیلا درا بە دەست ئەسکەندەرەوە لەکاتێکدا کە بەکەل و پەل و گەنجینەی پاشایی رازاوە بوو.

هەولێر پلەو ئاستێکی مەزنی هەبوو کاتێک کە نەینەوا لەساڵی (٦١٢ پ.ش)دا هەرەسی هێنا، پاشان هەروەکو مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی باسی کردووە، مادییەکان دەستیان بەسەرداگرت و چووە ناو بازنەی دەوڵەتی مادەوە کەبەچوارەم دەوڵەت لەرۆژهەڵاتدا ناسرایەوە (٧) لەدوای میسری فیرعەونی و بابلی نوێ و لیدیای کە (کەی ئەخسار) بەیەکێک لە پایەبەرزترین پاشاکانی دەژمێردرێ.

کوکامیلا بەنزیکەی بیست میل دەکەوتە رۆژاوای خازرو باکووری هەولێرەوە .

ئاماری سوپای دارا دەگەیشتە میلۆنێک و (١٠٠) گالیسکەیان لەگەڵدابوو، سوپای ئەسکەندەریش لەچل هەزار کەس پێکهاتبوو لەدوای تێکشکانەکە سوپای ئەسکەندەر بەرەو هەولێر پێشڕەوی کرد لەکاتێکدا دارا بەخێرایی لەگەڵ سوپاکەیدا بەرەو گەلی عەلی بەگ و دواتر بۆ راوندوز رایکرد(٨) بەمەش جەنگ لەنێوانیاندا لەدوای سەپاندنی مەرجەکان کۆتایی پێهات.

لەدوای ئەسکەندەر هەولێر لەساڵی ٣١٢ بۆ ساڵی ١٣٥ی پ.ز کەوتە ژێر رکێفی سەلوقییەکانەوە، فارسە ئەرشاقەکانیش بەدیدێکی پیرۆزەوە تەماشای هەولێریان دەکردو لەساڵی ٨٣ی زاینیدا ئەرمینیا هەولێری داگیرکرد

لەسەردەمی دەسەڵاتی پاشا تیکرانی یەکەم کەلەلایەن ئیمپراتۆر (نیرۆن)ەوە دامەزرابوو.

لەساڵی ١١٥ی زایینیدا ئیمپراتۆر تراجان هەرێمی حدیابی داگیرکرد کەلەئینتاکییەوە پاشان بۆ نسیبین و بۆتان هاتبوو، لەدوای پەڕینەوەی لە رووباری دیجلە گەیشتە نەینەواو پاشان بۆ (حدیاب) ئەربیلا.

لەساڵی (١٩٦)ی زایینیدا سفیرۆس هەوڵی ئەوەیدا کە هەرێمەکە بەئیمپراتۆرییەی رۆمانییەوە بلکێنێت و نازناوی ئەدیابینۆس واتە (خاوەنی حدیاب)ی لەساڵی ١٩٣ی زایندا بەسەر خۆیدا سەپاند.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (کاراکاس)ی رۆمانیدا، هەولێر ناخۆشییەکی زۆری چێشت لەئاکامی دەست درێژکردن و پێشێلکردنی شوێنە پیرۆزەکان و گۆڕستانە فرسییەکان لەوکاتەی کەلەهێرشەکەی بۆ سەر بابل دەگەڕایەوە.

لەسەردەمی ساسانییەکاندا چەندین دەوڵەتی بچوک لەهەرێمی حدیابدا دروست بوون و چەند ناوێک دەرکەوت لەوانەش فەرمانڕەوای حدیاب و کوپراشنسب بەتایبەتی لەسەردەمی شابوری دووەمدا کەئایینی زەردەشتی لەسەردەمیدا لەهەرێمی حدیاب و پەرستگاکانی ئاگرە فارسەکاندا بلاوبووەوە.

لەدوای دارمانی دەوڵەتی ساسانی و لەشەڕی زابدا هەروەک یاقوت لە (معجم البلدان) و مەسعودی لە (مروج الذهب) دا باسیان کردووە (٩) هەرێمی حدیاب کەوتە ژێر رکێفی ئیسلامەوە.

هەولێر قۆناغی زێڕینی لەسەردەمی فرسییەکاندا بردەسەرو لەوماوەیەدا ناوی (بیث قورتوای) واتە وڵاتی کوردانیان لەحدیاب نا.

پێگەی جوگرافییەکەی حدیاب ئەربیلا وایکردبوو کە بکەوێتە ناوجەرگەی ئیمپراتۆرییەتی فرسییەوە، هەربۆیە کردبیانە پایتەخی دووەمی خۆیان. هەولێر ببوە خاڵی بەیەکگەیشتنی رێگارۆیشتووەکان بەرەو رۆژهەڵات و رۆژاوا لەمیانەی هەردوو رێگای مەلەکی و سوڵتانی، گرنگترینی ئەو رێگایانەش بەئاراستەی باشوور بوو لەمیانەی کەرکوکەوە بەرەو تیسفون دەڕۆیشت و رێگای دووەمیشیان لەمیانەی نسیبین و (ئەلرەها) بەئاراستەی سنووری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بوو، سێیەم رێگاش بەئاراستەی مەخمور و شەرگات و جەزیرەو حەزەر بوو، ئۆسا بیۆسی قەیسری دەڵێت کە پلەوپایەی بازرگانی لە نێوان هەولێرو ئەلرەها (ئۆدیسا)و ئەنتاکییە لەسەدەی یەکەمی زایینییدا مەزن بووە، هەر بۆیە بووە خاڵی بەیەکگەیشتنی شارستانییەتەکان(١٠)

فرسییەکان گرنگییاندا بەکۆنترۆڵکردنی ئەو رێگایانەی کەبەرەو کوردستان و وڵاتی ئاشوور دەڕۆن.

کاتێکیش شۆڕشێکی ناوخۆیی لەساڵی (٢٢٠)ی زایینیدا بەرپابوو کەلەمیانەیدا پاشاکانی حدیاب و کەرکوک لەگەڵ ئەردەشێری کوڕی بابکدا هاوپەیمانێتیان بەست و هێرشیان بردەسەر شارەکانی ناوەڕاستی عێراق وەکو سلوقییەو تیسفون و بێت ئەرمایا، ئەمەش لەدوای مردنی پاشا ئولگاشی پێنجەم روویدا کەپاشا ئەرتبان بووە جێگری و لەساڵی (٢٢٦) زایینیدا کوژرا و فرسییەکان بەرەو چیاکان رایانکرد (١١).

ئەو بنەمایانەی کەدەوڵەتی فرسی لەسەر پێکهاتبوو، یەکێتییەک بوو کەلەشانشینی فرسیای مەزن پێکهاتبوو، ئەو هەرێمانەی کەسەر بەوشانشینەبوون، سەربەخۆیی خۆیان هەبوو.

ئەو زەویانەی کەدەکەوتنە نێوان زێی بچوک تاوەکو بەشی رۆژاوا لەروباری فورات، لەبازنەی حدیابدا بوون کە بنکەکەیان هەولێر بوو.

سیاسەتی فرسییەکان لەسەر بنەماکانی کراوەیی و لێبوردن پێکهاتبوو، هەربۆیە هەموو هەرێمەکان توانیان پارێزگاری زمانی تایبەتی و داب و نەریتە ئایینیەکانی خۆیان بکەن.

جاری واش هاتۆتە پێش کە کەپاشای حدیاب لەگەڵ پاشای ئەلرەهادا هاوپەیمان ببەستێت و پاشای فرسی تبکرانی پێنجەم لەسەر داواکاری پاشای حدیاب مانوباز هەستا بە دەرکردنی پاشای ئەرمەنی دەرکرد لەوکاتەی کەهەولێدا شانشینی حدیاب بۆ مولکەکانی ئەرمەن بگەرێنێتەوە لەساڵی (٩٤ - ٦٨ پ.ز) داو راوینا. (١٢)

سیستەمی کۆمەڵایەتی لەشانشینی فرسی تاوەکو سەدەی یەکەمی زایینی، سیستەمێکی دەرەبەگایەتی ئەرستۆکراتی بوو، چینە دەرەبەگەکەشی زۆربەی کاتەکانی لەراوکردن و ئەسپ سواریدا بەسەردەبرد و حدیاب و بنکەکەی هەولێر لەوبوارەدا بالادەست بوو.

هەروەها ئولگاشی دووەم پاشای فرسییەکان هێرشێکی بەسەرکردایەتی رقبەختی هەولێری لەساڵی ١٢١ - ١٤٨ زایین لەدژی بەربەرییەکان بەرپاکرد.

سیستەمی ئایینیش لەشانشینی فرسیدا بەو جۆرەبوو کە فرسییەکان سەربەستی پەرستنیان بۆ ئەو خەڵکانەی کەلەژێر دەسەڵاتیاندا بوون بەجێ هێشت، ئایینی زەردەشتی و پەرستگاکانی لەهەولێرو دەوروبەریدا بڵاوبووەوە، لەپاڵ ئەوەش جالییەیەکی جولەکە لەشانشینی (حدیاب) دا هەبوو کەکیانێکی تایبەتی خۆی هەبوو.

ئیزات یان ئازاد پاشای حدیاب لەسەدەی یەکەمی زایینیدا لەگەڵ دایکیدا بوونە جولەکەو دایکی هێلانە لەوکاتەی کەبرسییەتی لە ساڵی (٨٠)ی ز ئۆرشەلیمی داگرتەوە، گەنمی بۆ رەوانەکردن.

سیستەمی رۆشنبیریش لەئیمپراتۆرییەتی فرسیدا پشتی بە زمانی ئارامی لەبواری رۆشنبیریو بازرگانیدا دەبەستبوو.

سەبارەت بەبواری ئەدەبیاتیش هەروەکو دیۆرانت لە(چیرۆکی شارستانییەت) دا دەڵێت هیچ پیت و بەردێکی لێ نەماوە (١٣) ئەو زمانەشی لەو شانشینانەی کە لەژێر رکێفیاندا بوو، بڵاوبووەوە، دەشبینین کە پاشای فرسی لەگەڵ سەرکردەکانیدا بەزمانی ئارامی قسەدەکات، لەو زانایانەش کەلە حدیابدا لەوسەردەمەدا هەڵکەوتن، دەتوانین بۆ نموونە ناوی چەند کەسێکیان بێنین کەبریتین لە: تتیانس، بردیسان، ئەفراهاد، ئیبراهیمی کشکری، ئیشوعیابی حدیابی و کەسانی دیکەش.

سەردەمی زێرینی دووەم کەتیایدا هەولێر بووە شانشینێکی بەهێز، سەردەمی ئەتابەگی بووکە لەشانشینەبەهێزەکان دادەنرا لەدوای ئەوەی کەکەوتە پەرسەندن و درەوشاندنەوە، مزەفەرەدین کۆکبری لەدوای ئەوەی کەلەهەولێردا جێنشین بوو، کارە مەزن و چاکسازییە فراوانەکانی لەبوارە کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکردنەوەو شارستانییەتدا ئەنجامداو بەشێکی لەمولکەکانی میرنشینەکەی

بۆ کاری خێرو چاکەی تەرخان کردو بەشەکەی دیکەشی بۆ پرۆسە سەربازییەکان تەرخان کرد، ناوبراو مزگەوت و قوتابخانەکانی بنیاتنا، لەوانەش قوتابخانەی قەلاو قوتابخانەی مزەففەرییەیە.

یاقوت و ئیبن خەلەکان گوتویانە کە دەسەلاتدارییەتی مزەفەرەدین گەشاوەو فراوان بووەو لەوسەردەمەدا یاقوتی حەمەوی سەری لێداوەو لەبارەیەوە گوتویەتی:

هەولێر شارێکی گەورەیە لەسەر پارچە زەوییەکی فراوانی سادەو درێژی شەست و نۆ پلەو نیوەو پانییەکەیشی سی و پێنج پلەو نیوە (١٤) یەکێک لەگرنگترین ئەو ئاسەوارانەی ئەتابەگییەکان کەتائەمڕۆ ماوەتەوە، منارەی مزەفەرییەیەو درێژەی دادرِ ئەو کارانەی کەمزەفەرەدین پێی هەستا لە کتێبی دکتۆر موحسین محەمەد (هەولێر لەسەردەمی ئەتابیگیدا) دەبینینەوەو هەولێر سەردەمێکی گەشەکردن و پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی و بووە قیبلەی زاناو گەڕۆک و لێکۆلەرەوەکان.

کەلەهەموو شوێن و لایەکەوە روویان تێ دەکرد، هەر بەمردنی مزەفەرەدین لەساڵی ١٢٣٣ زایینی، هەولێر بووە نێچیرێکی ئاسان بەدەست هێرشبەرە تەماحکارەکان و لەپێشەنگی ئەوانەشدا هێرشی مەغۆلی بوو. (١٥)

**پێرست و سەرچاوەکان:**


١- بەپێی ئەوەی کەلەنووسینەکانی ئەو شاندە ئاسەوارییەی کە سەر بەپەیمانگەی رۆژهەلاتییە لەزانکۆی شیکاگۆدا کاتێک لەسالانی (١٩٥٤ - ١٩٥٥)دا سەری لە کوردستان داوە، هاتووە،

**سەرچاوە:** سۆمەر ژمارە ٢٥ ساڵی ١٩٦٩).

٢- هادي ساكز: عظمة بابل . بغداد ١٩٧٩ ص ٢٤.

٣- واتاکەی شاری خۆرە هەروەکو لەوتارەکەی مامۆستا فوئاد جەمیل لەگۆڤاری سۆمەر جلدی نۆیەمی ساڵی ١٩٥٣ داهاتووە.

٤- جۆرج رۆ: العراق القديم. ص٤٥

٥- سیتۆن لوید: أثار بلاد الرافدين ص١٧

٦- لیونارد دولي: نبش الماضي. بغداد ١٩٨٢ ص٢٨

٧- محمد امين زكي: تأريخ الكورد وكوردستان منذ اقدم العصور التأريخية حتى الأن. ترجمة محمد علي عوني ص٧٥.

٨- طه باقر: مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة. الجزء الثاني ص٤٤٥.

٩- المسعودي،: مروج الذهب. الجزء الثاني ص١٩٧.

١٠- تأريخ عنكاوة: عزيز عبدالاحد نباتي ص٤١.

١١- العراق في التأريخ: مجموعة من الباحثين. ص٢٥٧

١٢- أرثر كريستين: ايران في عهد الساسانيين ص١٥

١٣- ويل ديورانت: قصة الحضارة. ترجمة محمد بدران. القاهرة ١٩٥٧ ص٤١٠ الجزء الثالث.

١٤- ياقوت الحموي: معجم البلدان. مادة اربل ص ١٣٨.

١٥- محسن محمد امين. اربل في العهد الاتابكي. بغداد ١٩٧٦. ص٣١٩.

# هەولێری دێرین

## لەنێوان، تایبەتمەندی و خەسڵەت و ئایندەدا

* مەسعود پەرێشان*



**ماوەی پێنج ساڵی ڕێکە شاری هەولێری پایتەخت باڵا دەگرێ، گەورە دەبێ، جوان دەبێ، خزمەت دەکرێ. پێنج ساڵی ڕێکە هەولێر بەرەو شارستانییەت و مەدەنییەت دەچێ، هەولێری خاوەنی قەڵای خودان شەش هەزار ساڵی تەمەن و منارەی چۆلی و ئاوی میری و کانیاوەکانی کەسنەزان و سوڵتان موزەفەرو دەیان دیرۆکنووسی ناودارو سەدان ئەدیب و شاعیری پایەبەرزو هەزاران ڕۆڵەی شۆڕشگێڕو خەباتگێرو کۆڵنەدەرو کۆمەڵێک گۆڕستانی شەهیدان. ئێستا خەریکە خاوەنی خۆی دەناسێتەوەو خاوەنەکەشی دەست بە سەر پەرچەمە کاکۆڵەکەیدا دێنێ و شانەی دەکات و وردە وردە لە ئامێزی گەرمی خۆی دەگرێ.**

---

هەولێر ئەو شارە دێرینەی شەڕی لەگەڵ مێژووی چەوسانەوەو داگیرکاری و هەوڵی روخان و دەستبەسەرداگرتن کردووەو هەمیشەش کۆڵی نەداوە تا ئەو ئاستەی بەشاری هۆلاکۆ بەزێن ناودێر بووە. هەولێر بۆ خەڵکەکەی خۆی زێدو مەئواو سەلواودالّدەو وارو هەوارو پێگەو خەونو خەیاڵ و هەست و سۆزو عیشق و ئەوینو ئەو پەڕی خۆشەویستی و یەکگرتوویی و وەفاو ئەمەک و نانداری و هەزاران هەزار پەندو مەتەڵ و چیرۆکی بەر ئاگردان و لاوک و حەیران و بەستەی فۆلکلۆری و سەیرانگەو کانیاوو ئاوەڕۆو دامەو سێ رسکانێو نۆڕسکانێ و کەلابەردو چاوشارکێ و کەرەمستانێ و کڵاو کڵاوێن و ڕاوە مامزو راوە کەروێشک و راوە ژووژک و راوە ماسی و راوە سوێسکەو کەوو پۆڕو ڕێوی و ڕاوە کۆترو قولێنگ بووە. هەتا بۆ خۆشەویستی و دڵداری و حەز حەزۆکێش هەولێر پەردەو دەمامک و ستر بووە بۆ هەموو ئەو عیشقبازی و ئەڤینداریيەی کە لەنێوان نێرینەو مێینەی هەولێرییەکاندا زۆر بەدزی و زۆرتریش بەداپۆشراوی و پەردە پۆشکراوی کراوە تا ئەو ئاستەی دوو دڵدار حەوت ساڵ هەر بە تیلەی چاو رازو نیازیان گۆڕیوەتەوەو ئەوسا کە بەیەک گەیشتوون خەوش و شەرمیان لەنێواندا ماوەتەوەو تا مردن هیچ کامێکیان ناوی ئەوی دیکەیان بەئاشکرا نەبردووەو پیرۆزی عیشقەکەیان بەکوڵێ منداڵەوە پاراستووە. هەولێر بۆ هەولێرییەکان ئەو شارە پیرۆزە کۆنینە مێژوویيەیەکە توانیویەتی بەدرێژایی شەش هەزار ساڵ بەسەرپێیوە بوەستێ و بە بەردەوامیش بوونی کورد بسەلمێنێ، بەوەی کە قەڵا بەرزە



سەربەرزەکەی هەر لە رۆژی دروست بوونییەوە وەکو قەڵایەکی متمانە پێ بەخشراوی کوردان بۆ هیچ کەس ولایەنێک و زۆردارێک نەچەماوەتەوەو سەری نەوی نەکردووەو هەمیشە ئەوەی سەلماندووە کە رەگەزی کورد لەو زێدو مەئوایەدا سەریان هەڵداوەو هەر لەوێش ماونەتەوەو هەر لەوێش دەمێننەوەو هەر لەوێش بوونی خۆیان دەسەلمێنن وەک چۆن لە مەوپێش سەلماندوویانە. هەولێر بۆ هەولێرییەکان ئەو شارە ئارام و ئاشتیخوازەیە کە هەمیشە حەزی لە ئاوەدانی و هێوری و هێمنی هەیەو دوورە لەگیرو گرفت و گێرمەو گێشەو دەردەسەری هەراو هۆریاو بەزمی سەیرو سۆبەت و کارەسات ئامێز بووە. هەولێرو هەولێرییەکان تا ئەمرۆش دوور بووینەو لەکێشەو گرفت و تەنگژەو قەیران و ململانێ و واشی تێ دەگەم کە ئەوە یەکێکە لەهۆکارەکانی بەپێوە وەستانی و مانەوەی و خۆگرتنی و بەردەوامبوونی، چونکە ئەگەر زۆری زۆرداری هاتبێتە سەر هەمیشە وەکو شێری راپەڕیو راستبۆتەوەو جەوری هیچ کەس و لایەنێکی قەبووڵ نەفەرمووەو بەوپەڕی ئازایەتی و مەزنیش بەرگریان لەخۆیان کردووەو ناسنامەی خۆیان پاراستووە، هەر بۆیە تا ئەمڕۆش هەولێرییەکان تا سەرئێسقان شانازای بە هەولێری بوونی خۆیانەوە دەکەن و لەهەموو ئاستەنگێکیشدا بۆی رادەوەستن و بەرگری پێویستی خۆیشی لێ دەکەن. هەولێر سەرقافڵەی سەرجەم شۆڕشەکانی کوردو پێگەی دروستبوونی کۆمەڵەو رێکخراوو حزب بووە. کە بەهۆیانەوە دەنگ و رەنگی کورد لەناوەوە پەڕیوەتەوە دەرەوەی سنوورەکان و بۆتە هۆی پەلکێش کردنی رۆژهەڵاتناسانان و مانەوەیان لەو شارە دێرینەو نووسینی دەیان رازو نیازو یادگارو یادەوەری مێژوویی و ئەدەبی و سوارچاکی و وردەبەرزی خەڵکەکەی. هەولێر بۆ غەریبەو خەڵکی نامۆو خەڵکی غەوارەو ئاوارەو دەربەدەرکراو هەمیشە پشت و پەنا بووەو کەسێک و خانەوادەیەکی لایدە رووی لەو شارە نەکردووەو دواتر لێی بێزار بوو بێ، هەمیشە هەولێرییەکان بە غەریبە پەرست

ناسراون و نانی شێوانییان لەگەڵ خەڵکی لایدە کردۆتە دوو لەت و قەتاو قەت دەرفەتییان پێی نەبەخشیوە هەست بەنامۆیی بکات و لەکۆتاییدا وایان لێی کردووەو خۆی بە بەشێک لەخەڵکی شارەکە بزانێت، تا ئەو ئاستەی ئەگەر زوگورتی بوویێت کچیان داوەتێ و کردوویانەتە هەولێری. خەڵکی لایدە کەڕوو لەهەولێری ئازیز دەکەن، زۆر خێراتر فێری دیالێکتە لەسەر زارخۆشەکەی دەبن و شانازیشی پێوە دەکەن خەڵکی غەوارە زوو دەبێتە هەولێری و باشترین نموونەش ئاوارە بوونی خەڵکی کوردە لەناوچەکانی دیکەوە بۆ هەولێرو بە مەبەستی دروستکردنی جیاوازی دیالێکت و دروستکردنی ناکۆکی نێوان هەولێر خەڵکانی دیکە، سەرەتا کەش، کەشاری قەڵادزێ شەهیدکرا خەڵکەکەیان راگوێزایە هەولێرو بەهەولێرییەکانیشیان نامۆ کردن بەڵام هەولێرییە ئەمەکدارە کورد پەروەرەکان لە دەوریان ئاڵان و هەرچی لەدەستیان هاتبێ لەچاکەو پیاوەتی بەرامبەریان نواندن و کردویانن بەبەشێک لە خەڵکی شارەکە هەر بۆیە دوای راپەڕینیش کە قەڵادزێ ئاوەدان بۆوە، خەڵکە قەڵادزەییەکە ئەوەندە لەهەولێر راهاتبوون نەیانتوانی شارەکە بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە سەر زێدو مەئوای خۆیان. بەڵکو هەر لەو شارە شیرینەدا مانەوەو ئێستاش لە شارۆچکەی دارەتوو گەڕەکێک بەناوی قەڵادزەییەکانەوە ناسراوە، کە هەر هەموویان قەڵادزەیین. دواتر کە هەشت هەزار بارزانی قارەمان و بوێریان کردە بەر قەرەوێری کارەساتی ئەنفال و هەر تەنها ژن و منداڵیان بەجێ هێشتن لەو بارەدا بوون کە خەڵکی

هەولێر بەجۆرێکی ناشایستە لەگەڵیاندا مامەڵە دەکەن، کەوەرە ئەوە بوو هەولێرییەکان بەوپەڕی شەهامەت و لەخۆبوردەیی ئەو خانەوا دانەیان لەئامێزگرت و هەموو جۆرە ئاسانکارییەکیان لەپاڵ هاوکاری داهات و خۆراک و جل و بەرگ پێ بەخشین و بەهیچ شێوەیەکیش ماوەیان بە دوژمنان نەبەخشی کە مەرامی خۆیان بەرامبەریان جێبەجێ بکەن. دوا نموونەی سەردەمی ئەنفالەکان و پێش راپەرینیش، دەرەنجامی شەڕە مەزنەکەی داستانی خاکورک بوو بە سەرپەرشتی و سەرکردایەتی مەیدانی و راستەوخۆی سەرۆک مەسعود بارزانی کەتوانییان گەورەترین داستانی قارەمانانەو نەبەردیو بەرخودان بە ئەنجام بگەیەنن و دواتر کە سوپای دوژمن تازە لەیاخەی گەورەترین شەڕی خۆی و بەرامبەرەکەی بەکۆتا هاتبوو بەهەموو قورساییەکی کەوتە گیانی شۆڕشگێرانی کوردو دەرەنجامەکەی پاشەکشەی سوپای پارتیمان بوو، کەدواتر رژێم خەڵکی بادینانی راگویزاریە گوندەکانی باکووری شاری هەولێر بەو مەبەستەی لەوێ بەهۆی جیاوازی دیالێکت و بەناوی بادینی و سۆرانی، لەوە خراپتریان لێ بقەومێ کە لێیان قەوما بوو، بەڵام هەولێرییەکان لەوکارەساتەشدا ئەو پەڕی بوێری و جوامێری و نەبەردی خۆیان سەلماند بەوەی کەنەک هەر تەنها یارمەتی و هاریکارییان کردن و دژی داواکارییەکانی رژێم جووڵانەوە، بەڵکو لەژێر چاودێری زۆر بەردەوام و ئاستەنگی رژێمدا خۆیان دابەشکردنە سەر چەند تیمێک و بەو جۆرەی خوارەوە کەوتنە هاریکاری ئەو خانەوادانە: هەموو سەموونخانەو نانەواخانەکان بەجیاوازی

بیروڕاشیان بەیانیان نان و سەموونیان بەپیکاب و دووتەنی بۆ ڕەوانە دەکردن. بازرگانەکان بەتۆپ قوماشیان کۆدەکردەوەو بەرگ درووەکانیش بالآیان دەپێوی و دەکەوتن کار، کاری خۆراک فرۆشەکانیش لەهەموویان مەزنتربوو کە بەدەستە جەمعی، بەفەردە برنج و شەکرو ئاردو ساوارو گەنمە کوتاوو برووش و تەنەکە ڕۆنیان کۆدەکردەوەو بەدزی ڕەوانەی بەحرکەو گرد جوتیاریان دەکرد، من خۆم زۆر مالّم بینی کە دیواریان بەو فەردانە دروست کردبوو. واتە کارێک کرا سەد دەر سەد دژی ڕەوتی ڕژێم تا ئەو ئاستەی دکتۆری واهەبوو عیادەکەی بۆ ئەوان نەک هەر کردبووە بەلاش بەلّکو دەرمانیشی بۆ دەکڕین، فەرهادی جەلیل خەیات باشترین بەلّگەو نموونەیە کە تائەمڕۆ لەسەر ئەو سیاسەتەی بەردەوامە. واتە هەولێر چۆنەو چەند ئازیزو خۆشەویست و شیرینە لای هەولێرییەکان بەهەمان شێوەشە بۆ خەلّکی لایدەو نامۆو غەوارەو بەهەمان شێوەی هەولێرییەکانیش لەهەولێردا دەبنە هەولێری. ئەوەی کە دەربارەی پێکهاتەو سیفەتەکانی شاری هەولێرو هەولێرییەکان درکاندمان، ئەوەیان دەسەلماند، کە لەناو شاری هەولێردا هیچ جیاوازییەکی ڕەگەزی و ئایینی و زمانی و دایەلێکتی بەدی ناکرێ، ئەگەرچی هەموو سیماکانی کوردی بوونی ئەو شارە دەسەلمێنن و خەلّکەکەش زۆربەیان موسولّمانی سوننە مەزهەبن، بەلاّم ئەوە ڕێی لە کەمە نەتەوایەتی و کەمە ئایینی و ڕەگەزی دیکە نەگرتووە کە لەو شارە مێژووییەدا وەکو جووتەبرای جمکە بەیەکەوە بژین و خاوەنداریشی بکەن. واتە هەولێر سەرباری ئەوەی کە یەکێکە لەجوانترین و گەورەترین شارەکانی کوردستان و پێتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستانیشەو لەهەمان کاتدا پێکهاتەیەکی فرەڕەگەزی، فرە ئایینی، فرە ئایدیایی، فرە دیالێکتی و هەموو فرەیەکی دیکەش لەو شارەدا لەژێر بالّی ئارامی و تەباییدا دەکرین بێ هیچ گێرمەو گێشەو گرفت و سەر ئێشەیەک دەژین. ئەو شارە دێرینە بەدرێژایی مێژووی دێرینی خۆی گەلی غەدرو غدوورو هێرشی داگیرکارانەو داپلّۆسین و ڕاگوێزان و ئاوارەیی و دەربەدەری و مالّوێرانی و کاری دوژمنکارانە بۆتەوە بەلاّم گەلە کۆلّنەدەرەکەی هەمیشە لەتەنگانەدا کوڕانی دلێرو کچانی ڕوو سووری بەیەک دەستە کەوتوونەتە شەڕی بەرگری و خۆپارێزی و هەر بەقسەش خۆشە گەلێک لەو شارە دێرینەدا بتوانێ لەنێوان کەلّبەی ئەو هەموو دوژمنەی کەدەوری داوە ڕزگاری بێت و تا ئەمڕۆ بەزیندوویی بمێنێتەوەو ئێستاش لەکاروان و دەرەوەی هەرەپێشکەوتووی دونیاشدا بتوانێ وەکو هەر گەلێکی دیکەی زیندوو بوون و ئەکتیڤی خۆی لەهەموو بوارێکدا بسەلمێنێ لەنێو ئەو هەموو کوودەتاو ڕق و کینەی دوژمن و ناحەزو نەیاران کە هەمیشە لەپیلانگێڕانییان بەردەوام بووینە بۆ ئەوەی کورد بەخۆی ڕانەگاو سەریشی لێ بشێوێ و نەتوانێ لەجەنجالّی و ئالّۆزی و ئاوێتە بوونی ئەو زەمەنە تاک جەمسەرییە دەنگ و ڕەنگی خۆی بگەیەنێتە دروستکاران و بڕیار بەدەستانی دونیاو لەوەش زیاتر لەو ماوە کورتەی دوای ڕاپەڕینە مێژووییەکەی بەهاری نەوەدوویەکدا ببێتە یەکێک لەوناوچانەی کە سەرنجی خەلّکانی هەرەپێشکەوتووی دونیا بۆ خۆی ڕابکێشێ و

سەردانی تاک و کۆو تیم و وەفدی رەسمی و گەورە بەرپرسی زۆربەی وڵاتانی دونیاو تیمی رۆشنبیری و ئەدەبی و کەسایەتی سیاسی و رۆژنامەنووسی بەناوبانگی کەناڵە جیاجیاکانی راگەیاندن و بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەو گۆنگرەی جیاجیاو بزاڤێکی زۆر خێرای خۆناساندن و خەڵکی ناسین سەرجەم کوردستانی گرتۆتەوە بەڵام هەولێر بۆتە چەق و بنکەو کۆنترۆڵی تەوەرە سەرەکییەکانی ئەو بزاڤە و رەوتە جۆربەجۆرانەی کە کاردانەوەیەکی مەزنی هەبووە هەم لەزیاتر ناساندنی کوردو هەم لەوەرگرتنی راو دەنگی پشتگیری جیهانی و کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بۆ گەلەکەمان وسەرسام بوون بەخەڵک و داب و نەریت و کەلەپوورو جل و بەرگ و لایەنی کۆمەڵایەتی و میوانداری و رێزگرتن و ئەدەب و هونەری جۆراو جۆر هەتا سەرجەم بوارەکانی گەیاندن و کەناڵەکانی راگەیاندنیشی بەهەرسێ جۆری بیستراوو بینراوو خوێندراوییەوە کە بەکەمترین داهات و کۆنترین شێوازدا دەستی پێ کراوەو ئێستا لەو ماوە کورتەو بەو ئەزموونە کەمەو بەو توانادارایە ئاساییە گەیشتۆتە چلەپۆپەی پێشکەوتنی تەکنیکی و چاپ و رەنگ و بلاوکردنەوەو گەیاندنیش چ لەسەر ئاستی ئاسایی ژمارەو پێوانەو چ لەسەر ئاستی کەناڵی ئاسمانییەوە کە وەکو هەر گەل و وڵاتێکی دیکە توانیومانە خۆمان بگەیەنینە دوورترین گۆشەی دونیا تا ئەو ئاستەی کچێکی قوتابی قۆناغی دکتۆرای ئیتالیا کەنە کوردو کوردستانی دیوەو نەئاشنایەتیشی لەگەڵماندا هەیە، بەڵام بەهۆی تۆری ئەنتەرنێتەوە گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە دەبێ نامەی دەرچوونەکەی لەسەر گەلی کوردو جیۆپۆلەتیکی کوردستان بێت و لەپێشەکی نامەکەیدا دەڵێت: کورد لەسەر ئەنتەرنێت دەوڵەتێکی سەربەخۆن ئەگەرچی ئەو کیانە سەربەخۆیەیان نییە، هەر ئەوەش هانی دام کەنامەی پسپۆری و دەرچوونەکەم لەسەر ئەو گەلە بێت و دوای گەڕان بەدوای سەرچاوەو زانیاری لەوە گەیشتم کەپێویستە گرنگی بەرابوردوو و ئایندەی ئەو گەلە بدرێت. یا کوڕێکی دیکەی ژاپۆنی کە ئەویش هەر لەسەر تۆری ئەنتەرنێتەوە گەلی کورد دەناسێ و ئیمێلێکی بۆ سەرۆکی زانکۆی سەلاحەددین رەوانە کردووەو تیایدا دەپرسێ کە ئایا دەتوانێ لەرێی وڵاتی ئێرانەوە بگاتە کوردستان و لەوێوە بۆ زانکۆی سەلاحەدین بۆ ئەوەی بتوانێ کە گەیشتە ئەو زانکۆیە زانیاری تەواو لەسەر گەلی کورد وەربگرێ؟

ئەڵبەتە سەرۆکی زانکۆش بە ئیمێلێکی وەڵام پێشوازی لەو برایە کردو ئامادەباشی خۆی و زانکۆکەش و شاری هەولێریشی پێ راگەیاند کە بفەرموێ و میوانی هەموولایەکیشیان دەبێت و هەموو جۆرە زانیارییەکیشی دەست دەکەوێ. ئەو یەک دوو نموونەیە مەبەست لەمەدح و سەنای لەخۆڕایی گەلی کوردو پایتەختەکەو زانکۆکە نییە، بەقەد ئەوەی سەلماندنی ئەو رایەی بەندەی نووسەری ئەو چەندە دێرەیە کە لەزۆر نووسین و بۆنەدا گوتوومە ئەگەر دەرفەت بەتاکی کورد بدرێ لەهەر بوارێکداو بەئازادی دەستی بکرێتەوە ئەوا بەو پەڕی دڵنیاییەوە گوتوومانە کەتاکی کورد زۆر بەخێرایی دەتوانێ زۆربە مەزنی بوونی خۆی بسەلمێنێ و ببێتە مایەی سەرنجی خەڵکی وڵاتی زۆر پێشکەوتووش، هەر بۆ نموونە کە کارەبا

لەكوردستان براو بووە سیستەمی ئەمپێرو لە ئەمپێریش ئەو پەڕی رەزیلی كراوسێ ئەمپێرو چوار ئەمپێر بووە سیستەمی سەرەكی هەر ماڵێك و خانەوادەیەك ئەو برە كەمەش خەڵكی نیگەران كرد لەوەی كە چۆن بتوانن لە گەرمای بێ بە بەزەیی هاوینەدا مویەرێدەو یەخچاڵ و پانكە بەیەكەوە بەكاربەرن لەكاتێكدا كە هەر یەكێك لەوانە دوو تا سێ ئەمپێری كارەبای پێویستە، ئەوە ئەگەرچی نیگەرانییەكی كاتی دروستكرد بەڵام زۆری نەبرد كورە كوردێكی ئەو هەولێرە كۆندێسەیەكی دروستكرد كە لەسەر ماتۆڕەكاندا دەبەسترێ و لەجیاتی ئەو دووسێ ئەمپێرە ماتۆڕەكە بەنیو ئەمپێر بەهەمان توانای جاران كاردەكات و بەوەش گرفتەكە بەهەولێكی خۆماڵی چارەسەركرا، مەبەست لەوەدایە كە پێویستمان بەدروستكردنی دەرفەت هەیە.

ئێستا ئەوەی ماوە باسی لێوە بكەین رووە خزمەتگوزارییەكانی ئەو شارەیەو بەو پرسیارە دەست پێ دەكەین: كە ئایا ئێمە وەكو كورد هەقی تەواومان بەو شارە دێرینە بەخشیوە؟

ئەگەر نەمان بەخشیوە چی بكەین باشە؟

لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەبێ لەو راستییە لانەدەین كەپێشی راپەڕین هەولێر نەك خزمەت نەدەكرا بەڵكو لەزۆر جۆرە خزمەتی زۆر ئاساییش بێبەش دەكرا، هەر بۆ نموونە لەهەشتاكاندا بڕیارێكی رەسمی لە وەزارەتی شارەوانی عێراقەوە دەرچووە تیایدا بڕیاری ئەوەیان دابوو كە ئاوەڕۆ بۆ سەرجەم شارەكانی عێراق دروست بكرێ (هەولێری لێ بترازێ) واتە لە كەمترین مافی ئاسایی خزمەتگوزاریش دابڕدەكرا.

**بۆیە زۆر بەدڵنیاییی دەتوانم بڵێم، هەولێر پێنج ساڵە خزمەت دەكرێ، خۆشەویستی نێوان هەولێرو پارتی دیموكراتی كوردستانیش زۆر كۆنەو، كە بارزانی نەمرو بارزانییەكانیش لەسۆڤییەت گەڕانەوە بۆ عێراق تاكە شوێنی كە هەموو ئەو بارزانییە قارەمانەی گرتە خۆی (قەسرەكەی مەلافەندی) بوو كە وەكو جوانترین باڵەخانەی مەزنی ئەوسای شاری هەولێر بەئەركی خۆی زانی كە پاڵەوانەكانی داستانی پەڕینەوەی ئاوی ئاراس و قارەمانانی كۆماری كوردستان هەر دەبێ لەهەولێر بحەسێنەوەو لەهەولێردا قەدرزانییان پێ ببەخشرێ.**

بۆیە سەیر نییە ئەگەر پارتی و حكومەتی هەرێمی كوردستان و خودی سەرۆك بارزانیش هەموو قورسایی خۆیان لەخزمەتكردندا بەهەولێر ببەخشن و رەنگە ئێمەی هەولێری كە لەناو شارەكەدا دەژین بەو جۆرە هەستی پێ نەكەین وەك یەكێكی خۆمانە كە لەهەندەران دەگەڕێنەوە ناو هەولێرو شاگەشكە دەبن بەگۆڕانكارییەكان، دەڵێن بەڕاستی هەولێر لەوماوە كورتەدا گەورەترین گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە ئەوسا بابایەكی وەكو ئێمە لە قەبارەی ئەو خزمەتانە دەگەین.

ئێستا وای بۆ دەچم كە لەماوەیەكی زۆر كورتدا هەولێر دەبێتە یەكێك لەشارە هەرە جوانەكانی رۆژهەڵات و هەر ئەوەشی لێ دەوەشێتەوە بەو ئومێدە.

# (عەلی کۆر) مەولود خوێن و مەقامزان ١٨٦٥-١٩٣٨

جەلال خدر

**خوێنەری بەڕێز بۆتانی ڕوون دەکەینەوە کەوا لەم شارە کۆنەی هەولێردا ئافرەتان بەدەگمەن لەماڵەوە دەهاتنە دەرەوە، وەکو دەگێڕنەوە ئافرەتی وا هەبووە لەو قەڵاتەدا ژیاوە و لەهەمـوو تەمەنی خۆیدا نەهاتۆتە خوارەوە تاوەکو ئەو ڕۆژەی چۆتە ژێر خاک. ئەگەر بهاتبوایە ئافرەتێک لەماڵەوە دەرکەوتایە ئەوا بەعەباو پێچە کەپییان دەگوت: (چوارشەو) دەدیترا، جزمەیەکی درێژی لەپێ دەکردو هیچ شوێنەکی وەدەر نەدەکەوت.**

دەرچوونی ئافرەت بۆ بازاڕ یان بۆ سەرقەبران بوو کە لە ڕۆژانی پێنج شەممە عادەت بوو یان لەکاتی جەژن دەچوونە بن(لەلوکان)و یان باغی ژنان و چاکی بن عەردی و ئاوی کەسک و سۆرو غابات و شوێنەکانی تر، لەهەموو شتێک سەیرتر ئەوە بوو کاتێک کە پیاو ژنی دەهێنا بووکی نەدەدیت تاوەکو شەوی گواستنەوە، تەنیا دایک و خوشک و کەسو کاری زاوا دەچوونە ماڵی بووکو تەماشایان دەکرد ئەگەر بە دڵیان با ئەوا دەیانخواست، بەڵام چۆن خواستنێک دووای ئەوەی سەدەها جار بەبەردەمیان هات و چۆی دەکرد پاش فەحسێکی تەواو ئینجا قسەیان لەگەڵ دەکردو نەبادا فسە زمان بێ ، لێرەدا شتێکم بەبیرهاتەوە، جارێکیان مشکۆی هونەمەند بۆی گێڕامەوە گوتی: دایکم ئافرەتێکی بۆ دۆزیمەوە منیش پێم گوت تا بەچاوی خۆم ئەو ئافرەتە نەبینم نایخوازم، لەگەڵ دایکم و ئافرەتێکی تر ملی ڕێگای قەڵاتمان گرتە بەر دووای ئەو کۆڵان و ئەم کۆڵان ماڵەکەمان دۆزیەوە، ئەو ئافرەتەی لەگەڵمان بوو لەبەر دەرگای ماڵیان ڕاوەستاو لەپاشان لەدەرگای دا پیرێژنێک دەرگای لێکردینەوە ئێمەش چووینە ژوورەوە ڕێزو ئیحترامێکی زۆریان لێناین، هەر ئەوەندەم دیت ئافرەتێک هاتە ژوورەوە ئاوی بەدەستەوە بوو بۆمنی هێناو بەخێرهاتنی لێکردین کەتەماشام کرد عەینی لەپیاو دەچوو ئەوەندە ناشیرن بوو وابزانم ردێنیشی هەبوو منیش ئیشارەتێکم بۆ دایکم کرد ئەویش بەزمانی تورکی گوتی(آوزد) واتە خۆیەتی، منیش بە دایکم گوت: هەر ئەو ئافرەتە بوو کە تۆ مەدحت دەکرد. چ جیاوازییەکی لەگەڵ پیاوان



عەلی کۆر

هەیە ؟ ئەویش گوتی:( ئۆغلم ئەو ئافرەتە ماڵی هەیە، قاپ و قاچاغی هەیە، زێڕو زیوی هەیە، فەخفوری هەیە) منیش گوتم دایە قابیلە من فەخفوری دەخوازم یان ژن! مشکۆ بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی گوتی: جارێکیان یەکێک لەبرادەرەکانمان بۆ داخوازی هەمان ئافرەت دەچێ ئەوجارە پیشانی نادەن تا شەوی گواستنەوە، کاتێک شەو دادێ زاوا رەوانەی ژوورەوە دەکەن ئەویش بەناخێری گیانی پەردە لادەدات پشتاو پشت دەگەڕێتە دواوە پێی دەڵێن چی بوو ئەویش دەڵێ(تاچتم پەردان.. گۆردم دەعبان) کابرا هەر ئەو شەوە سەری خۆی هەڵدەگرێ ماوەیەک ماڵەوە بەجێ دەهێڵێ و لەپاشان بەناچاری دەگەڕێتەوە ماڵەوە پێی دەڵێن ئەوە بەنسیبت بووە دەبێ پێی شکور بی.

بابگەڕێینەوە سەرباسی خۆمان- عەلی کۆری رەحمەتی هەموو رۆژێک لەچایەخانەی سەید جەمیل لەبن قەڵاتێ لێی دادەنیشت، دەستی بەقسەی گەورە گەورە دەکردو باسی زەمانی قەدیمی دەگێڕایەوە بەسەرهاتی ساڵی گرانی گەورەی باس دەکرد کەوا چۆن ویستویانە رەوانەی شەڕی سەفەر بەلکی بکەن ئەویش چۆن ئازایەتی خۆی نواندووە لەدەستی جەندرمەکانی عوسمانلی خۆی رزگار کردووە بۆ ماوەی (٤) ساڵی رەبەق لەماڵی داود چەلەبی لەشاری موسڵ خۆی شاردۆتەوە، جەماعەتی چایخانەش ئەوانی دانیشتبوون هەندێکیان گوێیان بۆی شل کردبوو هەندێکیش لەخەیاڵێکی تردا دەژیان چونکە هەموو رۆژێک ئافرەتێک بەعەباو پێچە بەقیتی بەبەردەمیان دا وەکو تاوس رەت دەبوو بەژن و بالایەکی رێک و پێکی هەبووە ئەم ئافرەتە وەکو عادەتی خۆی هەموو رۆژێک لەقەلاتێ دەهاتە خوارێ و ئیشی ناوبازاڕی تەواو دەکردو خزمەتکارێکی ئافرەتیش شتەکانی بۆ هەڵدەگرتو دەگەڕایەوە، زۆربەی زۆری مەجلیس حەزیان دەکرد کەوا دەم و چاوی ئەو ئافرەتە ببینن هەریەکەش بەخەیاڵێکەوە رەسمێکی بۆ ئەم ئافرەتە لەمێشکی خۆیدا



حاجی عەبدوڵڵای دەف ژەن

کێشابوو رۆژێکیان جەماعەت روو لەعەلی کۆری دەکەن و پێی دەڵێن (خوا عافوت کا ئەو جەندەرمانەی عوسمانی کەتۆ باسی لێوە دەکەی هەموو رۆژێک بەبەر دەممان رەتدبێ وەختە بۆی شێت ببین، مام عەلیش لەبەر ئەوەی دنیا دیتە بوو گەڕان و سوڕان و بەسەر هاتی گەلێک زۆری دیبوو، لەلایەکی تریشەوە سەراوو دەراوی دنیاو تاڵ و سوێری ژیانی گەلێک چەشتبوو گاڵتەی بەو شتانە دەهات بەدەم پێکەنینەوە روو لەجەماعەت دەکاو دەڵێ:(چۆنە من وابکەم ئەو ئافرەتەی کە ئێوە بۆی شێت بووینە بەدەستی خۆی پێچە لەسەرچاوی خۆی لابدات ئێوەش تێر تێر تەماشای بکەن) جەماعەتەکەش سەریان سوڕدەمێنێ دەڵێن:(دەی مام عەلی بەقوربانت بین چمان بۆدەکەی) مام عەلیش قومێک لەجگەرەکەی خۆی دەدات و دەڵێ:

(من لەبەرامبەر ئەو شتە قاتێک جلی مراد خانیم دەوێ) هەریەکە دەست لەگیرفانی خۆی رادەکاتو پارەیەکی زۆر کۆدەبێتەوە لە دەخیلەی مام سەید جەمیلی چایەچی دادەنرێ تاوەکو رۆژی دوایی بزانن مام عەلی چیان بۆ دەکات.

بۆ رۆژی دوایی ئافرەتەکە پەیدا بوو وەکو عادەتی خۆی بەلارو لەنجەو فیزێکەوە بەبەردەمیان رەت بوو مام عەلیش لەجێگای خۆیەوە روو لە ئافرەتەکە دەکات و قۆریاتێکی تورکی بۆ فڕێ دەدات و دەڵێ:

بگەلان جەبارد
سۆرن کمن یارد
ئوزن دەلدەلار گیدار
یان کۆرد یان قارد
ماناکەی بەکوردی ئەوەیە.
ئەوەی دێ جەباریە
بپرسن یاری کێیە
رووی خۆی وەردەگێرێ و دەڕوا
یان کۆرەیە یان پیرە کچە

کاتێک ئافرەتە بەستە زمانەکە گوێی لەو قسە ناخۆشانە دەبێت توورە دەبێ لەهەمان کاتیش دا نازانێ جەماعەت فاقیان بۆ داناوەتەوە تاوەکو پێوە ببێ لەبەر سادەو ساویلکەی خۆی یەکسەر پێچە لەسەر چاوی هەڵدەداتەوە روو لەمام عەلی دەکات و پێی دەڵێ (سەگ... ئەمن کۆرەم یان ئەتو) مام عەلیش هیچ خۆی ناشێوێنێ و زۆر بە نەرمیەوە روو لەئافرەتەکە دەکا. ئەمجارەیان بەمەدح کردن دەڵێ:

بگەلان جەبارد
سۆرن کمن یارد
ئوزن ناچیت گیدار


دەرویش رەمەزانی سولەیمان

گوزە لار
سەردارد
بەکوردیەکەی وا
دەگەیەنێ:
ئەوەی دێ
جەباریە
بپرسن
یاری کێیە
رووی خۆی
هەڵداوەتەوە
دەڕوا
جوانی
هەموو
سەردارانە

ئابەم شێوەیە مام عەلی گرەوی خۆی دەباتەوە یەکسەر پارەکە لەمام سەید جەمیلی چایەچی وەردەگرێو دەچێتە لای وەستا عەبدۆکی خەیات قاتێک جلی مرادخانی لەسەر حسابی ئەو ئافرەتە بەستەزمانە لەبەردەکات وەکو کوردەواری خۆمان دەڵێ: (هەر شەرێک بۆ جوامێرێکە)، وەکو جەماعەتیش لێی دەگێڕنەوە بەراستی ئافرەتەکە زۆر جوان بووە نەک قاتێک جل بەڵکو سەد قات جلی مرادخانی هێناوە.

## ژیاننامەی عەلی کۆر

قورئان خوێن و مەولود خوێن و مەقامزان و دەنگ خۆشی شاری هەولێر مام عەلی کوڕی وەستا قادری کاروانچی کوڕی حاجی حوسەینی شنۆیە. لە ساڵی ١٨٦٥ لە گەڕەکی عارەبان لەشاری هەولێر چاوی بەدنیای گەورە رووناک کردۆتەوە، مام قادری باوکی لەکاتی خۆیدا ئیشی کاروانچی بووە بەقەزاو قەدەر کەوتۆتە شاری هەولێر لە گەڕەکی عارەبان نیشتەجێ

بووە، لەجێگای (قەسری عەتاولا ئاغا)دا کەلەکاتی خۆی ئەو پارچە زەوییە هی رەشید ئاغای هەولێری بووە، بەبەردەوامی هات و چۆی کوردستانی ئێرانی کردووە مام قادر ژیانی بەمجۆرە بردۆتە سەر هەتا جارێکیان دەچێتە کاروان لەسەر سنووری مابەینی کوردستانی عێراق و ئێران لەناو بەفردا دەخنکێ.. عەلی کوڕو (٣) کچی کەناویان (زولێخەو کافیەو ئەمۆش)و دایکیان بۆ رۆژگارێکی رەش بە جێ دەهێڵێ، عەلی کوڕ لەوماوەیەدا تووشی وەزعێکی ناخۆش دەبێ بەناچاری لەتەمەنێکی بچووکدا دەست بەکاسبی کردن دەکات بۆ ئەوەی جێگای باوکی بگرێتەوە ماوەیەک ئیشی قورکاری دەکات لەپاشان لەلای (خەلیفە یونس نانەوا) ئیش دەکات لەپاشان خەلیفە یونس (زولێخا)ی خوشکی عەلی کوڕ دەخوازێ چەند منالێکی لێ دەبێ لەوانە(حاجی عەبدوڵلای دەف ژەن، مەلا سالحی دەف ژەن، موتەلی، مەلا قادر، دەروێش ئەحمەد).

لە ساڵی ١٩١٤ کاتێک جەنگی جهانی یەکەم دەست پێدەکا تا رەشبگیر لەشاری هەولێر دەگەڕێ لەو ماوەیەدا عەلی کوڕ خۆی دەشارێتەوە، بەڵام لەدوایی خواگیرێک ناوی دەدات و دەستگیر دەکرێ بۆ ئەوەی رەوانەی شەڕی (سەفەر بەلکی) بکەن، بەمەبەستی خۆ دزینەوە لە ئۆردوگای عوسمانلی، شەوێکیان مام عەلی لەگەڵ جەماعەتێک رێکدەکەون بۆ ئەوەی خۆیان لەجەندرمەکان رزگار بکەن چونکە دەیان زانی دەبنە سوتەمەنیو بۆ ناو ئاگری شەڕ دەڕۆن. کە شەو دادێت لەگەڵ ئەو جەماعەتە رادەکەن، هەندێک دەکوژرێن هەندێکیش رزگاریان دەبێ یەکێک لەوانە عەلی کوڕ بووە کە لەدەستیان رزگار بووە. ئۆردوگای رەشکێن جێدەهێڵێ و روو لەشاری موسڵ دەکات لەوێ دەچێتە ماڵی (داود چەلەبی) بۆ ماوەی چوار ساڵ خۆی دەشارێتەوە.لەهەندێ خەڵکی ترم بیستووە گوایە عەلی کوڕ بەفێڵ خۆی کوڕە نیشانی خەڵکی شاری موسل داوە چونکە خەڵکی ئەو شارە نەیان ناسیوە، لەپاشان بەواسیتەی مەلافەندی دەچێتە ماڵی داود چەلەبی باسی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە ئەویش لای خۆی گلی دەداتەوە، عەلی کوڕ لەو ماوەیەدا ئیستفادەیەکی باش دەکات چونکە دیوەخانی چەلەبی جێگای خوێندنەوەی مەقاماتی عێراقی بووە. چەندین دەنگ خۆش لەو شوێنەدا گۆرانیان گوتووە بەتایبەتی مەلا عوسمانی موسلی و سەید ئەحمەد مەلا ئەمین و کەسانی تر ئەویش گوێی بۆیان شل دەکات و چەندین ئسولی مەقامات و خوێندنەوەی مەولودی پێغەمبەر لە مەلا عوسمان فێر بووە.

لەساڵی ١٩١٨دا کاتێک جەنگی جیهانی یەکەم تەواو دەبێ ئینگلیز شاری هەولێر داگیر دەکات، لە دەنگخۆشانی شار ئەویش بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە، لەساڵی ١٩٢٣ عەلی کوڕ جەماعەتێک بۆ خوێندنەوەی مەولودی پێغەمبەر



سەید نەژاد بەرزنجی


زبیر بلال ئیسماعیل

لەخۆی کۆ دەکاتەوە وەکو، (دەروێش مچۆل، مەلا نادری بیستانچی، سۆفی حەمک، مەلا ساڵحی دەفژەن، پایخە کوڕ، حاجی عەبدوڵلای دەفژەن، مەلا نادری سەعاتچی، موتەلیب)و کەسانی تر، مام عەلی بازاڕی گەرم دەبێت و لەناو خەڵکی ئەو شارە ناوبانگ دەردەکات و چەندین دەنگخۆشی تر بەشداری لەمەولودەکەی دەکەن وەکو (شەهابە، سەید مەردان، دەروێش رەمەزانی سولەیمان، فەقێ سمایلی پەرکان)و کەسانی تر.

مام نورەدینی موختار بۆی گێڕامەوە گوتی: لەبواری خوێندنی مەولودی پێغەمبەردا لەشاری هەولێر تاوەکو ئێستا هیچ کەسێک وەکو عەلی کۆر مەولودی نەخوێندووە دەنگی زۆر خۆش بوو مەقامەکانیشی باش دەزانی و لە کاتی خۆی‌دا حاجی عەبدوڵلا ی دەف ژەن شاگردی بوو. مام عەلی هەرچەندە بە(عەلی کۆر) ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام کۆر نەبوو چاوی ساغ بوو لەدوا تەمەنی ژیانیدا چاوەکانی تووشی نەخۆشی هات و چاوەکی بەتەواوی پوچەڵ بوو، چاوەکەی تریشی کەم بینا بوو زۆر جار دەهاتە مزگەوتی قەڵاتێ بانگی دەداو سەلای دەکێشاو بەبەردەوامی هات وچۆی تەکیەی شێخ شەریفی دەکرد بەشداری لەزیکرو تەهلیلەی تەریقەتی قادری دەکردو دەنگی هەڵدەهێنا...

مام عەلی جگە لەدەنگخۆشی هەتا بڵێی پیاوەکی قسە خۆش و نوکتەچی بووە، هەمیشە مەجلیسی گەرم بووەو خەڵک لەدەوری کۆبونەتەوە گوێیان بۆ قسە خۆشەکانی رادەگرت و لەلای مەلافەندی رێزی تایبەتی خۆی هەبوو بە بەردەوامیش هات و چووی دیوەخانەکانی پیاو ماقوڵانی ئەو شارەی کردووە بەتایبەتی دیوەخانی (مامۆستا محەمەد ئەفەندی موفتی، عەلی پاشای دۆغرەمەچی، حاجی عەلی ئاغای عوزێری، ئەدیب ئاغای ئەسعەدی، پیربال ئاغا)و کەسانی ترو بەبەردەوامی هات و چووی تەکیەکانی دەکرد بەتایبەتی تەکیەی شێخ محێدین لەگەڕەکی عارەبان و تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورماو تەکیەی شێخ شەریف و تەکیەی خەلیفە ئەحمەد)و شوێنانی تر...

سەبارەت بەتۆمار نەکردنی دەنگی عەلی کۆر جارێکیان کاک عەدنانی کوڕی وەستا عومەری کوڕی عەلی کۆر بۆی گێڕامەوە گوتی: لەباوکم بیستووە دەڵێ جارێکیان بەرپرسی کۆمپانیای بەیزەفۆن هاتە شاری هەولێرو لەماڵمان میوان بوو داوایان لەباوکم کرد بۆ ئەوەی بچێتە شاری بەغداو دەنگی لەسەر قەوان تۆمار بکات، بەڵام باوکم رازی نەبوو چونکە ئەو کاتە هونەرمەند بەچاوێکی سوک تەماشا دەکران (موترب و چاوەشیان) پێدەگوترا، مامۆستای خوا لێ خۆش بوو زوبێر بیلال ئیسماعیل سەبارەت بەمەولود خوێنی بەناوبانگ عەلی کۆر لەدەست نووسێکی خۆیدا کە بۆ منی رەوانەکردووە باسی ئەو دەنگخۆشە دەکات و دەڵێ: (ویذکر انه کان في اربیل یومئذ عدد من الفرق الخاصة بأحیاء الموالید النبویة وکان أبرزها فرقة (عەلی کۆر)

وكـان من أهالي أربيل وهو خال ضـارب الدف الشـهـيـر والقـاريء في المواليـد الحـاج عـبـدالله درويش يونس) هتد.

عـهلی كـوّر جگه لهخـوّی خـوشكهكـانـيـشی دهنگـیـان خـوّش بووه له مـهجـالی ئافـرهتاندا بهشـــداریان كـــردووهو دهنگـیـــان ههڵێناوهو قـوّریاتی توركـیـان گـوتووه، جارێكیـان بهڕێز دكتـوّر عهبدولڕهزاق دهباغ لهكتێبخانهی هاورێ لهدانیشتنی تایبهتیدا بوّ من و ماموّستا نهژاد عـــهبدوڵلا عـــهزیزی گـێـــڕایهوه گـــوتی له هونهرمــهندی بهناوبانگ (حــهیدهر كـهچهڵم) بیستووه گوتی جارێكیان لهماڵی عهلی ئاغای عـوزێری دهعـوهت كـرابووله دیوهخـانهی ئهودا گوّرانی و قوّریات و مهقاماتی دهگوت وا رێك كـهوت ئهو روّژهش (ئهموّشی) خوشكی عـهلی كـوّر لهقـاتی سهردهوهی ههمـان شـوێن دهعـوهت كرابوو گوّرانی بوّ ئافرهتان دهگوت وای لێهات كـهوتنه ملمـلانێ و شـهڕه قـوّریات له ئهنجامـدا حهیدهره كهچهڵ پهكی دهكهوێ، شخ جهمـیلی ئهفهندی خانهقا كه لهو مهجلیسهدا ئاماده دهبێ دهچێتـه تهنیشت حهیدهری و یارمـهتی دهدات واتـه لهژێرهوه قـــوّریاتی بوّ دهڵێ، ئهمـــوّشی دهنگخوّش لهشوێنی خوّیدا یهكسـهر دهزانێ ئهو دهنگ و سـهدایه هی حهیدهری نییـه چونكه ئهو قـابیلیـهتی ئهوهی نیـه بهم شـێـوهیه وهڵامی بداتهوه ئهموّشی به قـوّریاتێـك وهڵامی دهداتهوه بێدهنگی دهكات كه دهڵێ:

قهلاده بیر بهدهن وار
بهدهن رستنه دوردن وار
حهیدهر بێله داگهن
سهنه بیر ئوّگره دهن وار

مام عهلی یهكهمین كهس بووه كهوا(مهقامی قـهزای )لهمـهولودی پێـغـهمبـهردا خـوێندووه كـهبه(جـانی مـهی) یان(مـهولا ناجـهم) دهست پێدهكات، تاوهكـو ئێستا بوّمان روون نهبوّتهوه ئهو مـهقـامـه هی خـوّیهتی یان لهخـهڵكی تری وهرگرتووه، لهههندێ خـهڵكی تریشم بیسـتـوو: دهڵێن لهكاتی خوّیدا ئهو مهقامهی له(دهروێش مینهی سابلاغـی) وهرگرتووه كـه لهكاتی خوّی هات و چوی تهكـیـهی شـێخ سـالّحی بهرزنجی كردووهو دهنگی ههڵێناوه، عهلی كوّر زوّر حهزی خـوێندنهوهی مـهولودی پێـغـهمبـهر دهكـرد كـه پێـشـهكی بهقـورئانی پیـروّز دهست پێـدهكـات لهههمـان كـاتیش دا داوای لهشـههابهی دهنگ خوّش دهكـرد كـهوا بوّی بخـوێنێ ئهوجـا ئهویش گـهرم دهبوو، مـامـوّسـتـای بهڕێز سـهید نهژادی بهرزنجی لهدهست نووسـێكی خوّیدا سـهبارهت بهژیاننامـهی شـههابهی ههولێـری كـهبوّمـانی ناردبوو تیایدا ناوی عهلی كوّری مهولود خوێن و دهنگخـوّشی هێناوه كـه بهم شـێـوهیه باسی دهكــــاتو دهڵێ:(كنت في حـداثتي مـولعـا بالأصـوات الجـميـلة من فـوق المحـافل حـينمـا تتلي الايات القرأنية وكنت أحب صوت زميلي في المدرسة احسـان شيرزاد وفـي المواليد كنت متـأثرا بصـوت عـلي كـدّر في المقامـات بعـد الحاج عـبداللة وكنت أسمع كثيـرا من الاصوات الجميـلة كصوت سيد مردان حينمـا يؤذن ويمجد فـوق المأذن وفي الجـامع الكبيـر في القلعـة) هتد.

مـام عـهلی لهماوهی ژیانیدا تووشی نهخوّشی هاتووهو بوّ ماوهیهك لهماڵهوه كهوتووه لهپاشان مـهرگ مـهودای نهداو لهروّژی (١١)ی مـانگی موحهڕڕهمی ساڵی ١٩٣٨ لهتهمهنی ٧٣ ساڵی دا كوّچی دوایی دهكاتو له گوّڕستانی (ئیمام محهمهد) لهشاری ههولێر بهخاك دهسپێردرێ، مـردنی ئهو بلیمـهته خهسارهتێكی گـهور بووه كهلههونهری مهقامات خوێندنهوهی مهولودی پێغهمبـهر لهو شارهكهوت، لهپاش مـردنیشی حاجی عهبدوڵلای دهفڤن جێگای گرتهوه.

# هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا چ وەک لیواو چ وەک شار

خوێندنەوەی: گۆڤاری هەولێر

**کاتێک کە کوردێک دەیەوێ زێدەڕۆیی لەکۆنی شتێک بکات و تێیبگەیێنێ کە ئەو شتە زۆر کۆنە، ئەوا یەکسەر ئاماژە بەکۆنی شاری هەولێر دەکات و دەڵێ (لە هەولێر کۆنترە).**

**ئەم کۆنییەش لەرووی مێژووییەوە وای لەهەولێر کردووە ببێتە شوێنێکی مێژوویی و جوگرافی و شوێنەواری ئەوتۆ کە مێژوونووسان و لێکۆلەروان بەرمو ناخی رابردووی ئەم شارە شۆڕببنەوەوزیاتر بنج و بنەوانی و لەرموشە جیاجیاکانی بکۆڵنەوەو بەدوای شوێنەوارە دێرینەکانیدا بگەڕێن بۆ ئەوەی رابردوو و ئێستای ئەم شارە لەزنجیرەیەکی توندو تۆڵ بەیەکترەوە ببەستنەوە.**

---

پێشەکی کتێبی (هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا) بەپێشەکییەک لەلایەن بەڕێز محەمەد عەلی قەرەداغی نووسراوەتەوە، بەم دێرانەی سەرەوە دەستپێدەکات و لەسەری بەردەوام دەبێت و باسی ئەڵقەیەکی نادیار لەئەڵقەکانی مێژووی نەتەوەی کورد بەگشتی دەکات و پەردە لەسەر رووی چەندین لایەنی شارراوەی شاری هەولێر هەڵدەداتەوە.

سەرەڕای ئەوەی تاکو ئێستا زۆر وتارو باس و لێکۆڵینەوەو کتێب دەربارەی مێژووی شاری هەولێر لەلایەن دڵسۆزانی ئەم شارە دێرینە تۆمارکراوە. بەڵام ئەم کتێبە، کەبەری رەنجێکی دوور و درێژی پارێزەر (عباس العزاوی)یەو بەڕێز محەمەد عەلی قەرەداغی پێیداچۆتەوەو پێشەکییەکەی بۆنووسیوە، بەردێکی پتەوە لە بناغەی تەلاری بەرزی مێژوی پڕ سەروەری نەتەوەی کورد بە گشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی.

ئەم کتێبە مێژووییە بەنرخەی بەڕێز (عباس العزاوی)، کەلە (١٨٤) لاپەڕەی قەوارە مام ناوەندی پێکهاتووەو لە کۆمپانیای(خەنساء) لەبەغدا ساڵی (٢٠٠١) چاپکراوەو بەزمانی عەرەبی نووسراوەتەوە، بێگومان ئەگەر هەوڵ و هیمەتی تۆژەری بەڕێز محەمەد عەلی قەرەداغی نەبووایە لەوانەیە ئەمەش وەک دەیان کتێبی دیکە چاوی بەرووناکی نەکەوتایەو هەر لە کتێبخانەی دانەری خوالێخۆشبوو وەک رەشنووسێک تەپ و تۆزی لەسەر بنیشتبوایە.

لێكۆڵینەوە لەشارو وڵاتەكان لەم ماوەی دواییەدا سەریهەڵداوەو كوردستانیش یەكێك بووە لەو وڵاتانەی لەرووی مێژوویی و جواگرافیا و شوێنەوارییەوە بایەخێكی زۆری لەلایەن ئەو مێژوونووسانەوە پێدراوەو بەشێكی زۆری ئەم لێكۆڵینەوانەی خۆیان بۆ شارە گرنگەكانی كوردستان تەرخان كردووەو لەوانەش شاری هەولێر، كەكۆنترین شاری كوردستان و عێراقە، هەر بۆیەش كەبەڕیز (عباس العزاوی) دەستی بەلێكۆڵینەوەی شارەكانی عێراق كردووە لەهەولێرەوە دەستی پێكردووە. دانەری كتێبی (هەولێر لەسەردەمە جیاجیاكاندا) باشی بۆ چووە كاتێ كەباسی كۆنی شارستانییەتی عێراق و بایەخی شوێنی جوگرافی و كۆنی مێژووەكەی و بەناوبانگی لەبازرگانی و كشتوكاڵدا دەكات، هەولێر بەپێشەنگی شارەكانی ئەو وڵاتە دادەنێ و دەڵێ (هەولێر دەكەوێتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووك، هەروەك چۆن عێراق دەكەوێتە نێوان دیجلە و فورات، ئەم شارە بەكشتوكاڵ بەناوبانگە و بەهۆی ڕێگاكانی بازرگانییەوە پەیوەندی بەچەندین وڵاتەوە هەیە و لەهەمان كاتیشدا رابردوویەكی مێژوویی دێرینی لەشارستانیەتدا، وەك عێراق، هەیە. چونكە ئەگەر عێراق لەشارستانییەتدا كۆن بێت ، ئەوا بێگومان هەرێمەكانیشی كۆنن، هەولێریش كۆنترین شاری عێراقە، بۆیە دەبێ شارستانییەتەكەی هەولێریش كۆنترین شارستانی بێ).لەبەر چەندین هەڵبەزو دابەزەی گۆڕانكارییە سیاسی و كارگێڕییەكانی سەردەمە جیاجیاكانی بەسەر عێراقدا هاتووە، هەولێریش كەم و زۆر بەشی خۆی بەركەوتووەو ئەم گۆڕانكارییانە لەرووی بەڕێوەبردنەوە گەورە یان بچووكیان



کردۆتەوەو لەهەندێ کاتدا سەربەخۆ و لەهەندی کاتیشدا سەر بە هەرێمێک لەهەرێمەکانی دیکەی ئەم ناوچەیە بووە. بەڵام هیچ کـــام لەم گۆڕانکارییانە کاریگەری ئەوتۆیان لەسەر ژیانی ئابووری (کشتوکاڵی و بازرگانی) و رۆشنبیری نەبووە.

هەولێر بەگوێرەی هەموو سەرچاوە مێژووییە کۆنەکان بەماوەیەکی زۆر بەر لەهاتنی ئیسلام) دروستکراوە، بەڵام بەداخەوە دانەری ئەم کتێبە (عـبـاس العـزاوي) دیارە زۆر ئاگاداری ئەو دۆزینەوە شوێنەوارییانە نەبووە کەرۆژ لەدوای رۆژ دەدۆزرێنەوەو تیشک دەخەنە سەر قۆناخەکانی مـێـژووی هەولێـر، بەر لەهاتنی ئیسـلام و لە سەردەمە زۆر کۆنەکانیدا، کەبۆ ئەم مەبەستەش مـامۆسـتـای خوالێخۆشبوو (زوبێر بیلال ئیسماعیل) بەشێکی تەواوی لە کتێبەکەی خۆی (تـاریـخ اربـل ص٣٦)ی بـۆ ئـەم بـابـەتـە تەرخانکردووەو چەندین شوێنەواری دۆزراوەی کۆنی تێدا تۆمار کردووە. کەم ئاگاداری یان شـــــارەزایی دانەریش لەم رووەوە لەوە بەدەردەکـەوێت کـە شـەڕی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بەتاکە مێژوویێک داناوە بۆ ناوهێنانی یان باسکردنی هەولێـر بەر لەهاتنی ئیسـلام. ئەگـەرچی بەڕێز (عـبـاس العـزاوي) ناوی لەکتێبەکەی خۆی ناوە (هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا)، کە ئەمەش مەزەندەمان بۆ ئەوە دەبات بەتەواوی چووبێتە ناو مێژووی هەولێرو باسێکی بەپێـزی ئەم مـێـژووەی بەر لەهاتنی ئیسـلام بۆ کـردبێ، بەڵام ئەوەی راستی بێ و لەناوەڕۆکی کتێبەکەش هەروا دیارە کە بەڕێزیان باسەکانی بەزۆری بۆ سەردەمەکانی ئیسلامەتی تەرخانکردووە، بۆیە چاکتـر دەبوو ئەگـەر ناوی کـتێبەکەی (هەولێر لەسەردەمە جیـاجیـاکـانی ئیسـلامـدا) بوایە. دانەر مـێـژووی هەولێـری لەرووی سیـاسی و کـارگـێـریی و زانسـتی و ئەدەبیدا، بۆ چەند سەردەمێک لەسەردەمەکانی فەرمانڕەوایەتی ئیسـلام پۆلینکردووەو بەتێرو تەسەلی باسی ئەم لایەنانەی تێـدا کـردووە. دەشتـوانین لەم بارەیەوە بڵێین بەراستی خۆی ماندووکردووەو شایستەی ئەوەیە دەستخۆشی لێبکەین، چونکە مـێـژووی هەولێـری، هەر لەفەرمانڕەوایەتی (ئال بەکتکین)ەوە تاکو دوای سـەردەمی عـوسـمـانـیـیـەکـانیش بەدرێژایی باسکردووە.

**هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکانی ئیسلامدا**

تاکۆتایی حوکمی ئەمەوییەکان و سەرەتای حوکمی عـەباسـیـیـەکـان، هەولێـرو شارەزوور هەردووکـیـان، لەرووی بەڕێوەبردنەوە، سـەربە ویلایەتی مــووسـڵ بوونە، لەســـەردەمی عـەباسـیـیـەکـانیش لەبەر ئەوەی ئەوەندە شتی تۆمارکراو دەربارەی شارەکان نەبووە، بەتایبەتی قـەزایەکـان کە ئەو کات هەولێر قـەزایەکی سەر بەلیـوای حەلوان بووە بۆیە یەکـە کـارگـێـڕییـە بچـووکـەکـان لەو سـەردەمـەدا ئەوەندە ناویان نەهاتووە، ئەگـەر هاتبـێـتـیش ئەوە بەناوی ئەو لیوایە یان ئیمـارەتەوە هاتووە کە قـەزاکەی سەر بەو بووە، ئەوەی لەو سەردەمیش زانرابێ ئەوەبووە کە هەولێر لەساڵی (٢٢)ی کۆچی لەسەر دەستی (عـتـبـة بن فـرقـدالسلمي)یەوە گـیـراوە (بڕوانە تاریخ اربیل- زبیر بلال اسماعیل ص٦٩). بەڵام دوای مـــاوەیەک بـەتـایـبـــەتی لـەســـەردەمی (بوەیهـیـیەکان) هەولێر لە(حەلوان) جیا بۆتەوەو بووەتە مـیـرنشین و لەلایەن مـیـرێکەوە بەڕێوە دەبردراو یەکسەر سەر بەدەوڵەتەوە بوو. دەربارەی کـاری زانسـتی و زاناکـانی ئەو سـەردەمـەشدا، هەروەک گـوتمان، چونکە هەولێـر قـەزایەک بووە، بۆیە هەر کـارێکی زانسـتی ئەنجـامـدرابێ یان زانایەکی هەولێـری دەرکـەوتبێ ئەوا بەناوی ئەو

میرنیشینە تۆمارکراوە کە هەولێر بەشێک بووە لێی. بەڵام سەرباری ئەوەش چەندین زانای ناودار لەو شارە دەرکەوتوون و دوای ئەوەی بەزانست و زانیاری ئەم شارە مەست بوونە ئینجارووپانکردۆتە شارەکانی دیکەو سوودیان بەوان گەیاندووە. بەداخەوە لێرەشدا بەرێزدانەری کتێبی (هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا) کەوتۆتە ناو هەڵەوەو بەپێچەوانەوە لێکیداوەتەوە. سەبارەت بەناوی زانا بەناوبانگەکانی شاری هەولێریش دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکەی مامۆستا عەبدوڵڵا فەرهادی (الاکلیل محاسن اربیل، او شفاء العلیل وسقاء القلیل من تراث ماثر علماء وادباء اربیل)، هەروەها دەستنووسەکەی خوالێخۆشبوو (زبیر بلال اسماعیل) بەناوی (اعلام اربیل).

**هەولێر لەسەردەمی (ئال بەکتکین)**

ئەو میرنشینە لەساڵی (٥٢٢ک-١١٢٨ز) لەسەردەمی عمادالدین زەنگی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەتابەگی لەهەولێر بۆ (زین الدین عەلی کچک) دامەزراو ماوەیەک سەر بەو دەوڵەتە بووەو پاشان لەساڵی (٥٨٠ک-١١٨٤ز) چووە سەر (دەوڵەتی ئەیوبی) لەشام و دواتریش لەساڵی (٦٢٨ک-١٢٥٠ز) کەوتەوە دەستی عەباسیەکان.

ئەم میرنشینە (ئال بەکتکین)، توانی بارە سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵاتییەکانی هەولێر بەرەو پێشەوە ببات و چەندین پرۆژەی گەورەی تێدا دابمەزرێنی، بەتایبەتیش لەسەردەمی میر (مظفر الدین کوکبریە) کەبەتەواوی ئەم شارە پێشکەوت و گەشەی کرد.

لەو میرە ناودارانەی کە لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوایی میرنیشینی هەولێریان کردووە ئەمانەبوونە:

١- زین الدین کچک، یەکەم میری هەولێر بووە لەو سەردەمەداو لەساڵی (٥٢٢) ی کۆچی فەرمانڕەوایی پێ سپێردراوە، لەساڵی (٥٦٣ک-١١٦٨ز) لەهەولێر کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە.

٢- مظفر الدین کوکبری کوڕی زین الدین - جاری یەکەم- لەم جارەدا ئەم میرە تەمەنی چوارده ساڵی بووەو و بەهۆی دووبەرەکی نێوان ئەو و (مجاهیدالدین قایماز)، کە باوکی کوکبری بەجێگری خۆی دانابوو، کوکبری لابردراو برا بچووکەکەی (زین الدین یوسف نیالتکین) لەجێگای داندرا.

٣- ئەبو المظفر زین الدین یوسف نیالتکین، ماوەی (٢٠) ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئەم شارەی کرد، بەڵام وادیارە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی کردەوەکانی ئەم میرە لەلایەن مێژوونووسانەوە تۆمارنەکراوە، تەنها چەند شەڕو شۆڕێکی نەبێ.ئەم بەهۆی نەخۆشکەوتنی لە ٢٨ ی رەمەزانی ساڵی ٥٨٦ ی کۆچی ١١٩٠ ی زاینی کۆچی دوایی کردووە.

٤- مظفر کوکبری - بۆ جاری دووەم- مەزنترین میری (ئالبەکتکین) بووەو ناوی لەسەر پارەی ئەو میرنیشینە بەناوی (پاشای میران مظفر الدین ئەبو سەعید کوکبری) هاتووە. بەراستیش پیاوی مێژوو بووەو مێژوویەکی پڕ سەروەری، لەهەولێر، بۆ خۆی تۆمارکردووە. مێژووی کارەچاکەکانی ئەو کاتە دەستپێدەکات کە دوای کۆچی دوایی براکەی لەساڵی (٥٨٦ک) لەلایەن سوڵتان سەلاحەدینەوە بۆ هەولێر گەڕایەوەو تاکو ساڵی (٦٢٨) ی کۆچیش وەک دڵسۆزێک کاری بۆ دەوڵەتی ئەیوبی کردووەو و لەم ساڵەش بەدواوە لە ئەیوبییەکان جودا بۆتەوە و دڵسۆزی خۆی بۆ دەوڵەتی عەباسی نواندووە.

ئەوەی راستی بێ، مێژوو تەنها باری کارگێڕی و سیاسی نییە، بەڵکو ژیانی هەر گەلێک

پەیوەستە بەزانینی چەندین لایەنی زانستی و ئەدەبی و بزاڤی هزری و شارستانییەت و ژیانی رۆژانەو گوزەران، بۆیە زانینی ئەو رەوشانەی هەولێریش لەم سەردەمەدا بەتایبەتی و سەردەمە جیاجیاکاندا بەگشتی پێویستە.

هەولێر لەو سەردەمەداو بە تایبەتی لەسەردەمی (مظفر الدین کوکبری)، لەبواری زانستی و بزاڤی هزریدا یەکجار گەشەی کردووەو بایەخێکی زۆری پێدراوە، کە چەندین زاناو زانای ئایینی و وتارخوێن و شاعیرو سیاسەتمەدار و نووسەرو قازی و مێژوونووس و... هتد تێدا پەروەردە بووە.

هەروەها لەسەردەمی ئەم میرنشینەدا چەندین قوتابخانەی ئایینی دروستکراوە، وەک قوتابخانەی (الربض)و قوتابخانەی (قەلا)و قوتابخانەی (کوکبری).

**هەولێر لەسەردەمی مەغۆل و تورکمانەکان**

دانەری کتێبی (هەولێر لەسەردەمە جیاجیاکاندا) بەڕێز (عباس العزاوی) دەربارەی ئەم سەردەمە دەڵێ «کاروباری هەولێر لەو سەردەمەدا زۆر دیار نەبووەو ئەو لاپەڕانەی لەسەر نووسراونەتەوە، لێرەو لەوێ پەرش و بڵاوبوون و نووسەرێکی شاری هەولێریشمان نەدۆزیەوە کە بەدرێژی لەسەر ئەم شارەی نووسیبێ».

بەڵام سەرەڕای ئەمەش بەڕێزیان، سەبارەت بەباسکردنی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی و ئەدەبی ئەم شارە، دەستەوەستان نەوەستاوە.

بەڵکو سەرەتای دەسپێکردنی ئەو سەردەمەی بەو کاتە دەستنیشانکردووە کە (عزالدین ئەبوالفضل ئیبن ئەلعەلقەمی) بووەتە وەزیرو ئەو کاتە هەولێر یەکسەر کەوتۆتە کۆشی مەغۆلەکان.

لەماوەی دەسەڵاتی مەغۆلەکانیش چەندین میری کورد فەرمانڕەوایەتی شاری هەولێریان کردووەو هەر بەناو سەر بەمەغۆلەکانەوە بوونە، لەوانەش:

(مەلیک شەرەفەدین کوڕی سالار) و (مبارزالدین کک) و (عزالدین کوڕی مبارزالدین کک) و (نجم‌الدین خضر)ی برای (مبارزالدین کک)و دوای ئەمیش کوڕەکەی (نجم‌الدین خضر).

لەسەردەمی جەلایرییەکانیش (شێخ عەلی) میری هەولێر بووەو سەرەڕای ئەو میرە کوردانەش چەند میرێکی مەغۆلی و تورکمان هەر لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوایەتی هەولێریان کردووە.

سەبارەت بەبەڕێوەبردنی هەولێر لەلایەن مەغۆلەکانەوە لەو سەردەمەدا، لەبەر ئەوەی مەغۆلەکان زیاتر بایەخیان بەشەڕوشۆڕو داگیرکردن و پەلاماردانەوە داوە، بۆیە کاروباری هەولێریان خستۆتە پشتگوێ و هەر لەسەرەتای هاتنیشیان تێکدەرو رووخێنەربوونەو دەستی کاولکاریشیان گەیشتۆتە هەولێرو لەئەنجامی هێرشەکانیان قوتابخانەی (الربض) تێکو پێک دراوە.

فەرمانڕەواکانی ئەم شارە، کە زۆریان خەڵکی هەولێر نەبوونە، پیاو خراپ و جەردەو دەستپیس بوونەو هەولێریان دابڕ دابڕکردووەو سامانەکەیان بەرۆژی رووناک دزیوە.

ئەگەرچی باری زانستی و ئەدەبی گۆڕانکارییەکی ئەو تۆیان بەسەردا نەهات و وەکو خۆیان مانەوە، بەڵام بایەخیشیان پێ نەدراو پێشنەکەوتن.

نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە خەڵکی ئەو شارە هەر خۆیان بایەخێکی یەکجار زۆریان بەزانست و ئەدەب دەداو ببوونە سەرچاوەیەکی زانستی بۆ دەوروبەرو ولاتانی دووریش، بۆیە لەو سەردەمەشدا، ئەگەرچی قوتابخانەی نوێ دروست نەکران، زانست و ئەدەب هەر بەرەو پێشەوە دەرۆیشت و گەلێ زانای بەناوبانگ پەیدا بوون.

**لەسەردەمی عوسمانیدا**

بەڕێز دانەری ئەم کتێبە هەولێرمان لەسێ لایەنەوە بۆ باس دەکات کە بریتین لە:

١- رەوشی سیاسی

٢- باری کۆمەڵایەتی و ئابووری

٣- باری رۆشنبیری و زانستی و ئەدەبیات

بەڵام لەهەمان کاتیشدا لایەنی باوەڕەکان لەو شارەدا بەجوانی شی دەکاتەوەو بەوردی باسیان دەکات کە ئەمانەش بریتین لە:

١- باوەڕی ئیسلام ٢- باوەڕی یەزیدی

٣- باوەڕی کاکیی ٤- باوەڕی فەلەو جوولەکەکان.

لەباسکردنی ئەو باوەڕانەش، بەدوورو درێژی باسی باوەڕی ئیسلام دەکات و هەروەها فیقهەکانی ئەم ئایینەو ڕێبازو ڕێگاکانی و پەیمانگا خێرخوازی و مزگەوت و تەکییە بەناوبانگەکانی ئەم شارە یەکە یەکە دەخاتە بەرچاومان و ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە زۆربەی کوردو هەموو دانیشتوانی هەولێر لەسەر ڕێبازی شافعین.

هەروەها ئەوەشمان بۆ روون دەکاتەوە کە زاناکانی باوەڕ لەو سەردەمەدا ئارەزوویان بەرەو فەلسەفە دەچوو و بایەخیان بەڕێگاکان دەدا، هەر بۆیەش چەندین ڕێگای ئایینی لەهەولێر سەریهەڵدا لەوانەش: ڕێگای قادری و نەقشبەندی، کەیەکەمیان بۆ (شێخ عەبدولقادر الجیلی) دەگەڕێتەوەو دووەمیشیان بۆ (شێخ خالد نەقشبەندی) کە دوای ئەوەی چووە هند لەوێ ئەم ڕێگایەی لەشێخ عەبدوڵلای دەهلی وەرگرت. ئەوانەی بۆ یەکەمجار ڕێگای قادریەیان گرتە بەر شێخەکانی (تەکیەی خان ئەحمەد) بوون، کە دەکەوێتە سەر قەڵای هەولێرو ناوی بە (تەکیەی شێخ زادە) دەرکردووە.

ئەوانەش کەڕێگای نەقشبەندیان لەهەولێر وەرگرت کۆمەڵێ زانای ئایینی بوون، لەوانەش شێخ ئەبوبەکری مەلا فەندی و شێخ هیدایەتوڵلا بوون. بۆ ئەم مەبەستەش چەندین تەکیە هەبوو کە ئەو ڕێگایانەیان تێدا بلاودەکردەوە وەک تەکیەی شێخ عارف و تەکیەی شێخ نوری و هی دیکە.

سەرباری ئەم تەکیانەی کە ئەو ڕێگایانەیان تێدا بلاودەکرایەوە، چەندین مزگەوتی پیرۆزی تێدا هەبوو، باوەڕی ئیسلامیان تێدا بلاو دەکردنەوەو وانەی ئایینییان تێدا دەخوێندرا.

لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، بەڕێوەبردنی لیوای هەولێر چەند جارێک گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، جارێک سەربەخۆ بووەو جارێک بووەتە قەزایەک لەشارەزوور، کەپێشتر شارەزوور بەشێک بووە لە هەولێر، بەڵام هەولێر لەلایەکی دیکەوە گرنگی لەلایەن عوسمانییەکانەوە پەیداکرد کاتێ کە هەندێ لەتورکەکانی تێدا نیشتەجێ بوون و پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەهێزکرد.

پێشتر ئەوەمان زانی کە لەسەردەمی مەغۆلەکان چەند میرنشینێکی بچووک لەدەوروبەری هەولێرو شارەزوور پەیدا بوون و یەکێک لەوانەش میرنشینی سۆران بوو کە دامەزرێنەرەکەی ناوی (کەلۆس) بووەو خەڵکی گوندی (هاودیان) بووە.

لەسەردەمی یەکێک لەمیرەکانی ئەو میرنشینە هەولێر دەکەوێتە ژێر رکێفی میرنشینی سۆران. بەڵام کاتێ کە (سوڵتان سلێمان قانونی) لەساڵی (٩٤١)ی کۆچی ویستی بەغدا بگرێ، بۆ ئەم مەبەستەش لە هەرێمی هەولێر دەگیرسێتەوە، بەڵام لەو کاتەدا هەست بەوە دەکات کە نامە گۆڕینەوەیەک لەنێوان میری سۆرانی ئەو کات و شای ئێران هەیە، بۆیە یەکسەر ئەو میرە دەکوژێ و لەجیاتی ئەو (حوسێن بەگی داسنی) میری یەزیدییەکان دەکاتە فەرمانڕەوای هەولێرو بەم جۆرە هەولێر لەژێر دەستی فەرمانڕەوایی میرنشینی سۆران دەردەچێ.

بەڵام وا دیارە بارودۆخی هەرێمەکە بەگشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی وا بەئاسانی جێگیر نەبووەو هەمیشە ململانێ لەسەر فەرمانڕەوایەتی هەولێر بەردەوام بووە. تا ئەو کاتەی کە عوسمانییەکان لەسەردەمی سوڵتان موڕادی چوارەم لەساڵی (١٠٤٨ک-١٦٣٩ز) بەغدایان داگیرکردو لەبەر ململانێی داگیرکاری و بەرگریکردن لەناوچە داگیرکراوەکان زۆر ئاگایان لەکاروباری میرنشینە کوردییەکان نەمابوو. هەر لەو کاتەشدا دەسەڵاتی میرنشینی بابان پەرەی سەندبوو و فەرمانڕەوایەتی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی دەکرد، تەنها ناو شارەکەی هەولێر نەبێ کە سەر بە موسڵ بووەو هەتا کۆتایی هاتنی سەردەمی عوسمانییەکان هەر سەر بەدەوڵەت بووەو دوای میرنشینی سۆرانیش هیچ میرنشینێکی دیکە لەهەولێر دەرنەکەوتووە.

شێوەی بەڕێوەبردنی هەولێریش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، هەر لەسەرەتای دەست بەسەرداگرتنییەوە تاکو کۆتایی ئەم دەوڵەتە، بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

١- هەر ئەوکاتەی هەولێر کەوتۆتە بەردەستی عوسمانییەکان واتە لەساڵی ١٩٤١ک-١٥٣٤ز، تاکو سەردەمی سوڵتان سلێمان قانونی ئەم شارە وەک لیوایەک بووەو ماوەیەکیش بەم جۆرە ماوەتەوە.

٢- کاتێ کە میرنشینە خۆجێییەکان دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا گرتووە، تەنها هەولێر نەبێ بووەتە قەزایەک و هەندێ جار سەربە موسڵ و هەندێ جاری دیکە سەربە کەرکوک یان شارەزوور بووە.

٣- لەسەردەمی والی بەغدا (سەرداری ئەکرەم)، هەولێرو موسل و کەرکوک و بەسرەو هەتا دیاربەکر دەکەونە ژێر دەسەڵاتی.

٤- لەسەردەمی مەدحەت پاشادا هەولێر لیوا نەبووەو دەوڵەت زۆر ئاگای لە کاروبارە گرنگەکانی نەماوە.

٥- لەدوا قۆناغیشدا هەولێر تاکو کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی هەر وەک قەزایەک ماوەتەوە.

ئەوە کەمێک بوو سەبارەت بەباوەڕەکان و رەوشی سیاسی و کارگێڕی هەولێر لەسەردەمی عوسمانییەکاندا. هەروەها سەبارەت بەباری کۆمەڵایەتی ئەم شارەش دەتوانین بڵێین، دانیشتوانی لیوای هەولێر کورد بوونەو پەروەردەیەکی کوردانەیان هەبووە، بەڵام کاریگەری تورکەکانیان پێوە دیار بووە ئەوەش لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا چ کوردو چ عەرەب پێویستیان بەوە هەبووە بایەخ بەزمان و داب و نەریتی تورکەکان بدەن بۆ ئەوەی کاروباری رۆژانەیان بیەنەسەر، هەر بۆیەش تێکەڵاوییەک لەنێوان ئەم زمانانەدا هەیە. لەرووی پێکهاتەی کۆمەڵگەی هەولێریش، بەزۆری پێکهاتەیەکی تێکەڵاوە لەچەندین عەشیرەتی گەورەو بچووک.

سەبارەت بەباری زانستی و ئەدەبیش، سەرچاوەی رۆشنبیری ئەم شارە عەرەبی ئیسلامییە، چونکە کورد ئیسلام بووەو ئایینی ئیسلامیش بەزمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوەو خواپەرستی پێکراوە، هەر بۆیەش شارستانییەتی عەرەبی کاریگەری لەسەر هەولێر هەبووە، هەروەک لەسەر تێکڕای دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە. زاناو زانا ئایینییەکانی هەولێر لەو سەردەمەدا لەزمانەکانی کوردو فارسی و عەرەبی و تورکی دەستێکی باڵایان هەبووەو بەسەربەخۆیی بەهەموو وڵاتاندا گەڕان و نموونەیەکی دڵسۆزو راستەقینەبوونە لەتێکەڵاوبوونی بیروڕاو رۆشنبیری و ئەدەبی گەلاندا.

هەروەها لەرسەردەمەدا چەندین زانای بەناوبانگ لەهەولێر دەرکەوتن و دەستێکی

بالآیان لەبلاوکردنەوەی زانستی فیقهی زمان و ئاخاوتن و زانستەکانیدا هەبوو، لەوانەش خانەوادەی حەیدەرییان و خانەوادەی مەلافەندی لەهەولێرو گەلێکی تر.

بێگومان ئەو زانایانەش چەند ئەلقەیەک بوونە لەزنجیرەی زاناکانی سەردەمەکانی پێش خۆیان و هیچ بۆشاییەک لەنێوانیاندا نەبووە. هەروەها چەندین ئەدیبی بەناوبانگیش لەهەولێر دەرکەوتوون و شاعیری ناوداریان تێدا پەیدابووە، کە زۆربەیان بەکوردی شیعریان نووسیوەو هەندێکیشیان بەزمانەکانی دیکە نووسیویانە، چونکە ئەم زمانانەشیان وەکو کوردی زانیوە، بەتایبەتی لەهەولێر بەزمانی تورکییان نووسیوە چونکە ئەم شارە لەلایەک لە ئەستەنبول نزیک بووەو لەلایەکی دیکەشەوە سەرەڕێی تورکان بووە.

هەروەها نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کەزمانی رەسمی و خوێندنی سەردەم تورکی بووە، هەروەک چۆن لەسەردەمی فارسەکان فارسی بوودو لەسەردەمی حوکمی عێراق عەرەبی بووە.

بەلآم هەروەک دانەری کتێب بۆی چووەو لەکتێبەکەی خۆیدا دەڵێ: (( هەڵسانەوەی زمانی کوردی لەسلێمانییەوە دەستی پێکردووە)).

**هەولێر لەدوای سەردەمی عوسمانییەکاندا:**

ئەوەی لەو سەردەمەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە هەولێر لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکراوەو دوای ئەوەش لە (٢٣)ی ئابی سالی (١٩٢١)ز دەوڵەتی عێراق دروستبوودو لە (٩)ی مایسی (١٩٤٥)یش جەنگی دووەمی جیهانی کۆتایی پێهاتووە، بەلآم ژیانی سیاسی هەولێر لەم ماوەیەدا بەهیچ شێوەیەک جێگیر نەبوودو ناخۆشی ژیان و برسێتی باڵی بەسەر ئەم شارەدا کێشاوەو هەولێریش هەروەک شارەکانی دیکەی کوردستان و عێراق حەزی نەکردووە بێگانە داگیری بکات.

لەرووی کارگێریشەوە هەولێر لەو سەردەمەدا کراوەتە لیواو چەندین قەزاو ناحیەی نوێی پێوە لکێندراوە.

لەرووی کۆمەلآیەتییەوە، هەولێر زیاتر پێشکەوتنی بەخۆوە بینی و تیرەو هۆزو عەشیرەتەکانی دەوروبەر روویان لەهەولێر کردو زیاتر جێگیربوون، عەشیرەتەکانیش هەر ئەوانەبوون کە لەسەردەمەکانی پێشتر، بەتایبەتی لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، هەبوون. بەلآم لەو سەردەمەدا چەند خانەوادەیەکی بەناوبانگ لەهەولێر هەبوون، لەوانەش:

خانەوادەی (ئەحمەد ئاغا) و (عوزێر ئاغا) و (قاسم ئاغا) و (ئەسعەدە فەندی) و (دۆغرەمەچییەکان) و (وەهاب ئاغا) و (دەباغەکان) و (مەلا فەندی).

هەروەها لەو سەردەمەدا سەرچاوەکانی رۆشنبیری تەنها مزگەوت و قوتابخانە ئایینییەکان نەبوون، بەڵکو قوتابخانەی دیکە بۆ خوێندنی زانستە جیاجیاکان کرانەوەو چەندین رۆژنامەو گۆڤار بلآوکرانەوەو رادیۆو تەلەفزیۆن رۆڵی خۆیان لەم بوارەدا بینی، هەروەها چەندین چاپخانە بۆ چاپکردنی کتێب و بلآوکراوەکان کەوتنە گۆڕێ و بەتایبەتی لەهەولێر سەرەڕای خوێندن لەمزگەوتەکان، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دروستکران و زانستەکان پەرەیان سەند.



# هەولێر لەیادەوەری گەڕیدەکاندا

نوری پەترۆس

**هەولێر هەر لە دێر زەمانەوە پلە و پایەکی گرنگی لەجیهاندا هەبووە ، بەتایبەتی لەمێژووی رۆژهەلاتی دێریندا، چونکە چەندین ولات ومیرنشین حوکمڕانییان بەسەردا کردووەو ململانێیەکی زۆر لەنێوان ئەو گەلە کۆنانەی کەلەم ناوچەیەو دەوروبەریدا ژیاون، روویداوە.**

تائێستاش هەولێر جێگای بایەخپێدانی توێژەرو لێکۆڵەرەوانەو قەلا دێرینە مێژوویەکەی گەنجینەیەکی مەزنی ئاسەواری تێدایە کە هێشتا دەستی لێکۆڵەرەوان و پسپۆران و ئەوانەی کەبەدوای ئاسەواردا دەگەڕێن پێی نەگەیشتووەو خەلکێکی زۆریش لەوانەی کە بایەخیان پێی داوە سەرنجی بەلای خۆیدا راکێشاون و بەرگەی ماندووبوونی گەشت وگواستنەوەیان گرتووە بۆ ئەوەی زانیاری بەدەست بێنن لەبارەی حاڵ و مێژوو و پێگەو پلە و پایەی لەهەرێمی کوردستاندا.

زۆر لەگەڕیدە و سەرکەش و لێکۆڵەرەوان بەدوای گەنجینە کۆنەکاندا، روویان لە هەولێر کردووە رۆژهەلاتی و رۆژاواییان تێدایەو چەندین مەبەست و ئامانجیان بۆ هاتنەکانیان هەڵبەست، بەلام تەنیا لەیەک حاڵەتدا رێک دەکەون، ئەویش لێکۆڵینەوە و زانیارییە.

ئەو گەشتانە ناوی زۆر لەو پێگەو شوێنانەمان بۆ دەخەنەڕوو لەگەڵ ئەو ناوانەی کە گەڕیدەکان باسیان کردووەو ئەو پاڵنەرانەی کەبوونەتە هۆی دروستبوونی ئەو ناوانە وەکو رووداوێک یان شەڕێک کە لەو ناوچانەیەدا روویدابێت.

گومانیش لەوەدا نییە کە توێژینەوەی ناوی شوێنەکان لە هەچ هەرێمێک یان ناوچەیەک لەناوچەکان ، بنەمایەکی مێژوویی و جوگرافی هەیە و هەندێکیان ئاماژە بەناوی پاشاو سەرکردەو شانشین و دەوڵەتەکان دەکەن لەگەڵ ئەوەی کە پێیانەوە پەیوەستە لە مێژووی شاراوە و هەندێکیان گوزارشت لەکاروباری کۆمەلایەتی و دارایی و کارگێڕی دەکات.

هەولێر یەکێکە لەکۆنترین ئەوپێگە

مرۆییانەی کە چەندین قۆناغی مێژوویی بەسەردا تێپەڕیوەو لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتی و کارەسات و جەنگ و هێرشانەی کە کراوەتە سەری هەرماوەتەوە، هەر بۆیە ئەمانە هەموو حەزو ئارەزووی لێکۆڵەرو سەرکەش و گەڕیدەکانی وروژاند لەپێناو خوێندنەوەی ئاسەواری رابردوو و نووسینەوەی حاڵ و سروشتەکانی.

گەشتی ئەوانەی کەبەدوای ئاسەوار و گەنجینە کۆنەکاندا دەگەڕێن لەسەدەی هەژدەوە دەستی پێ کرد، کاتێک گەڕیدە ئینگلیزی جاکسۆن لەساڵی ١٧٦٧ی زاینیدا سەری لە هەولێرداو ئەوەی کە بینیوێتی لە کتێبێکدا کە لە لەندەن چاپ کرا، نووسیوێتی جاکسۆن بۆ گەیشتنی بۆ هەولێر، بەچەندین شاردا تێپەڕیوە وەکو توزخورماتوو داقوق و قەرەتەپەو کەرکوک و ئاڵتون کۆپری و پاشان هەولێرو عەنکاوەو لەدواییدا بەجێی هێشت بەرەو ئاسکی کەلەک و قەرەقوش و لەوێشەوە بۆ دیاربەکر لەرێگای موسڵەوە. کەچی ئولیڤییە کە گەڕیدەیەکی فەرەنسییە لەژمارەیەک لەهەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا گەڕاوە لەسالانی (١٧٩٤-١٧٩٦)، ئەم گەڕیدە رێگای جەزیرەی گرتە بەرو گەیشتە موسڵ و پاشان هەولێر ئینجا بەجێی هێشت بەرەو ئێران. پاشان لە ئاوی خازر بەمەلە پەڕییەوە لە سەردەمانی کۆندا بۆمبیلۆسیان پێ دەگوت. ئەوسا گەیشتنە زێی سەروو کەلای فارسە دێرینەکان ناوی (زاباتس یان لێ ناوەو یۆنانییەکانیش ناوی (لیکس) یان لێ ناوەو خۆشی رووباری زێی سەرووە.

ئەم گەڕیدە دەڵێت: (هەندێک لەکوردەکان یارمەتییان داین بۆ پەڕینەوە لە زێی سەروو لەسەر کەلەک و زۆر خۆشحاڵ بووین لەشارەزایی ئەوانەو پەڕینەوەکەمان کاتژمێرێکی خایاند) لەو گوندەی کە کەوتۆتە کەناری چەپییەوەو ناوی (کەلەک)ە رانەوەستا، بەر لەگەیشتنی ئەو گەڕیدە بۆ هەولێر، ئەو شەڕە مێژووییەی کە لەنێوان ئەسکەندەرو دارادا روویداوە، دێنێتەوە یاد کە لە دەشتاییەکی پان و بەرین و فراواندا روویداو لەجوانترین دەشتاییەکانی ناوچەکەیە لە گوندێکدا کەناوی(کوکا میلا)ی لێناو لەوانەیە بکەوێتە لای راستی زێیەکەوە، سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوەیان کردووە کاتێک کە دارالەشەڕدا رایکردو بە رۆژئاوادا رۆیشت کەلە لەزێ پەڕییەوەو لە نیوەی شەودا گەیشتە هەولێرو ئەو شەڕەش لەبەرە بەیانەوە تاوەکو کاتژمێر چواری عەسری خایاند، پاشان ئۆلیڤییە دەڵێت: (عەنکاوەمان لەبیست و حەوتی تشرینی یەکەمدا بەجێ هێشت و لەدوای نیو کاتژمێر رۆیشتن گەیشتینە هەولێر کە لەسەر قەڵایەکی دەستکردی بەرزەوە بنیات نراوە کە لوتکەکەی پانەو شوورایەکی کۆن دەورووبەری گرتووە.

ئەو گردەی کەباسی لێ کرا، زۆر لەگردی حەلەب بەرزترەو لەدەستکردی ئادەمیزاد نییەو خەڵکی هەولێر تەنیا دوو هەزار کەسن و

هەموویان کوردن و کەمێکیشیان کلدانین.

هەندێک پاشماوەو شوێنەواریش دەبینرێت لەوانەش بورجێک یا منارەیەک کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان مزەفەر، هەولێر سەر بە پاشانشینی (ویلایەتی بەغدایە و سنجەقێک و حامیەیەکی بەهێزی لەئینکیشارییەکان هەیە کە هێزێکی سوپایی عوسمانییە، گەڕیدە ناوبراو لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (بەگوندی قوشتەپەدا تێپەڕین کە گوندێکی بچوکەو لەدوای ڕۆیشتنی هەشت کاتژمێر گەیشتینە ئاڵتون کۆپری کە لەسەر بەرد لەنێوان هەردوو لقی زێی بچوکدا بنیات نراوەو بەتلیمۆس لەنووسینەکانیدا بەناوی (کاپرۆس)ەوە باسی کردووەو پردێکی زێرییەو کە دەچیتە ناو گوندەکەوە لە پردێکەوە کە لەسەر بەردی کۆن بنیات نراوەو ئەسپ ناتوانێت بەسەریدا سەرکەوێت ئەگەر لەدوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر نەبێت، ئاستی ئاویشی لەم ماوەیەی ساڵدا بەرزبۆتەوە، لەوێش لەلای ئاغادا لاماندا و نان و شیومان لەگەڵ کوڕەکانیدا بەکەوچکی دار خواردو پاشان تووتن و قاوەیان پێشکەش کردین ، لەرۆژی بیست و هەشتەمدا بەجێمان هێشت بەرەو کەرکوک .

جیمس بکنگام لەساڵی (١٨١٦)دا سەری لە هەولێرداوەو لەرێگای موسڵەوە گەیشتۆتە شارەکەو دەڵێت: هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو کاتێک کە عەنکاوەمان بەجێهێشتو بەرەو باشوور کە زەوییەکەی بە بێستان داپۆشرابوو، دواتر لەدووری چوار میل و پاش هەڵاتنی خۆر گەیشتینە (ئەرویل) یان هەولێر، ئەمەش گەورەترین شاربوو کە بیبینین لەدوای ئەوەی شاری موسڵمان بەجێ هێشت کە دەیانگوت ژمارەی دانیشتوانی پتر لە دەهەزار کەسەو بازاڕو شەقامەکانی پڕن لەخەڵکی و ئەم بازاڕانە سەرپۆشیان کە لە لقی دار دروست کراوبوو دوو مزگەوتی گەورەمان تێدا بەدی کرد، بەڵام دیمەنی سەرەکی ئەم شارە قەڵای گەورەیە کە دەکەوێتە سەر بەرزاییەک لەناوەڕاستداو لەقەڵای حەلەب دەچێت و گومان لەوەشدا نییە کە دەستکردی مرۆڤە و لەناو شوراکانی قەڵادا خانووی زۆر هەیە.

گەواهی زۆربەی جوگرافیناسە نوێیەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم پێگەیە هەمان ئەربیلایەکە داریۆش لەدوای شەڕی کوکا میلا پاشەکشێی بۆ کردو لەتاریکیدا لەبەردەم ئەسکەندەردا بەرەو میدیا هەڵات و ئەسکەندەریش چووە ناو هەولێرەوە لەدوای ئەوەی کەشارەکە خۆی بەدەستەوە دایەوەو دەستکەوتەکانی شەڕەکەیان پێشکەش کرد کە بەچوار هەزار کێش لەپارەمەزندە دەکرێت و زۆربەیشی لەو پارانە بوون کە لەخەزنە بەجێماوەکانی دارا دابوون. هەر یەک لەسترا بۆ و ئاریان و بلۆتارک کە مێژوونووسی یۆنانیین وایبۆ دەچن کەشەڕەکە لەنزیک هەولێردا روویدا وەسترابۆ ئاریان ژمارەی هێزە فارسەکان بەچل هەزار سوارو ملیۆنێک پیادەو دووسەد گالیسکە و پازدە فیل مەزندە دەکەن.

لەدوای شەش کاتژمێر لەپیادە ڕۆیشتن نزیکەی پەنجا میلمان لەسەرپشتی ئەسپ بڕی و گەیشتینە (ئاڵتون سو)و چووینە ناو ئاڵتون کۆپری یان پردی زێڕین و بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە چونکە بەهۆی ئەو پردە فراوانەوە دەژین، دانیشتووەکانی شارەکە بەنزیکەی شەش هەزار کەس مەزەندە دەکرێن کە زۆربەیان کوردو تورکمانن، گومان لەوەشدا نییە کە ئەم ڕووبارە زێی خواروەوە کە زینەفۆن (زابوتوس)ی ناوناوەو بەتلەیمۆسیش ناوی (کاپرۆس)ی لێ ناوەخۆ ئەگەر ناوی (زربا)مان بەسەر زێی سەروودا دەربڕی کەواتە هەولێر دەکەوێتە نێوان ئەو دوو ڕووبارەو لەوپێگەیەدا کە بەتلیمۆس دیاریکرد ، کاتێکیش لەماڵی ئاغادا دانیشتین کە باڵەخانەیەکی بەرز بوو و دەیڕوانییە سەر ڕووبارەکەو بەرزییەکەی پەنجا پێیە دیمەنکە لەبەردەمی ئێمەدا بەرەو شاخە بەرزەکانی کوردستان کشاو هەندێک لەلووتکەکان بەبەفر داپۆشرابوون و لەدوای ئەوەی کە سی و پێنج میلمان بەئاراستەی باشووی ڕۆژهەڵات بڕی، گەیشتینە کەرکوک (٣).

ئەوەی زانراوە کە بکنگهام (١٧٨٦-١٨٥٥) یەکێکە لە بەناوبانگترین گەڕیدە ئینگلیزەکان لەرۆژهەڵاتدا لەمیانەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا.

بەڵام نیپور کە گەڕیدە و زانایەکی دانیمارکی پسپۆڕە لە گەشتە جوگرافییەکان وگەردوونناسی و زمانە ڕۆژهەڵاتییەکاندا بەسەرۆکایەتی تیمێکی زانستی لە ساڵی ١٧٦١ هاتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات تاوەکو لەبارەی باری کۆمەڵایەتی و جوگرافیا بکۆڵێتەوەو هەواڵە مێژووییەکانیشیان کۆبکاتەوە، گەشتەکەی بۆ عێراق لە ئابی ساڵی ١٧٦١ دا دەستی پێکردو لە سەرەتای مانگی ئاداردا لە ڕێگای کەرکوکەوە گەیشتە هەولێر لەدوای ئەوەی کەلە شارەکانی ناوەڕاستی عێراقدا چوار مانگ مایەوە لەبارەی ئاڵتون کۆپرییەوە دەڵێت (شارێکە ژمارە یخانووەکانی لەنێوان ٤٠٠-٥٠٠ خانووەو دەکەوێتە سەر زێی بچوک و ئاهەنگگێڕانی جەژنم تیایدا بینی و زۆربەی دانیشتوانی کوردن:

بەڵام کویسنجەق کەبارەگای پاشای کوردانە (١٢) کاتژمێر لەباکووری ڕۆژهەڵاتی ئاڵتون کۆپرییەوە دوورە.

گوزتەپە (قوشتەپە) بەناوی گردێکی بچوکەوە ناونراوە بەناوی (خان عادیلە)وە ،والی بەغدا ئەحمەد پاشا فەرمانی دەرکرد بەهەڵکەندنی بیرێک تا وەکو ئەوانەی سەر دەدەن و گەشتیار وپۆستەچییەکان سوودی لێ وەربگرن، هەروەها عادیلە خاتون فەرمانی دەرکرد بە بنیاتنانی خانێک بۆ دابینکردنی حەوانەوەی گەشتیاران هەروەها پاشا فەرمانێکی دەرکرد بەسەربەستی چاندنی زەویوزارەکان تا وەکو ئەو ناوچەیە بووە گوندێکی گەورە.

لەرۆژی چواردەهەمدا و لەدوای پیادەڕۆیشتنی سێ مَیل و نیو گەیشتینە هەولێر کەشاری (ئەربلا) یەو میرنشینێکی گەورەیە و قەڵاکەی لەسەر گردێکی بەرز دروست کراوەو هیچ

پاشـماوەی ئاسـەواری تێـدانەمـاوە جگە لە پاشـماوەی مـزگـەوتێکی گـەورە کـەمنارەکـەی لەتەنیشـتـیـدایەو سـولتـان مـزەفـەر دروسـتی کردووە.

هەولێـر دەکـەوێتە سـەر هێـلّی پانی ٣٦ پلەو ١١ خـوولەک و سـەر بەویلایەتی بەغـدایە و حامـیـیـەیەکی لەهێـزی سـەربازی عـوسمـانی (ئینکیـشـاری) تێـدایە، بەلام ئەو زەوییـانەی تەنیـشـت شـاری هەولێـر ئاودێری ناکـرێن بەرووبار و جۆگـەلەکـان و چاندنی گـەنم تێـیـدا پشت بەباران دەبەستێتەوە.

لەدوای پیادە رۆیشتنی ٩ کاتژمێر گەیشتینە زێی گەورە

کـە لە شـاخـەکـانی هەکـاری کـە ناوچەیەکـە لەسنووری کـوردسـتــان، هەڵدەقـولێت، لە هەولێـریشــەوە بۆ زێ ناوچەیەکی کــەم دانیشتووانە. (٤)

گـەڕیدەی ئینگلیزی (ولیـەم هود) گـەشـتـێکی بۆ رۆژهەلات لەسـالّی ١٨١٧ دا ئەنجـام داو گـەشـتـەکـەی لە ژێر ناونیـشـانی (گـەشـتـێک لەکـەناری ملبارەوە بۆ قـۆسـتـەنتینیـە) لە چاپ دراوە و لە ماردین و نسیبین و موسلّەوە دەستی پێ کـردووە تا وەکـو گـەیشـتـۆتە هەولێـر، سـەبارەت بەهەولێـریش دەڵێت: (هەولێـر بەناو بانگە بەو شەڕەی کەبەناوەکەیەوە دەناسرێتەوە، هەر چەندە ئەو شـەڕە لەمـەودایەکی دوورتردا روویداوەو ناوبانـگـیـشی هەیە بەپەنابردنی دارابۆی لـەدوای تێـکشـکـانی، شـارێـکی گـەورەیەو ناوەنـدەکـەی قـەلایەکی دێرین دەیگرێتەوە و لەسەر گردێکی دەستکردە، پاشان هەولێرمان بەجێ هێشت بۆ دەشتاییەکی پان و بەرین تاوەکـو لەدوای پیـادە رۆیشـتـنی پێنج کـاتژمێـر گـەیشـتـینە زێی گـەورەو کـوردەکـان یارمەتییـان داین لەپەڕینەومان لە رروبارەکەدا، (٥) گـەشـتـەکـەی کلۆدیۆس جـیـمس ریچ بەگرنگترین ئەو جۆرە گەشتانە بۆ کوردستـان لەقەلّەم دەدرێت، چونکە لەزۆربەی شارەکانیدا سـوڕاوەتەوە و زۆری لەبارەیەوە نووسـیـوە، ئەمـەش لەسالّی (١٨٢٠) دا و ئەم گـەشتـە لە لەژێر ناونیشانی (گەشتەکەی ریچ بۆ عێراق) لەچاپ دراو بەهادین نوری بۆ زمـانی عـەرەبی وەریگێـڕاوەو لەم مـاوەی دواییـدا بۆ زمـانی کوردیش وەرگێڕدراوە.

ریچ سەری لەهەولێرداوەو لەبارەی گوزەران و ئاسـەوارو و مـێـژووی پێگەکـەی نووسـیـوێتی و دەڵێت:

(لەگـەڵ بەرەبەیانیـدا لە خـەو هەڵسـام و دەستـبەجێ دەسـتم بە کـارەکانم کـرد و بۆ منارە کـۆنەکـە رۆیشـتم کـەیەکـێکە لەدیمەنە سەرەکییـەکـانی شـارەکە، بەلام مزگـەوتەکـەی رووخـاوە، بەرزی منارەکـە (١٢١) و چێوەکـەی (٢١) پێـیـە و لەسـەر بنکـەیەکی هەشت پالّو دروست کـراوەو هەرلایەکی نۆ پێـیـە و لەسـەر شـێـوەی منارەکـەی داقـوق بنیـات نراوەو بۆ سـەردەمی خـەلیـفـەکـان دەگـەڕێتـەوە یان بۆ سەردەمی میرەکانی هەولێر ، کەلاوەو کۆمەڵە پاشـمـاوە دەوروبەریان گـرتبـوو، دیارە هەولێـر شـارێکی یەکـجـار فـراوانە و دەکـەوێتە بناری

گــردێکی دەســتکردو بازاڕ و خــان و یەک گەرماوی تێدایەو بەشێک لەشارەکە دەکەوێتە ســەر گــردەکــەو پێی دەگــوترێت قــەڵا و لەرۆژهەڵاتی شارەکەدا نزمایییەک بەناوی دۆڵی (چی کونم) ەوە هەیە و دەڵێن کەتەیمور لەنگ چادرەکەی تێدا هەڵداوە کاتێک کەشارەکەی گەمارۆدا پیاوێکی ئایینی لە هەولێرەوە ترسی لەناو سوپاکەیدا بڵاوکردەوە و سوپاکەیشی کەوتە لێک ترازان، هەر بۆیە لەو کاتەدا تەیمور لەنگ فارسی هاواری کرد (چی کونم)، دەستم بەکارەکەم کرد و بەژمارەیەک لەهەولێرییەکان گەمارۆ درا بووم کە بەشێوەی نیمچە بازنەیەک لەدوورەوە وەستابوون و سەبیلیان دەکێشا، بەڵام هیچ کامیان تەنگیان پێ هەڵنەچنیم کاتێک کەلەنزیک گردەکەوەی کە قەڵای هەولێری بە بەرزی (١٥٠) پێ لەسەرێتی، بەر لە ماوەیەکێش حاجی عەبدوڵڵا کاتێک خەریکی دروستکردنی باڵەخانەیەک بوو لەسەر گردەکەو کرێکارەکان گۆڕێکیان دۆزییەوە لەوانەیە بۆ یەکێک لەپاشا فرسییەکان بگەڕێتەوە، لەدەشتایی هەولێر کەروێشک و ئاسک و پۆلە قەتیی تێدا زۆر بەدی دەکرێت و کاتێک هەولێرمان بەجێ هێشت بەئاراستەی باکووری رۆژهەڵاتەوە رۆیشتین و پاش یەک کاتژمێر رۆیشتن گەیشتینە گوندی (رەشکێن)و زەوییەکانی بەباشی چێندرابوون، شاخەکانیشی لەم ناوچەیەدا بەلای رۆژهەڵاتدا لادەداو کەوانەیەک دروست دەکات، پاشان بەرەو رۆژئاوا بەئاراستەی زێی سەروو دەڕوات. هەڵبەتە دەمتوانی ئەو درێژکراوەی شاخەکانی شوان جودا بکەمەوە، بەڵام هێڵی دووەم لەگردەکانەوەیەو نەختێک بەرزەو زنجیرەیەکی دیکەی بەردین لەبەردەم زاگرۆسدایە کەچی گردەشێر لەناوەڕاستی رێگادایە بۆ زێ و لەدوای پیادە رۆیشتنی سێ کاتژمێر گەیشتینە (کەلەک) کە دەکەوێتە سەر کەناری زێیەکە، ئەو زێیە لەگەڵ خازردا لە گوندی (ئورەدەک) بەیەک دەگەن کە راستەخۆ لەخوار خاڵی بەیەکگەیشتنەکەدایە لەسەر کەناری رۆژاوای زێی سەروو ریچ گەیشتەکەی لەبەغداوە بۆ کفری و توزخورماتوو لەیلان و سلێمانی و شارەزوورو پێنجوێن دەست پێ ردو پاشان چووە ناو ئێران و دواتر گەڕایەوە بۆ عێراق و سەریدا لەئامێدی و رواندزو هەولێرو ئاڵتون کۆپری و شاخی مەقلوب و موسڵ ئینجا گەڕایەوە بەغداو سەری لە زۆربەی شارەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراقیش دا.

ریچ سەبارەت بە هەرچییەک کە دیبێتی لە زانیاری ئاسەوارو مێژوویی و سیاسی و ئابووری نووسیویتی، هەروەها لەبارەی هۆزەکانی کوردو عەرەب و سەبارەت بەناوچە ئێزدییەکانی نووسیوە. بەڵام مونشی بەغدایی گەشتەکەی لەساڵی ١٨٢٢دا بەفارسی نووسیوەتەوەو لەشارە کوردییەکاندا گەڕاوەو بەیەکێک لە هاوچەرخەکانی ریچ دەژمێردرێت، ناوبراو سەری لەشارەزوورو کەرکوک و ئاڵتون کۆپری و هەولێرو موسڵ و شوێنی دیکەش دا بوو، ئەو کەسەش کە بۆ زمانی عەرەبی

وەرگێڕاوەو پێشەکی بۆ نووسیوە مامۆستا عەباسی عەزاوی بوو، عەزاوی پشتی بەدەقێکی کتێبخانەکەی خۆی بەستووەوە لەساڵی ١٩٤٨دا لەبەغدا چاپی کرد.

سەبارەت بۆ کۆیسنجەق دەڵێت: (شارۆچکەیەکی خۆشەو چوار هەزار خانووی تێدایەو هۆزەکانی لەنێو هەولێرو کۆیەدا نیشتەجێن و توتن و گەنم دەچێنن) پاشان ڕێگای نێوان هەولێرو سلێمانی وەسف دەکات، سەبارەت بەئاڵتون کۆپری دەڵێت:

(شارۆچکەیەکی خۆشە بەئاوو هەواکەی و خانووەکانی نزیکەی سێ هەزار خانوو دەبن و رووبارێک لەهەریرەوە دێت و دەڕژێتە ناو دیجلەوە کە زێی بچوکە، بەڵام سەرچاوەکەی لەچیاکانی سەردەشتەوەیە، کەچی هەولێر ویلایەتێکی کۆنەو هەواڵەکانی لە (معجم البلدان)ی یاقوت ئەلحەمەویدا هەیەو ئاویشی لە کەندرەکانەوە دێت، لەقەڵاکەدا هەزار خانوو و لە دەرەوەی قەڵاکە چوار هەزار خانوو هەیەو زمانەکەیان کوردییەو مزگەوتێکی تێدایە هێشتا منارەکەی لەدەرەوەی شاردا ماوەتەوەو پلیکانی بۆ سەرکەوتنی و یەکێکی دی بۆ دابەزین هەیەو عەنکاوە دەکەوێتە دووری سێ فەرسەخ لەهەولێرەوە، بەڵام کەلەکی یاسین ئاغا لەسەر زێی گەورەیەو لەکەلەکەوە بۆ ئەو شوێنەی کە زێی دەڕژێتە دیجلەوە، گوندێک هەیە پێی دەگوترێت قەڵای زێ و ئاسەواری کۆنی تێدا هەیە.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

١- مشاهدات بريطاني عن العراق سنة ١٧٦٧ مطبعة الاسواق التجارية بغداد ١٩٦٢ ص١١٤.

٢- رحلة اوليـفـيـة الى العراق (١٧٩٤-١٧٩٦) ترجمة د. يوسف حبي، مطبعة المجمع العلمي العراقي ١٩٨٨، ص٦١.

٣- جيمس بكنغام، رحلة الي بلاد مابين النهرين، ترجمة محمد علي حلاوي بغداد ١٩٥٤ ص٨٥.

٤- رحلة نيپور الي العراق في القرن الثامن عشر. مطبعة دار الحرية بغداد ١٩٥٤ ص٦٩

٥- رحلة الي مابين النهرين في مطلع القرن التاسع عشر، ترجمة البيرابونا، مجلة بين النهرين عدد ٥ لسنة ١٩٧٤.

٦- رحلة ريج الي العراق عام ١٨٢٠ مطبعة السكك الحديدية بغداد ١٩٥١ ص٣٥٩.

٧- رحلة المنشي ء البغدادي. شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٤٨ ترجمة عباس العزاوي.



## مەلا سەعید ئاو ماڵی

# یەکێکە لەفەقێیە زیرەکەبەناوبانگەکانی مەلای گەورە

ئا: ئومێد ئاوماڵی

**یەکەم: کورتەیەک لەژیان و بەرهەمەکانی مەلای گەورە**

**هەر سەرەتای قبوڵکردنی ئیسلام لەلایەن کوردەوە، کوردستان پێگەیەکی گرنگی ئیسلامەتی بووە، بۆیە گەر چاوێک بەمێژووی گەلەکەماندا بگێڕین دەبینین سەدان سەرکردەو مەلای گەورەی لێ هەڵکەوتووە، کەشارەزایی لەرادەبەدەریان لەئایین هەبووەو لە جیهاندا ناوبانگیان دەرکردووە.**

---

گومان لەوەدا نییە کە (مەلای گەورەی کۆیی) یەکێک بووە لەریزی هەرە پێشەوەی زانایانی گەورەی کورد لە ئایینی ئیسلام لەکوردستان، ساڵی ١٨٧٥ ی زایینی بەرامبەر ١٢٩٣ ی کۆچی لەشاری کۆیە لە بنەماڵەیەکی ئایینیی گەورە چاوی هەڵهێناوە، بەدرێژایی ٣٠٠ ساڵ ئەو بنەماڵەیە لەشارۆچکەی کۆیە خەریکی بڵاوکردنەوەی زانست و خوێندەواری بوونە، بۆیەش حاجی قادری کۆیی لەنامەیەکیدا کەلە ئەستەمبوڵەوە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەی باوکی مەلای گەورەی ناردووە، دانی بە بەرزێتیی پلەو زانیاریی ئەو بنەماڵەیە داناوەو فەرموویەتی:

بەغەیری جەددی ئێوە کێ هەیە دانا
لەکوردستان بناغەی عیلمی دانا

هەروا رەزا شای ئێران ئەنگوسیلەیەکی بەنرخی پێشکەش بە جەنابی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە کردووە ورێز و پایەی تایبەتیی لای ئەو شایەی ئێران هەبووە.

مەلای گەورە ساڵی ١٩١٦ ی زایینی بووە ئەندامی ئەنجوومەنی ویلایەتی موسڵ ولای (سلێمان نەزیف پاشا) پایەیەکی بەرز وەردەگرێ ولەسەر داوای بەرێزی هەر لەو ساڵەدا قوتابخانەیەک بەناوی (رشدیە) بۆ یەکەم جار لەکۆیە دەکرێتەوە لەتەک مزگەوتەکەی(مزگەوتی گەورەی کۆیە)، لەساڵی١٩٢٤ بووبە ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراق(مجلس تاسیس العراق) و لەلایەن بنەماڵەی مەلیک بەهۆی ئەو پلەو پایە زانیارییەی هەیانبووە رێزی تایبەتیی لێگیراوە، مەلای گەورە شان بەشانی ئەو پلەوپایە ئایینیە بەهەموو توانایەکی داوای مافەکانی کوردی کردووەو چەندین یاداشتنامەی بۆ حکومەتی بەریتانیاو (عصبە الامم) بەرز کردۆتەوە لە

سالّی ١٩١٩ ولە١٩٢٠لە کات وساتی بەستنی پەیمانی سیڤەر سەبارەت بەچارەنووسی میللەتی کوردو تا ڕۆژی کۆچکردنی لەهەولێ بەرداوامدا بووە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مافانە.

مەلای گەورە لەژیانیدا (١٤) کتێبی بەنرخی ئایینی بەزمانی عەرەبی داناوەو،(٥) کتێبیشی بەزمانی کوردی بەچاپ گەیاندووە، یەکێکیان بەناوی(دیاری مەلا محەمەدی کۆیی) کەدیوانە شیعرییەکەیەتی وژمارەیەک شیعری نەتەوەیی و ڕۆشنفکریی تێدایە بۆ هۆشیارکردنەوەی میللەتەکەی.

دوای کۆچی دوایی باوکی(مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە) لەساڵی ١٣٢٦ک بەرامبەر ١٩٠٨ز مەلای گەورە نازناوی سەرۆکی زانایان(رئیس العلماء) لەکوردستان وەردەگرێ و پلەی گەیشتۆتە موجتەهید) هەروەک مەلا فەندیی هەولێر فەرموویەتی ٦٠٠ ساڵ دەبێت زانای وەک مەلای گەورە نەهاتۆتە دنیا.

دووەم: مەلا سەعید مەلا سلێمان ئاومالّی

لەسالّی ١٣٢٨ک بەرامبەر ١٩١٠ز لەگوندی ئاومالّی ڕۆژئاوای تەقتەق لەبنەماڵەیەکی ئایینی چاوی هەڵهێناوە، لەهۆزی شێخ بزەینی-یەو لەگەڵ وەهاب ئاغای توتەقەڵ وحەمەخانی شاخەپیسکە دایکیان خوشک بووە، دایکیشی خوشکی کێخوا حەسەنی بانە موردییە لەتیرەی شێخان کەدەچێتەوە سەر بابیلاغای گەورە(بابیل پاشا) کەوەک میری ئەمارەتێک بووەو لەکتێبی (شێخان وشێخان بەگی) بەدرێژی باسی دەکات.



«مەلای گەورە»

لەبەرئەوەی باوکی مەلایەکی ناودار بووە بۆیە هەر لەمنداڵییەوە مەلا سەعیدی کوری دەخاتە بەر خوێندنی ئایینی وماوەیەک لای خۆی دەخوێنێ، دواتر زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە بۆ خوێندن، ماوەیەک لەگەڵ بەڕێز(مەلا مستەفای بارزانی) لەیەک کات لەپردێ بەیەکەوە بوونە بۆ خوێندن، پاشان ڕووی کردۆتە شاری سلێمانی ولای جەنابی(مەلا عەبدوڵلای چروستانی) خوێندوویەتی، ماوەیەک لای (مەلا ئەحمەدی فرقان) بووەو، دواتر چۆتە شاری کۆیەو، لەبەر زیرەکی و لێهاتوویی لای مەلای گەورە ماوەتەوەو قۆناغەکانی خوێندنی مەلایەتیی لای جەنابی تەواو کردووە، تا لە ساڵی ١٩٣٤ ئیجازەی مەلایەتیی لەسەر دەستی ئەو وەرگرتووە، ڕۆژی وەرگرتنی ئیجازەکە مەلای گەورە ئاهەنگێکی ئایینی شایستە ساز دەکات ، زۆر لە مەلا ناودارەکان و لێپسراوانی دەوڵەت و خەڵکێکی دیکەش لە هەولێر و کۆیە دەعوەت دەکات.

* لەکتێبی (مەلای گەورە زاناو ئەدیب و شاعیر) لاپەڕە (٦) ناوی نۆ مەلای زانای ناوداری کورد هاتووە کەلەبەردەستی مەلای گەورە پێگەیشتوون و ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووە، مەلا سەعید ئاومالّی یەکێکە لەو زانایانەو ناوی لەریزی پێشەوەی مەلا

ناودارەکان هاتووە.
هەروەک مــــەلای زاناتان بۆ بەجێ دەهێلّم کە ئەمانەن: (مەلا سەعــیــدی ئاومــالّی و مــەلا ئەبوبەکـری دوگـردکـانی و مــەلا قــادری کــانی دەربەندی). ئەم قسەیە لەناو مەلایاندا مەشهورە.

زیرەکــیـی ئەو سێ مـــەلایە لەرادەبەدەر بوو لەدوای مـــەلای گـەورە، زۆربەی فـەقـێـیـەکـان لەشوێنە جیاجیاکانەوە روویان



مەلا سەعید ئاو مالّی

نامەیەکی بەفارسی بۆ نوسیبوو، کــەتیــایدا مــوحــیــبــەت و خۆشەویستی بووە.
سێیەم: فەقێیە بەناوبانگەکانی
ئەو فـــەقێ بەناوبانـگانەی زۆربەی قۆناغـەکانی خویندنیان لای مەلا سەعید تەواو کردووە ئەمانەن:
لەکـتـێبی (هەولێرم وا دیوەو بیـسـتـوە) لەلاپەڕە ٨٩ باس لە (مــەلا عــەبدوڵلای فــەرهادی) دەکــات کــە مــەلایەکی ناوداری

کردۆتە حوجرەی ئەو سێ زانایە بۆ تەواوکردنی خوێندنی ئایینی و وەرگرتنی ئیجازە.
* لەکـتـێبی (علمـاء و مـدارس اربیل) کـە بەعــرەبیــە لەلاپەڕە (١٢٢) بەندی (١٤)دا هاتووە: ( ملا سعید اومالی، اومال قریە تابعە لقضـاء کویسنجق و کان مدرسا مشـهورا فی قریە (بەردەسپی) التـابعە لقضاء کویسنجق)، ئەو کتێبە لەنووسینی خوالێخۆشبوو مامۆستا (زوبیر بیلال ئیسماعیل)ە.
* مەلا سەعید ئاومالّی دۆستـایەتیی لەگەڵ شێخ مـسـتـەفـای نەقـشـبـەندی هەولێـر بەهێـز بووەو، (شــێـخ) لە ســالّی ١٩٥٧ لەگــوندی قـەشـقـە سەردانی کردووەو، چەند رۆژێک لای مــاوەتەوە، چەند جــارێکی دیکەش پێش ئەوە ســەری لێــداوە، ئەویش ســەردانی شـێــخی کردووە.
* هەروەها لەگـەڵ (مـەلا مـەجـیـدی قـوتب) لەکـەرکـوک کـەبەمـوفـتی کـەرکـوک دادەنرا دۆستـایەتییـان بەهێزبووە، مـەلا مـەجید چەند

شاری هەولێرە، تیایدا هاتووە:
(لەقوتابخانەی جەنابی مەلا سەعید ئاومالّی لەکـۆیە زۆربەی قـۆناغـەکـانی خـوێندووەو لای بەرێزی خوێندنی تەواو کردووە).
هەروەها مـــەلای پایەبەرزو ناوداری هەولێــر (مەلا شێخ عەبدوڵلای گردەسۆری) کە ئێـسـتـا بەمـوفـتـیی هەولێـر دادەنرێ قـۆناغی خـوێندنی (کـــتـــێـبی جـامی) ی لای ئەو تەواوکــردووە. مەلای پایەبەرزی هەولێر (مەلا سەید محەمەدی پیرداود) کە ئێـستـا ئیمام و خەتیبی مزگەوتی فـورقـــانە لەگـەڕەکی (حی العــدل) لەهەولێـر، زۆربەی قــۆناغــەکــانی خــوێندنی مــەلایەتیی لەحوجرەکەی مەلا سەعـید لەگوندی بەردەسپی تەواو کردووە.
مـەلای ناودارو بەناوبانـگ (مـەلا مـەجـیـدی شـەقـڵاوە)، ئەو بەرێزەش لەقـوتابخـانەی مـەلا سەعیدی خوێندووە.
هەروا بەرێزان (مەلا حـەمـیـدی ئیـسـمـاعـیل دیبەگەیی) و خوالێخشبووان (مەلا عەبدوڵلای

نەبیاوە) و (مەلا عوسمانی نۆغەرانی) کە هەرسێکیان دەرچووی کۆلیجی شەریعەتی زانکۆی ئەزهەرن زۆربەی قۆناغەکانی فەقێیەتییان لەحوجرەکەی مەلا سەعید تەواوکردووە لەگوندی (بەردەسپی و بانەمورد و قەشقە).

هەروەها خولێخۆشبووان مەلا ناودارەکانی وەک (محەمەدی ئومەرگومەت و مەلا شێخ محەمەدی بانەموردی و مەلا مستەفای بانەموردی و مەلا ئەحمەدی مەنتک ومەلا محەمەدی مەلا قادر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیوکراتی کوردستان ومەلا تەلعەتی مەنتک سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی زانایانی ئاینی کوردستان ومەلاعوسمان حاجی حوسێن عالڵایی ئەندامی لقی هەولێری یەکێتی زانایان ومەلا محەمەدی ئاومالّی برای ئەندامی لقی هەولێری یەکێتی زانایان ومەلا ئەحمەدی سێگردکان ومەلا حەمیدی ئامۆزای ومەلا حەمیدی ئازیانەو مەلا تۆفیقی مەنتک ومەلا عەبدوڵڵای سێکانی ومەلا سەید محەمەدی سێکانی ومەلا سەید حوسێنی دیبەگەیی مەلا حەمەدەمین دەربەندی سیان ومەلا عوسمان چۆمەزەردەڵەیی ومەلا رەزای مەنتک ومەلا خدری ئۆمەر گومەت ومەلا سەید کەریمی جلبەسەرو مەلا کەریمی سێگردکان ومەلا عەبدولرەحمانی سێگردکان ومەلا تاهیری خورخوری ومەلا جەعفەری مەنتک ومەلا ئیبراهیمی بێراوە... ئەمانە هەموویان لەحوجرەکەی مەلا سەعیدی ئاومالّی قۆناغەکانی خوێندنیان تەواوکردووە.

وەک دەگێرنەوە مەلا سەعید(فەرائض)و(مەنطق) وزۆربەی ماددەکانی دیکەی لەبەر بووەو شێوەی دەرسوتنەوەی بەهێز بووە، جا هەروەک یەکێک لە فەقێیەکانی بەناوی(مەلا سەید محەمەد سێکانی) دەڵێ من لای مەلای ناودارم خوێندووە لەهەولێرو کەرکوک، بەڵام هیچیان وەک جەنابی مەلا سەعیدی ئاومالّی لەماددەکانی (نحو صرف وفرائض ومنطق) وئەوانی دیکە نەیان توانیوە فەقێ تێبگەیەنن وحاڵیبیان بکەن.

جگە لەمانە بەدەیان مەلای دیکە لایان خوێندووە، بەڵام تەنیا ئاماژەمان بەهەندێکیان کرد.

چواردم: درێژترین ماوەی مەلایەتیی لەگوندی قەشقە بووە، نزیکەی ٣٠ ساڵ لەو گوندە(ئیمام وخەتیب ومودەریس) بووە، گوندی قەشقە بەهۆی ئەو زانایە ناوبانگی بڵاوبۆتەوە، ژمارەیەکی زۆری فەقێ و موستەعید روویان کردۆتە ئەو گوندە، نزیکەی(٥٠ساڵ) خزمەتی عیلم وزانیاری وزانست وئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە لەهەموو بوارێکەوە، تا رۆژی ٩/٤/١٩٨٠ لەگەرەکی کۆماری لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کرد.

پێنجەم: مەلا سلێمانی ئاومالّی-ی باوکی

مەلایەکی پایە بەرزو بەناوبانگ بوو لەناوچەی کۆیە، زۆر خواپەرست وبەتەقوا بووە، کەم کەس توانیویەتی لەخواپەرستی خۆی لەقەرەی بدات،خەلیفەی شێخ حەسەنی قەرەچێوان بووەو زۆر لای شێخ خۆشەویست و بەرێز بووە، شێخ بریاری دابوو پێش مردنی بە ماوەیەک سەردانی بکات لەگوندی (ئاومالّ)،

بەڵام پێش ئەوەی سەردانەکەی ئەنجام بدات کۆچی دوایی کرد، زۆربەی ژیانی لەمزگەوت بەسەر بردووەو، جارێکیان ماوەی چل ڕۆژ لەناو ئەشکەوتێک دوور لەئاوەدانی و لەزەتی دنیا خواپەرستی کردووە، هەروەک خوالێخشبوو مەلا مەجیدی شەقڵاوە لەساڵی ١٩٨٥ فەرموویەتی مەلا سلێمانی ئاومالی بێ گومان وەلییەکی موبارەک و گەورەبووە.

مەلا سلێمان پتر لە ٤٠ ساڵ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە لەناوچەی کۆیە چ لەرووی ئاینیەوەو چ لەرووی دژایەتیی زوڵم و زۆرداری لەناوچەکە.

شەشەم: مەلا سلێمانی گەورە - باپیرە گەورەی مەلا سەعیدی ئاومالی

بۆ خوێندن رووی کردۆتە کوردستانی ئێران و دوایی گەڕاوەتەوە ناوچەی کۆیە، مەلایەکی زیرەک و پایەبەرزو بەتوانا بووە، لەگەڵ ئەوانەشدا تابلێیی مەلایەکی بە تەقواو زاهید بووە، دەڵێن وەلییەکی گەورەش بووەو خاوەن کەرامەت بووە، لەگوندی ئاومالّ و سارتک و هەندێ ناوچەی دیکەی دەشتی کۆیە مەلایەتیی کردووەو، لەگوندی سارتک کۆچی دوایی کردووە.

حەوتەم: مەلا سەعید ئاومالی لەپاش خۆی سێ کورو برایەکی لەگەڵ هەندێک خزم و کەسوکاری بەجێ هێشتووەکە ئەمانەن:

١- عەبدوڵلا مەلا سەعید لە دایکبووی ١٩٣٦، مامۆستا لە هەولێر.

٢- عەبدولڕەحمان مەلا سەعید لە دایکبووی ١٩٥٠، مامۆستای مورشیدە لەکۆگای سەرەتایی لەهەولێر.

٣- ماجید سەعید لەدایکبووی ١٩٦٥، مامۆستای کۆمەڵناسیە لە دیراساتی ئیسلامی لە هەولێر.

٤- مەلا محەمەد ئاومالی (برای): ١٩٣٤ ئێستا ئیمام و خەتیبە و ئەندامی لقی هەولێری یەکێتی زانایانی ئاینیە.

٥- مەلا حەمیدی ئاومالی (ئامۆزای) ١٩٣٩ ئێستا مەلایە لەشاری هەولێر.

هەر ئەو بنەماڵەیە زەوییەکی کشتوکاڵییان هەیە لەباپیرانەوە بۆ نەوەکانیان بەجێ ماوە لە گوندی ئاومالّ، کەزۆربەیان لەو گوندە خەریکی کشتوکاڵن، ئەوانی دیکە لەهەولێرو کۆیە و هەندێ شوێنی دیکە لەپارێزگای هەولێر نیشتەجێن.

تا ئەمڕۆش ئەو بنەماڵەیەلەسەر ڕێوشوێنی باب و باپیرانیان وەک بنەماڵەیەکی ئایینی لەلایەن خەڵکی ناوچەکە بەڕێزو تەقدیرەوە تەماشا دەکرێن.

هەشتەم: ئەو زانیاریانە لەم سەرچاوانە وەرگیراون.

١- کتێبی (دیاری مەلا محەمەدی کۆیی).

٢- کتێبی (مەلای گەورە زاناو و ئەدیب و شاعیر).

٣- کتێبی (علماء و مدارس اربیل).

٤- کتێبی (هەولێرم وا دیوەو بیستوە).

٥- ڕۆژنامەی هاموون ژمارە ٢٧/١١/٢٠٠٠

٦- لەزاری هەندێ زاناو ناودارو چەند سەرچاوەیەکی دیکە و دووحەجی ئەنجام داوە حەجی یەکەم لەساڵی ١٩٥٢ و دووەم لە ١٩٦٢.

# شاعیری دەشتی هەولێر
# موخلیس ١٩١٠ - ١٩٨٥



* جەلال سنجاوی

هەموو ساڵان لەبەهاران، لەگەرمەی پشکوتنی گوڵان و لەدارژانی تەزرەو باران، لەلافاوی کەندو جۆمان، لەتەقینی کانییان، لەپڕبوونی هەرکەوان، لەم بەرو لەو بەری قەرەچووغی بامەندو بلباسان، تاچاو بڕەکا دەغومرێ دەشت لەبەر رەشماڵ و مێگەلەمەڕو بزن و بەرخۆڵەو کارۆکان، کەدەگرنەوە - دەوروبەری رەشماڵ و چیغان ، لەبەر دەست و بازنێ شەنگەبێریان کەبەرامبەر شوانان، جامان لێوڕێژ دەکەن لەشیران.

بەهارانی جارانی دەشتی «کەندیناوەو قەراج» وەکو ئێستا نەبوو، خاوەن مەڕو ماڵات ئاودیو دەبوون لەچیای قەرەچووغ بەهەردوو رێگەی «بازارگە» و «قەرەبۆتکان» (١) و رەشماڵیان هەڵدەدا لەدەشتی قەراج لە دەوروبەری گۆمەکانی:-

(قورینگان، مارواشان، بازنان، سێ قولینچک، گردەشێر، برند، خەندەکی بابەخەلیفەی، عەداوێ، گەرحەوفارە، گردی لەنگەریان، بستی نۆجەیێ ...) تاکۆتایی بەهار لەوێ دەمانەوە.

هەروەکو ئەوان ساڵێک لەساڵان (فەقێ رەسولی سنجاوی) لەگوندی شۆڕەزەرتکەی کەندیناوەدا مەڕو ماڵانی دەباتە دەشتی قەراج و هەرلەم بەهارە خۆشەدا شاعیرمان (مەلا خەلیل موخلیس) لەدایک دەبێ، واتە لەساڵی ١٩١٠ی زاینی بەرامبەر بە ١٣٢٩ی کۆچی:-

**هەروەکو ئەوان ساڵێک لەساڵان**
**باوکم ماڵ دەباو دەچتە رەشماڵان**
**بووارخۆش بووە، لەو بووارەدا**
**منی دەرخست خوا، لەم هەوارەدا**
**مێژووی هیجری لەو دەم وای دەگۆ**
**هەزارو سێ سەد بەرلەبیست و نۆ**

ئەم کەلە شاعیرەی دەشتی هەولێر کەلەهەمان کاتدا مەلاو زانایەکی پایەبەرز بوو ناوی (حاجی مەلا خەلیل کوڕی فەقێ رەسول کوڕی حاجی مستەفایە) و لەخێڵی گەورەی سنجاوییە، بەڵام بەداخەوە کەتەمەنی دەگاتە (پێنج - شەش) مانگان باوکی کۆچی دوایی دەکات و دەبێتە

تاقانەی دایکی.
کەچی دایکی دڵسۆزانە بەخێوی دەکات و مامیشی (مەلا ئەبوبەکر) لەبەر خوێندنی دادەنێ و لەحوجرەدا لای زاناو عارفە مەزنەکانی دەشتی هەولێر (موخلیس) دەست بەخوێندن دەکات:-

**خۆم تەوانەدا زۆر بەدەستوبرد**
**گەرچی هەژاربووم خوێندنم دەکرد**

سەرەتای خوێندنی لای (مەلا ئەبوبەکری حاجی مستەفا)مامی دەست پێکرد، پاشان لەخزمەت زۆربەی زانا بەرزەکان خوێندوویەتی وەک (مەلا رەشیدی موکریانی، مەلا قادری سوریژەیی، مەلا محەمەدەمینی سوێری، مەلا شیخ جەلالی بەرزنجی، مەلا ئەحمەدی رەش ...) تالەساڵی ١٩٤٣ - ١٩٤٤ ئیجازەی مەلایەتی لەلای مامۆستا مەلا سالحی کۆزەپانکەیی وەرگرتووە لەمزگەوتی تەکیەی شیخ نورەدین لەهەولێر، ئینجا گەڕاوەتەوە گوندی (دووسەرە)(٢)ی فەتاح ئاغاو بۆتە مەلاو مودەریس لەمزگەوتی ئەم گوندە.

(موخلیس) مەلایەکی شەریعەتناس و زۆرزان و قسەخۆش بوو، بەماوەیەکی کەم شۆرەتی لەتەواوی دەشتی هەولێر دەرکردو ناوبانگی گەیشتە دەشتی کۆیەو خۆشناوەتی و باڵەکایەتی، بۆیە حوجرەی مزگەوتەکەی پڕی فەقێ بوو لە سەرانسەری کوردستان، بەتایبەتی پارێزگای هەولێر.

*** موخلیس و شیعر**

جوانی و دڵڕفێنی کوردستان بەگشتی و دەشتی هەولێر بەتایبەتی هەوێنی شیعری لەدڵ و دەروونی موخلیس موتوربەکردو بەجیهانی فراوانی شیعری ناساند، بۆیە چەندان چامەی بەپێزی دانا کەدەستاو دەست لەنێوان فەقێیەکان و لەحوجرەی مزگەوتەکان بڵاودەبۆوەو پاشان ئەزبەریان دەکرد، بەتایبەتی چامەی (شەنگەبێری و بواری دەشتی قەراج و هەیهو هەیهو و وڵات هەی وڵات .... تاد) بەڵام بەداخەوە (موخلیس) خۆی حەزی لە شۆرەت و ناوبانگی گەورە نەدەکرد، بۆیە شیعرەکانی زۆر لە رۆژنامەو لەگۆڤارە کوردییەکاندا بڵاودەکردەوە.

پاش ئەوەی دکتۆر عەبدوڵلا نەقشبەندی (هەرشەمی) (٣) چامەی (وڵات هەی وڵات) ی موخلیسی بڵاوکردەوە لە ژمارە ٩١٠ی بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٣، ئیتر بوو بەمەراقم لەنزیکەوە ئەم کەلە شاعیرە بناسم و دیانەیەکی لەگەڵدا بکەم، ئەوەبوو لەهاوینی ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ هاوڕێم مامۆستا مستەفا محەمەد هەمەوەند، خۆمان گەیاندە گوندی (دووسەرە)و لەحوجرەی مزگەوتدا چاوانم بەدیتنی جەنابی حاجی مەلاخەلیل موخلیس رۆشن بۆوەو لەم دیانەدا پێی گوتم: کە تەمەنی (٢٠) ساڵان بوو شیعری رێکی داناوە، واتە لەساڵی ١٩٣٠ز. هەروا گوتی: ئەو شاعیرە کوردانەی کەبەدڵمەو کاریان کردۆتە سەر شیعرەکانم (نالی و بێخودو حەمدی و حەزین)ن.

ئەم شاعیرە بەرزە لەسەرەتادا نازناوی (وافی) (٤) بۆخۆی هەڵبژاردووە تاکو ساڵی ١٩٤٤ز کەهاتۆتە ژێر باڵی تەریقەتی نەقشبەندی و شێخ مستەفای کردووە بەڕابەری خۆی، نازناوی لە (وافی)یەوە گۆڕیوە بۆ (موخلیس) (٥) مامۆستا موخلیس زۆربەی ژیانی خۆی لە(گوندی دووسەرە) بردۆتە سەر تاکو ساڵی ١٩٧٥ ئیتر بەتەواوی ئەم گوندەی بەجێ هێشت و رووی

،خانەقای شێخ مستەفا کرد لە شەقڵاوەو بوو بە سۆفی گۆشەگیرو زاهیدێکی خواپەرست تاکو ەهۆی نەخۆشیەکی کوشندە لەشەوی چوارشەممەی ێکەوتی ١٩٨٥/٦/٥ لەنەخۆشخانەی رزگاری کۆچی دوایی کردو لەسەر وەسیەتی خۆی لەگۆڕستانی پیرداوود لەتەنیشت هاوڕێی دڵسۆزی فەتاح ئاغای دووسەرە تەسلیم بەخاک کرا.

«موخلیس» شاکارێکی مەزنی بەناوی (باغی لاوان) لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە کەپڕیەتی لەسەدان دێڕ شیعری تەڕو پاراو و هەرهەمووی بەخەتێکی نایابی شێوە فارسی و لەدەفتەری جیا لەقەبارەو لاپەڕە بەخەتی خودی شاعیر نووسراونەتەوە.

حاڵی حازر دەستنووسی شیعرەکانی (موخلیس) لای ئەم زاتانەن:

١- دەستنووسی مامۆستا ئەحمەد رەشوانی.

٢- دەستنووسی بەڕێز خالید دووسەرەیی.

٣- دەستنووسی مەلا تاهیر کەندارەقەلی.

٤- دەستنووسی مامۆستا محەمەد خەلیل موخلیس.

لەتەموزی ساڵی ١٩٨٩ بەڕێز د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان بڕوانامەی ماستەری لەشیعرەکانی (موخلیس) وەرگرت بەناوی (دیوانی موخلیس - باغی لاوان) هەروەکو خۆی دەڵێ (خۆم زۆر بەبەختیار دەزانم کەیەکەم قوتابی کوردم توانیبێتم لەناو وڵاتدا لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی دیوانی شاعیرێکی قەڵەندەری کورد بکەمە نامەی ماجستێرو لەناو دەریای گوم بووندا رزگاری بکەم).

لەساڵی ١٩٤٤ غەزەلێکی موخلیس لەژمارە (٥) لەلاپەڕە (٣٨)ی گۆڤاری گەلاوێژ بڵاوکراوەتەوە.

لەساڵی ١٩٤٠ بەهەشتی گیوی موکریانی نامەیەک بۆ مەلا خەلیل موخلیس دەنووسێ و دەڵێ (جەنابی مەلا خەلیل لطفا، ئێوە چ کارەن؟ وەلەکوێ دادەنیشن؟ ئەگەر شیعری وەتەنیتان هەیە بۆمانی رەوانە بفەرموون).

ئەونامەیەو وەڵامەکەی (موخلیس) لەبەهاری ساڵی ١٩٨٥ لەبەڕێز د. کوردستان گیوی موکریانیم وەرگرت و ئێستاش لەئەرشیفی گیوموکریانی پارێزراوە.

هەروا لەژمارە (٧١)ی گۆڤاری هەتاو ٣١ی ئاب ٩٥٦ پێنج خشتەکیەکی (موخلیس و حەزین) (٦) بڵاوکراوتەوە.

وێڕای ئەمانەش بەڕێزان (عەلی فەتاح دزەیی، (٧) خالید جوتیار، سۆران مەحوی، مەحموود زامدار، جەلال سنجاوی) زۆر بایەخیان بە بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی موخلیس داوەو پتر بە رۆشنبیرانیان ناساندووە.

(موخلیس) جگە لەدیوانە شیعرەکەی، چەندان بەرهەمی دیکەی لەدوای خۆیدا بەجێ هێشتووە کەجگە لەمەولوود نامەکەی کەساڵی (١٩٦٨ لەچاپخانەی هەولێر لەلایەن بەهەشتی گیوی موکریانی) چاپ کراوە، ئەوانی دیکە هەمووی دەستخەتن.

بەرهەمەکان بەگوێرەی زمانی نووسینەوەیان دەکرێن بەدووبەش:

أ- بەرهەمە کوردییەکان

١- مەولوود نامەی کوردی.

٢- دیوانی موخلیس (باغی لاوان)

٣- هیجرەت نامەی کوردی.

٤- دین و دنیا بۆگەلی وریا.
٥- ئاینی ئیسلام ئەوەیە.
٦- کاکڵەی عەقیدەی کوردی.
ب - بەرهەمە عەرەبییەکان:-
١- مأثر الابرار والاخبار و مقالاتهم.
٢- موائد الفوائد.
٣- مجمع العقائد.
٤- القطف النظيف بشرح التصريف.
٥- شرح کتاب شرح الفيه بن مالک.

هەروەها حاشیەی بۆ چەند کیتابێک داناوە بە زمانی عارەبی کەزۆربەیان ڕێزمان و ڕەوانبێژین، هەروەک ئاماژەمان پێیدا، موخلیس پاش ئەوەی خوێندنی مەلایەتی تەواوکردو ئیجازەی وەرگرت، ئیتر کەوتە جیهانی سۆفیگەرییەوەو شیعرەکانی زۆربەیان ڕووەو عەشقی خواوەند ڕێچکەیان گرت، چونکە ئەو لەڕوانگەی زاهیرەوە سەری ئەو عەشقە پیرۆزەی نەدەکرد، بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو جیهانی باتین ڕوو دەچوو کەجیهانی گیان و غەیبە، کێ لەفەلسەفەی گڕی عەشق تێدەگات سۆفی نەبێ، کێ لەنهێنی سووتانی پەروانە دەگات، مۆم نەبێ، تەنیا عاشق لەزمانی عەشق تێدەگا، چ نهێنییەک بوو مەجنونی عامری کردە گەریدەی بیابان و لە پێناو لەیلای کچە ڕەشتاڵەی دەشتەکی بەرد باران کرا، فەرهاد تادوا هەناسەی ژیانی لەپێناو عەشقی شیرین لەشاخی (بێستون)کوڵنگی لەشاخ وەشتاند، دێوانە بۆ شەم شێت و هاربوو، شێخی سەنعان پێنج سەد موریدی بەجێ هێشت و بوو بەگاور، بەڵام عیشقی پیرۆزی ئیلاهی وای لەموخلیس کرد لەحوجرەی مزگەوتەوە ڕووی لەتەکیەو خانەقای شێخ کردو تارۆژی مردنی دەردی عەشقی سارێژنەبوو:-

**دەردی عیشقم نابێ سەرڕێژ هەر دەمە ئەمکا نەساغ**
**دارەمەیتی هەڵ ببەستن بم بەنە لای ڕوو چراغ**
**ئەی ڕەفیقان بێنە لامان شیعرو بەستەم بۆ بڵێن**
**بانگ کەنە دیدە غەزالان بمگرن دەورو قەراغ**
**شین لەدەورم دابەستن بۆم بگرێن دەن لەخۆ**
**دلبەرم جارجار بڵێ ئۆف لاوەکەی دڵ پڕ لەداغ**
**گەرچی واکوشتمی بەناحەق گەربدا وەعدەی ویساڵ**
**نامەوێ غیلمان و حۆری بۆچیمە گوڵزارو باغ**
**قەبرەکەم سەر ڕێ بێ مەئوای بابڵند بێ بەڵکو یار**
**بێ بەلامانا گوزەرکاو بای وەتەن پڕکا دەماغ**
**(موخلیسی) دڵ پڕ لەغەم چ بکا لەدەست دەردو ئەلەم**
**دەردی عیشقم نابێ سەرڕێژ هەردەمە ئەمکا نەساغ**

* * *

**پەراوێزەکان:-**

١- بازارگە: دەربەندێکە دەکەوێتە ڕۆژئاوای چیای قەرەچووغ، کاتی خۆی مەرداران لەم ڕێگایە ئاودیو دەبوون بۆ مەخموورو دەشتی قەراج، ئێستاش ڕێگای سەرەکی قیرتاوکراوی هەولێر - مەخموور بەم دەربەندە تێدەپەڕێ.

قەرەبۆتک و قەرەبێتکان: دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی قەرەچووغ و دووقەبری لێیە گوایە کاتی خۆی ئەمانە خوشک و برابووینەو لەوێ کوژراون، ئەم ڕێگایەش بۆ دەشتی قەراج ئاودیو دەبێ و بەخێراتی شیخ محێدین تێدەپەڕێ.

٢- دووسەرە:- گوندێکە ١٢کم لەباشووری هەولێر دوورەو دەکەوێتە نزیک گوندەکانی: پیرداوود، سورێژە.

٣- هەرشەمی: نازناوی دکتۆر عەبدوڵلا مستەفا نەقشبەندییە، هەرشەم گوندێکە لە (داری سەکران) سەربەقەزای شەقڵاوە، هەرشەم

واتە (هەرشەو - بەردەوام شەو) چونکە ئەم گوندە زۆر دارو دارستانی لێ هەبووەو سێبەری زۆربووە، بۆیە بەهەرشەو بەناوبانگە.

٤- وافی: نازناوی مەلاخەلیل بووە تاکو ساڵی ١٩٤٤ کردویە بە موخلیس هەروەها نازناوی مەلا تەهای مام قلنجییەو لەساڵی ١٩٠٩ز لەدایک بووەو شیعری بەزمانی کوردی و عارەبی و تورکی و فارسی هەیەو ئێستاش مەلای مزگەوتی مەلا (جامی)یە لەکۆیە.

٥- موخلیس: جگە لەمەلاخەلیل موخلیس ئەم شاعیرانەش نازناویان موخلیس بووە:

أ- ئەحمەد موخلیس ناڵبەند لەساڵی ١٨٩٠ - ١٨٩١ لەبامەڕنی لەدایک بووەو لەساڵی ١٩٦٣ بەدەستی خۆی بەچەقۆ خۆی کوشتووە.

ب- مەلا فەیزوڵڵای شافیعی سەقزی نازناو بە (موخلیس) خەڵکی کوردستانی ئێرانەو ماوەیەک لەسلێمانی ژیاوە.

ج - شێخ مستەفای کوڕی شێخ عەبدولسەمەدی قازی نازناوی موخلیس هەبووە، لەشاری سلێمانی لەدایک بووەو هەرلەوێش ژیاوە.

د- نازناوی حاجی مەلا رەسولی دێلێژەییش (موخلیس) بووە لەساڵی ١٨٣٩ لەدایک بووەو لە ١٩٢٩ مردووە.

٦- حەزین: نازناوی مەلا محەمەدەمینی سوێرییە لەگوندی سوێری سەربە ناحیەی گوێر لەساڵی ١٩٠٥ لەدایک بووەو لەخزمەتی مەلا ئەفەندی باداوەی لە ١٩٤٢ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو لەساڵی ١٩٦٣ لەناحیەی (دبس) مردووە.

٧- عەلی فەتاح دزەیی: کوڕی فەتاح ئاغای دووسەرەیە، لەساڵی ١٩٢٩ لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٤٦ دەستی بەشیعرنووسین کردووەو خاوەنی دیوانی خرۆشان و رامانە، لە ١٩٥٣ بۆ تەواوکردنی حقوق چووەتە شاری (دیمەشق) دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ گەڕاوەتەوە کوردستان و لە ١٩٩٢ بەنەخۆشی شێرپەنجەی قوڕگ کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:


١- دیوانی موخلیس - باغی لاوان - نامەی ماجستێری بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەد شوان - زانکۆی سەلاحەدین ١٩٨٩.

٢- خرۆشان و رامان - دیوانی شیعر - ١٩٨٧ - عەلی فەتاح دزەیی.

٣- دیوانە دەستخەتەکەی مامۆستا موخلیس - کەلەلایەن بەڕێز مامۆستا مەلا تاهیری کەندارەقەلی پارێزراوە.

٤- مامۆستا مەلا خەلیل موخلیس وەڵامی چوار پرسیار دەداتەوە، دیمانەی : جەلال سنجاوی - رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٢٣٢) لە ٣٠ ئاب ١٩٧٤.

# کردنەوەی پەنجەرەیەک لەبەردەم کۆڵانێک و شەقامێکی هەولێردا



ڕۆستەم باجەلان

**حەمەشێت**

حەمەشێت، لەسەر شۆستەی شەقامێکا دانیشتبوو، ڕووی خۆی کردبووە ئەو منداڵەی ڕێگای دەبڕی و سەرماو سۆڵی ئەم زستانە شوومەش تەنکی پێ هەڵچنی بوو، منداڵەکە لە ڕووخساری حەمەوە دیمەنی چەند پاڵەوانێکی ناو کتێبی مێژووی ژێر هەنگڵی خۆی دەبینی، ئەویش لەڕووخساری ئەوەوە منداڵەکانی سەردەمی دەبینی، بۆیە لەبەر خۆیەوە وتی:

- سەرماو سۆڵی ئەمڕۆ لەگڕی دۆزەخی سبەی سەختترە... کە منداڵەکە گەورە بوو، بەهۆی ئەم قسانەی حەمەوە بوو بەڕۆماننوسێکی ناسراو، ئەویش بەهۆی سەرماوە مرد. ١٩٨٦

**دەروێش عەلی**

ساڵ،

کۆتایی پەنجاکانە،

ئەم ئێواربەش منداڵ و پشیلە خرپنەکان لەنزیک دەروازەی- نادیی خەلیلەفەندی- یەوە چاوەڕوانی -دەروێش عەلی-یان دەکرد، بەخۆی و سەتڵە بچکۆڵە پڕ لە پارچە گۆشتەکەیەوە لەم کەرخە پەیدا بێ... لەهێکڕا، سیمای دەروێش وەدەرکەوت، پشیلەکان لەهەموو لایەکەوە دەوریان دا، ئەویش هەر جارەی پارچە گۆشتێکی لەسەتڵەکە دەردەهێنا، دەیهاویشتە بەر دەمیانەوە... منی منداڵ ئەو حەل سەرم لەم کارە بێ بەرامبەرییە سوڕمابوو، نەمدەزانی ئەم مەتەڵە ئاڵۆزە هەڵبدەم... بەڵام ئەمڕۆ بۆم ڕوونبووەوە-دەروێش عەلی- بەدووای بەڕائەتەوە دەگەڕا، ئەم وشەیەی لەناو دونیای پشیلە ئاوارەکاندا دەدۆزییەوە.

**محەمەد سیامەنسوری**

(١)

کە دەهاتە پۆلەوە... منداڵان هەستیان بەدڵنیایی و خۆشی دەکرد، ئەویش لەسەر تەختەرەشەکە هەرجارەی وێنەیەکی ڕەنگینی بەتەباشیر بۆ دەکردن و چەند زانیارییەکی هونەریی سەبارەت بە وێنەکانەوە دەدانێ...

(٢)

کە دواجار هاتە ژوورەوە، وێنەی غەوارەیەکی کردو لە دواییشدا ئاختێکی ساردی لەجێوە هەڵکێشا، لەو ڕۆژەوە ئەم هونەرمەندە قۆزو قسە هەنگونییە ڕووی لە منداڵانی پۆلەکە وەرگێڕاو جارێکی تر نەگەڕاوە لایان.

**پیرەژنە ونبووەکە**

(١)

ئەمڕۆ وەکو دوێنێ، وەکو... بارگەکەی لەپشتی خۆی هەڵداو کەوتەوە ناو شار... منداڵانی خۆش دەوێ، بەڵام ئەوان هەرکە چاویان پێ دەکەوێ لەجێوە تەشقەڵەی پێ دەکەن

پان و بەرینە

ساغ و سەلیمە

(٢)

ئەو پیرەژنە ونبووە بەرگەی ئەم هەموو توانج و دەنگی گڤەگڤی بەردی ئەم منداڵە لاسارانە ناگرێ.کەلێشیان تورە دەبێ... بۆ دڵنەوایی خۆی، ئەوا یەکسەر ڕێگای مەحەتە دەگرێتە بەر... بەو

ئاواته جـــارێکی تر بەدیدەنی رۆڵە ســـەفـــەر کردووەکەی شاد بێتەوە.

(٣)

تووت..

تووت..

تووت..

شەمەندەفەر گەییە جێ، ئەو پیرەژنەش وەکو نەناسێکی ئاگر تێبەربوو ئەم لاو ئەو لا دەکا..

له ئاکامـدا ئاخـێکی سـارد هەڵدەکـێـشێ.. جارێکی تر بەخۆی و بەولاته ئاوارەکەی پشتییەوە روو لەشار دەکاتەوە.

**غازی شێت**

(١)

هەر کە منداڵان لەسەر شەقامێک یان... تووشی دەبوون، یەکسـەر خۆیان لێ دەکرد بە ٠حەداد٠ و پێیان دەوت:

- ئینزاب

ئەویش لەجێوە دەستی خۆی بۆ فەرمانیان بەرز دەکردەوە.

(٢)

غازی شێت، هیچ کێشەیەکی لەگەڵ منداڵاندا نەبوو، بەڵکو زۆرجار لەبەر دەرگای سینەماکان نوسراوی وێنە فلیمە ئینگلیزییەکانی بۆیان دەخوێندەوە، پاڵەوانی فلیمەکانی پێ دەناساندن.. ئەو چەتەواڵە رووخۆشە منداڵانی خۆش دەویست.

پەنچاو پێنج

(١)

منداڵان بەفـیـکە فـیـک بەدوای دەکـەوتن و لەدوورەوە پارچە تاسـوڵکەو تلیشـە بەردیان تێ دەگرت،

**مێروولە**

پەنجاو پێنج

(٢)

ئەو نەناسە تەپەترو تاس و لووس و دەردەوارە، ژان و برکی سکی زیادی دەکردو بەرچاوی رەشکەو پێشکەی دەکرد.. وەک مرۆڤێکی شەپلە لێدراو لە حەژمەتان تاوی دەدا منداڵان و زۆرجاریش لەشوێنە سـەرەو لێـژەکـانیش دەکـەوتە خـوارەوە، تلۆر دەبووەوە...

(٣)

ئەوەی جـێگای سـەرسـوورمـان بوو، (٥٥)ی ئەفەندیی سەر بەشەپقە، بۆ سبەی بەیانی خۆی تاس و لووستر دەکرد، قەرەوێتـێکی جـوانتـر لەجارانی لەمل دەبەست... بەو مەبەستە توانیویەتی لەم کێشەیە گرەو لەمنداڵان بباتەوە.. ئەم حاڵەتە هەموو رۆژێک دووبارە دەبووەوە.

**بەرخۆکە**

(١)

لەزارکی کـۆڵانێک یان... چیـچکەی دەکـردو تابورێک منداڵیش ئەڵقەیان دەدا.. ئەو خڕتۆڵەو توکمەو جلفرو ساویلکەو رەفتەنی و چرچاو کزە، هەر بەلەتە نانێکی ســەر سکڵی منداڵان یان بەپارچە نانە قـەیسـییەک سـەری رەزابوونی بۆ فەرمانی منداڵان دادەنواندو تەسبیحە (١٠١) قلییەکەی خۆی دەردەهێناو ناوی شێتەکانی بۆیان دەژمارد...

هەیاس.. جومعە.. چورچە.. کۆ.. حەمە.. ئەوە باداوەی.. ئەوەی عەنکاوەی..

(٢)

دەنگی ژاوە ژاوی منداڵان ئەم ناوەی پڕ دەکـرد، تاو ناتاوێ لاسارێکیان لەجێوە تەوزەی پێ دەکردو نوقرچێکی لەمنداڵەکەی تەنیشت خۆی دەدا..

(٣)

هەرکـە بەرخـۆکـە دەگـەیشـتـە ناوەڕاسـتی تەسبیحەکە دەنکە تەسبیحێکی تری بەتوندی ئاو دیو دەکـردو دەیووت: (بەخـۆم).. منداڵان دەیاندا قاقای پێکەنین و دەیانووت: «تۆ ناوت چییە؟».. ئەویش بەزەردە خەنەیەکەوە دەیووت: بەکر.

**دەروێش رەزا**

(١)

دەروێش رەزای ســـایەوان وئەک ناس، تاو ناتاوێ لەچەقی رێگایەک دەوەستێ وەک رێحانە کێویلە دەبووژێتەوە.

(٢)

دەرویش ڕەزا، وڵاتەکەی خۆی خۆش دەوێ، بەورتەورت، هەرجارەی سەربردەی هەڕەتی لاویی خۆی بۆ ڕێبوارێکی سەرەڕێ دەگێڕێتەوە...

(٣)

دەڵێن، حەمەرەزای ناسراو بەدەرویش ڕەزا شێتە.. دەڵێن، ناحەزانی مەهابادو دیاربکر و قامیشلی وپیرە هەولێریش گومانیان لێ پەیدا کردووە..

(٤)

دەڵێن،

دوێنێ شەو،

ئەم نەناسەیان لەشەقامێکی شاردا گوللە باران کرد.

## دەللە حەبۆڵە

(١)

عەبا ژەنگ لێهەڵنیشتووەکەی ئەم نیمچە ژنە پەرتەوازەو بێ حەوسەڵەیە زەرد هەڵگەڕاوە.. دەڵێی نسکێنەی پێ دارژاوە.. دەڵێی بەپەینی ڕۆژگار لەپماڵکراوە.. خۆ کیژۆڵەکەیشی وەک کوچکوچە بەدووای دەکەوێ.. لێی دانابڕێ.. خۆشی دەوێ..

(٢)

ئەم پەرتەوازەیە، لەماڵە مێردی دەرکراوە.. هەرکە بەرەو کۆلیتە ئاوارە تازەکەی دەبێتەوە، دیمەنەکان وەک بووکە سەماکەرە فیل لەهەستی بینینی دەکەن.. بەڵام کە سێبەری کیژۆڵەکەی لەتەک خۆی دەبینێ، ئەوا هەمموو خەمەکانی لەبیر دەچێتەوە..

(٣)

ئەم کیژۆڵە پەرندە ئێسک سووکەیان لەسۆزی دایکایەتی دابڕاندووە، باوکی دەڵێ، کیژۆڵەکەم گەورەبووە.. باوکی دیوارێکی مەحکەمی لەنێوان ئەو دەللە حەبۆڵەی دایکییدا دروست کردووە.. دەللە حەبۆڵەش قینچکەی لەجاران تەنگتر بووە، لەتاوان حەوسەڵەی هەرنەماوە.. منداڵانیش گوێیان لەسەر بردەی ئەم پیرە ژنە بووە.. کەدەیبینن لەجێوە بانگی دەکەن!..

« دەللە حەبۆڵە

هانە شکۆڵە»

ئەو منداڵە لاسارەی بەدەستێک هەڵماتی هەڵگرتووە، بەدەستەکەی دی هەڵماتێن دەکا.. بەقسان دەللە حەبۆڵەی سەرکۆنە کردووە.. ئەویش لەحەژمەتان، لەجێوە شین بۆ حاڵەتی تەنیایی خۆی دەگێڕێ، بەگوڕ بۆ شکۆڵەی کیژۆڵە گەورەبووەکەی دەگری.

## چێوە

(١)

لەبەردەم چایخانەی - مەچکۆ -دا، دوو ئەدیبی ناسراو لێک هەڵسانەوە..

(٢)

إ- (.........)ی هونەرمەند بەم دیمەنە پێدەکەنی.

ب-(........)ی چیرۆکنووس لەخۆشیان زەردەخەنەی دەهاتێ.

ج-(.........)ی شاعیر، هەوڵیدەدا ئاگری شەڕەکە خۆشتر بکا.

د-(.........) ی ڕەخنەگر، هەر قاقای بوو.

هـ- ئەدیبە گەنجەکان، ئەم لاو ئەو لایان دەکردو لەجێوە بزەی خۆشیان لێ هەڵدە قولا..

(٣)

ئەمە ناسنامەی چێوەی شەڕەکە بوو، تەنیا وجودی شێتێکی ریش درێژی پانتۆڵ دڕاوی لێ دەربچێ کە بەتوڕەییەکەوە سەیری دیمەنەکەی دەکردو لەبەر خۆیەوە بەدەنگی بەرز دەیووت:

- بۆ بەشەڕ دێن؟

چیتان لێ قەوماوە؟

خۆ میراتی باوکتان بەش ناکەن.

بەسە، بەسە،..

خۆ ئێوەشێت نین .. بۆ وادەکەن؟

## محەمەد کرمانج

لەمنداڵییەوە هۆگری خوێندنەوە بوو، ئێستاش

لەکونجێکی چایخانەی - مەچکۆ - دا بەهێمنی گفت وگۆ لەسەر ڕۆمان وشعرو چیرۆک وتێکستە مەعریفییەکان دەکا، هەرکە ئێوارە دادێ، ئەوا ڕوو لەکۆلیتەکەی خۆی دەکاو لەنێوان چوار دیواردا بیر دەکاتەوەو بەزمانەکانی: ئینگلیزی وفارسی وعەرەبی سەرچاوەکان دەخوێنێتەوە.. لەهەموو ڕۆژگارێکا خاوەن هەڵوێستی تایبەتیی خۆی بووە.. کتێب باشترین هاوڕێیەتی، نرخی هەموو کەس دەزانێ.. زۆرجار بینیوومە نووسەرەکان لەچایخانە لێی دەئاڵێن و پرسیاری هەمەڕەنگی لێ دەکەن، ئەویش بەدڵێکی فراوان و بەبێ بەرامبەری وەڵامیان دەداتەوە، مەتەڵە قورسەکانیان بۆ هەڵدەدا .. ئەم نەناسە شارەزاییی لەهەموو بوارەکانی ڕۆشنبیریدا هەیە.. منداڵانیشی زۆر خۆش دەوێ کەچی تائێستا نەبەرهەمی لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاو کردۆتەوە، نەژنی هێناوە.

## پوورە فەهیمە

(١)

پوورە فەهیمە، سێبووری بەماڵەکەی خۆی دەهات، هەر بۆ ئەوەی هەموو شتەکان بۆنی منداڵە جوانە مەرگەکەیان گرتبوو..

(٢)

پوورە فەهیمە، ئێستا بەتاقی تەنێ لەکونی ماڵەوە دەژێ، جارجارە بەهۆی یادگارەکانەوە وێنەی منداڵە جوانە مەرگەکەو مێردە خێر لەخۆ نەدیوەکەی لەتەنی خەیاڵ دەبینی.

(٣)

پوورە فەهیمەش مرد، دەرگای حەوشەیان گاڵادرا.. دەڵێن، جارێکی دیش ئەم دەرگایە کرایەوە.

## یاسینە فەندی

مامۆستای پۆلی یەکەم لەوانەی حیسابدا هاتە ژوورەوە، وەکو دوێنێ لەژمارە(١)ەوە تا (١٠)ی لەسەر تەختە ڕەشەکەدا بەعارەبی بۆ خوێندنەوە، ئێمەش بەدوایەوە ژمارەکانمان دووبارە دەکردنەوە.. تەمبەڵترین قوتابی ناو پۆل دەستی خۆی هەڵبڕی و هاتە سەر تەختە ڕەشەکەوە

واحد هەموو بەیەک دەنگ واحد

دوو هەموو بەیەک دەنگ دوو

٦٨ هەموو بەیەک دەنگ شەست وهەشت

١٢٠ هەموو بەیەک دەنگ سەدو بیست

یاسینەفەندی خۆی پێ ڕانەگیراو لەجێوە دەستی بەپێکەنین کرد.. لەو عانەدا بوو، ریشۆڵەیەک لەناو قەمیسەکەی ئەو منداڵە دەرپەڕی و بەشپرزەیی کەوتە ناو پۆلەکەوە..

ریشۆڵەی خڕین دایە شەقەی باڵ ورووی لەئاسمان کرد.. تێکڕای منداڵان دایانە قاقای پێکەنین، تەنیا ئەو منداڵە بەد بەختە نەبێ لەسەنتەری پۆلەکەیەوە بەگوڕ دەگریا..

بۆ بەیانی،

مامۆستای زۆر خۆشەویست یاسینە فەندی ی موسڵاوی لەوانەی نەخش ونیگاردا وێنەی دوو کۆمەڵە منداڵی بۆ کردین...

کۆمەڵەیەکیان دەگریان ئەوەی تریان دابوویانە قاقای پێکەنینەوە، لەنێوان هەردووکیشیاندا وێنەی باڵندەیەکی کردبوو، بەجۆشەوە ڕووی لەئاسمان دەکرد.

## گەرماو

خەیاڵ گەڕاندبوویەوە ناو جیهانی منداڵی و لەناو گەرماوی - عەلیاغا - دا یاریی بەکەفە سابوون دەکردو کاغەزی سابوونەکانیشی لەپشت و ئێرەو ئەوێی ئەم وئەو گیر دەکرد لەبەر خۆیەوە حیت حیت پێیان پێدەکەنی.. یان جاروبار لەناو عەمبارە ئاوەکەدا لەگەڵ دەستەی منداڵان نقووم دەبوون و پاشانیش بەدەم پێکەنینەوە سەریان بۆ دەرەوە هەڵدەبڕی .. پرچی کیژۆڵەکانی دەتووت: قەوزەنە بەسەر ئاوی عەمبارەکەوە کەوتوون ... لەو عانەدابوو، ناترەکە بەتوندی جامەکەی دەستی لەپشتی ئەو منداڵە بزۆکە گیرکرد ... تەواوکەری ئەو منداڵەش لەخەیاڵ ترازا.

## سەرنج :

ئەم چیرۆکە زۆر کورتانە پەیوەندێیکی بەتینییان بەئاوو هەواو هەندێ لەکەسایەتییەکانی هەولێرەوە هەیە، بۆیە لێرەدا بڵاومان کردنەوە.

«گۆڤاری هەولێر)

# حەیران لەنێوان چەمک و شیتەڵکردنی دەق دا



ئەحمەد حەیران

حەیران وەک تەرزێک لەستران یاخود گۆرانی، رووبەرێکی گەورەو بەر فراوانی لەبەرهەمی زارەکی میللی داگرتووە، توانیویەتی دەربڕی زمانی سەردەمی خۆی بێ ، ئەدگارو روخسارو سیمای گوزەرانی کۆمەڵگای کوردەواری لەقۆناغێکی مێژوویی لەخۆ گرتووەو پاراستویەتی، دەق و ئاوازو هەوای حەیران لەگەڵ رۆژگاری خۆی سازو گونجاو بووە ،حەیران سترانی بۆنەو پیشەو کاری وەرزی نەبووە، بەڵکو لەهەر چوار کەژەکانی ساڵ بواری گوتن و بیستنی رەخساوە، خەڵک بەتاسەو حەزەوە (متو)ی گوێگرتنی بووە، دەقەکانی حەیران وەک فۆرم لەرووی بنیاتی گشتیەوە بەرجەستەیەکی تەواوی دنیای ئەڤینی و خۆشەویستی و جوانی یە، ناوەڕۆکی حەیران تامەزرۆی مرۆڤی کورد پیشان دەدات کە تاچ ئەندازەیەک تینوی جوانی و سەرسامی رەگەزی مێ یە، سەرلەبەری دەقی حەیران گوزارشتە لەو دنیا خەیاڵیەی دڵداری و

حەزو ئاواتی شادبوون و توانەوە لەناو رۆح و جەستەی یەکتر،حەیران دنیایەک ژیان و ئاوات و خۆزگەو خواستی هەمەچەشن لەخۆ دەگرێ، دەیان خەونی ئەرخەوانی لەچوار چێوەی حەیران داڕێژراوەو لەوپەڕی وردەکاری و وردبینیەوە هۆندراوەتەوە، ئەوەی لەحەیران دا گوتراوەو دەربڕاوە لەگەڵ بارودۆخی رۆژگاری خۆی گونجاوە،حەیران لەرووی ئاواز و دەنگ و داڕشتنەوە لەگەڵ دەم و جەمی ژینگەی کۆمەڵایەتی لەباربووە، بۆیە حەزو خولیا و ئارەزووی خەڵک لەگەڵی راهاتووە، حەیران مۆرکی سەردەمێکی هەڵگرتووە ئەویش سەردەمی کشتوکاڵی ئاژەڵداری یە، کۆمەڵگای کوردەواری لەو سەردەمانەدا کۆمەڵگایەکی ئاسایی سروشتی بووە، بەژیانی شارو شارستانی کاریگەر نەبووەو روالەتە پێشکەوتوەکانی بواردن کاریان لەبیرو هزری کۆمەڵ نەکردبوو بۆیە زمان و هەڵس و کەوت و گوزەران و ژیانی خەڵک سادەو پاراو بووە تەکنەلۆجیای نوێ پێی نەگەیشتووەو تێکی نەداوە، لە ناو ئەو چوار چێوەیەدا حەیران وەک جۆرێک لەگۆرانی بووەتە پشوی هەناسەدانەوەی شەکەتی و بەهۆیەوە بەسەر بێزاری و خاکەساری زاڵبونەو حەیرانیان کردووە بە دڵدانەوەی ناخ و لەرێگایەوە حەزو ئارەزووە خەفەکراوەکانیان دەربڕیوەو خواستە زایندەییەکانیان ئاوەڵاکردووە، ئەدەبی فۆلکلۆری، ئەدەبی نەریتە، هەڵگری پەیامی کۆمەڵێک بەهاو رەوشتە، بەهۆیەوە ئەدگاری سەردەمی خۆی داڕشتووە و مۆرک و خاسیەت و تایبەتمەندیەکانی بەرجەستە بووە، حەیران وەک لایەنێک بۆ گوزارش کردن لەو ئەدەبە میللی یە فۆلکۆرییە سەر زارییە بەشێک لەو نەریت و داب و بەها کۆمەڵایەتیانەی لەگەڵ خۆی دا هەڵگرتووە، شۆڕبۆتەوە بۆ ناو سیماو خەسڵەتە سایکۆلۆژیەکانی تاک و کۆمەڵگاو کەسایەتی کورد، پێکهاتە دەروونیەکانی کۆمەڵگای کوردستان بەشێکە لەناوەرۆکی گۆرانیە میللیەکانی، لەرێگای سترانە فۆلکلۆریەکان ناخی کەسایەتی کوردو توانا و لێکدانەوەی هێزی هزرو هۆش دەخوێندرێتەوە، حەیران دەربڕی لایەنێکی ئەو دیاردانەیە، ئاماژە بە گەلێک بووار دەکات ، کە بە هۆیەوە دەتوانین توێژینەوە لەزۆر رووی کۆمەڵگابکەین، دەتوانرێ چەندین چەمک و بۆ چوون دابرێژرێ بەهۆی گەڕانەوە بۆ سەر دەقەکانی حەیران، لەقۆناغێک دا واتە لە کات و ساتێکی دیرۆکی دیاریکراو دا گۆرانی میللی شەقڵ و مۆرکی خۆی نوساندوە کاریگەری خۆی جێ



خوالێخۆشبوو عوسمان حەیران

هێلاوە خولیا و هەوەسی خەلکی تێرکردووەو لەگەڵ میزاج و خواستی ناخیان سازاوە ئەو سیماو ڕێڕەوە لە سترانی میللی تا مەودایەکی دیارکراو دەڕوا دوواتر بەرە بەرە دەتوێتەوەو کز دەبێ ئێستا، ئەو جۆرە گۆرانیە میللیانە بوونەتە کلاسیک، بەگۆرانی گوندو کۆمەڵگا دێهاتیەکان دەدرێنە قەڵەم، شوێن و ژینگەیان گۆڕاوە کۆمەڵ پێی ناوەتە قۆناغێکی ترو ژیانی بەرەو پێش چووەو ئەدگارو سیمای نوێ وهاوچەرخ بەگوزەرانیان نوساوە، لەڕووی کات و ساتەوەش گۆڕانکاری تێکەوتووەو رووەو بەسەرچوون دەچن. چونکە ناوەڕۆکی ئەو سترانە میللیانە وەکو حەیران و ئەوانی تر دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارێک کەبەرەو نەمان و تێپەڕین چوونە یاخود دەچن، سەردەمی دەوارنشینی ورەشماڵ گەری وکۆچباری ناوەڕۆکی ئەو گۆرانیانەیان دروست دەکرد،، نەوەیەک پێگەییوە بەوکەش وهەواو ژیان وگوزەرانەی ئاماژەمان پێکرد نامۆیەو بەو جۆرە سترانە میللی وفۆلکلۆریانە دەروونی سارد نابێتەوەو دڵی ئاوناخواتەوە، لەڕووی فۆرم(شکل) وەک ئاواز هەست وئارەزوو دەبزوێنن دەتوانرێ بەناوە رۆکێکی تازە دابڕێژرێنیتەوە، ئەوەی لەگەڵ وەرزەکانی ساڵ دەگوتران وەکوو بەندی گۆرانی(درویّنە) ئەوانە تازە دروست نابنەوەو بەرەو توانەوەو نەمانی یەکجاری دەڕۆن، چونکە کەس ئێستا درویّنە ناکات، زۆر گۆرانی تریش کەلەبۆنەو پیشەی تایبەتی گوتراون، بەهۆی نەمان وبەسەرچوونی سەردەمی بەکاربردنیان ئێستا نەماون خەڵک پەیڕەوی گوتنیان ناکات، بەشێک لەدیرۆک وبەسەرهاتی کۆمەڵگای کوردستان بەهۆی گۆرانی فۆلکلۆری پارێزراون حەیران وەک جۆرێک لەگۆرانی فۆلکلۆری ئاماژە بەهەندێک بەسەرهات ورووداوی کۆمەڵایەتی دەکات. حەیران لەگێڕانەوەی رووداو یاخود بەسەرهات وەکو لاوک نی یە، لاوک زیاتر لایەنی قارەمانیەتی وئازایەتی لەخۆدەگرێ، باس لەداستان وبەسەرهاتی دلداری ومێژوویی دەکات، لاوک لەرووداو وەردەگیرێ بەڵام حەیران دادەنرێ، دەهۆندرێتەوە شایەر بەپێی زەوق وئارەزووی دڵی خۆی دەیرازێنێتەوە، ئەڤینیوکۆڤانی

دەروونی دەخاتە ناو دەقەکانی حەیران وباس لەتامەزرۆیی ، حەزو ئارەزووی خۆی دەکات بۆ جوانی ونەرم وناسکی ئافرەت، شەیداو سەوداسەر بوون بەدووای لارولەنجەی ئافرەت ناوەڕۆکی زۆربەی دەقەکانی حەیران پێکدەهێنێ، هەروەها هەندێک رووداو یاخود بەسەرهات کەلە رۆژگاری خۆی بەتایبەت لەو رۆژگارانەی کەحەیران زمانی دەربڕینی حەزو ئارەزووی کۆمەڵ بووە باس دەکرێت وئاماژە بەروودانی دەکرێت، لێرەدا باس لەرووداوێک دەکەین کە لە زۆر دەقی حەیران بێژان ئاماژەی پێدراوە، دەقی حەیرانەکە لای زۆربەی حەیران بێژەکان یەک ناوەڕۆکی هەیە بەڵام هەریەکە بەپێی تواناو شارەزایی ولێهاتویی خۆی دایڕشتووە، عوسمان حەیران باوکی تەنیا عارەب دەڵێ:

دەرێم ئەورۆکە بەوێ سبیانێ

زەینێ خۆتان بدەنە بەستۆرە

دەرێم: بەستۆرەیێ گۆرانان گەلە گەلە شیرینە

بابە لەبەر بیانێ

ئەوا ئەسمەر گاز دەکا دەرێ دایە

ئەتو زەینێ خۆبدە بەحرکەیێ جاران

دەرێن شین دەکرێ لەبەر دوکەرێ پیرە کارخانێ

ئەوجا دەرێ: خوام بکا بەخورامی کورە کورەیێ(گەردیان) وەکی دەستێ خۆیان دەداوە دارەکەیێ جامبێزارێ دەیانگرت قەراتەکەی پیرە هەولێرێ.

وەکی دەیانکوشت(رەشیدی باش چاوەش).

دەریان دینا (کاکلی) بابێ(جەمیلی)

لەگە کۆمەرەکی قاتیلان.

بەزەبری خەنجەرێ لەبەندیخانێ.

لەدەقی حەیرانێکی تر لەسەر هەمان رووداو حەیران بێژی کۆچکردوو (مستەفا حەسەن خەزنەیی) دەڵێ:

دەرێم براینە برادەرینە ئەگەر دەرێم بەستۆرە

بەستۆرە لەبەر بیانێ

ئەگەر بەحرکەی رەنگین دیار نی یە

زەینێ خۆ بدەنێ بابە لەتەمێ لە تومانێ

وەکی وەسمەر گاس دەکا

خوام بە خورامی کورە کوری (گەردیان)کا

یاخوا لەروحێ داکێ منیان کەوی

ئەوسار بەوێ دەرە بوارێ

وەکی (دەشکێنن) دەرکێ (سەرایێ)

دەوەتانە (کاکلاغە) ی گەردی

بابێ (جەمیل) و (مەجید) ی

دەردیننەوە لەبەندی خانێ هەولێری

بەخودای دەوەتانە بەزەبری لولەی کارخانێ.



خوالێخۆشبوو مستەفا حسەن خەزنەیی

لێرەدا بەهۆی دەقەکان دەردەکەوێ کە حەیرانەکە باس لەڕووداوێک دەکات، بەسەر هاتێک ئاماژە پێدەکات کەوا گەردیەکان، هێرشیان بردۆتە سەر (قشلە، سەرا) ی حکومەت لەقەڵای هەولێر، بەندیخانەیان شکاندووەو پاسەوانی بەندیخانەکە بەناوی (رەشید باش چاوەش) گوژراوە، کاکلاغەی گەردی لەبەندیخانە دەرهێندراوەو بەزەبری لولەی تفەنگ و خەنجەر گرتووخانەکەیان شکاندووە، ئەم رووداوە لە سەردەمی خۆی زۆر دەنگی داوەتەوە سەر بردەیەکە بۆنی یاخی بوون و راپەڕین و وەستان لەدژی دەسەڵات و حکومەتی لێ دێت، رووداوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دووا رۆژگاری عوسمانیەکان و لەهەندێ سەرچاوە ئاماژەی پێکراوە لەوانە (العشائر الکردیە) فوئاد حەمە خورشید لە ئینگلیزی کردوویە بەعەرەبی لەگەڵ (تراث اربیل التاریخی) هادی چاوشلی، بەڵام ئەدەبی فۆلکلۆری وەکو حەیران و لاوک و بەیتی تر گوزارشیان لەم روادوە کردووەو لەمیانی دەقەکان هەست دەکەین کەباس لە روداوێک دەکرێ، بۆ زیاتر رونکردنەوەی ئەم بەسەر هاتەو چۆنیەتی رەنگدانەوەی لەئەدەبی میللی واچاکە پێشینەیەک لە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی بەحرکەو هاتنی گەردیەکان و چۆنیەتی روداوەکە بخەینە روو.

شەمدینان قەزایەکە سەر بە پارێزگای هەکاری لە کوردستانی باکوور واتە تورکیا، دەڵێن گەردیەکان پێش زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ لەوێوە هاتوون، سەرەتا روویان لەناوچەی پشدەر کردووە، دوواتر هاتونە خوارووی رۆژئاوای کۆیەو لە گوندی (ئەشکەفت سەقا) نیشتەجێ بوون، بەحرکە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای هەولێر ناوچەیەکی چۆڵ و بەئاو بووە، (عەباس ئاغای یەکەم) کەبە عەباسە (شەل) ناسراوە لەگەڵ هەندێ لەخزمەکانی دێت لەبەحرکە ئاکنجی دەبێ و ئاوەدانی دەکاتەوە، دەڵێن مێژووی نیشتەجێ بوونی گەردیەکان لەبەحرکە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ بەرلە ئەمڕۆ، نەخۆشی رشانەوە لە ناوچەکە بڵاودەبێتەوە بۆیە لەسەرانی بنەماڵەکە تەنیا دووکەسیان دەرباز دەبێ ئەوانیش (شێخ محەمەد ئاغاو قادر ئاغا) ی برای بوون، شێخ محمد ئاغا پیاوێکی چاپوک و ئازابووە پاشای کۆرەی میرنشینی سۆران لەشەڕەکانی دا پشتی پێ بەستووەو

لەشەڕێک دا لەدژی روسەکان دەستەجلێکی پاشایانەی خەڵاتکردووە ئەو دەستە جلە لەلایەن جەمیلاغە پێشکەش بە قونسوڵی بەریتانی کراوەو ئێستا لەمۆزەخانەی لەندەن پارێزراوە، بەهۆی دەسەڵات خوازی و ناکۆکی لەسەر زەوی و زار زۆربەی هۆزو خێڵەکانی کوردستان ناکۆکیان لەنێوان دا هەبووە، بۆیە شێخ محەمەد ئاغای گەردی لەناکۆکیەکی زۆر بووە لەگەڵ هۆزە گەورەکانی دەشتی هەولێر و دەوروبەری، وەکو دزەیی و خۆشناو زراری و بلّباس.

دەڵێن جارێکیان (١٢) شێخی عارەبانی لە (دیبەگە) بەبارمتە گرتووە، داوای لێکردون تا وەکو رۆژە رێیەک لەناوچەکە دوور نەکەونەوە بەریان نەدا، لەهەندێک دەقی حەیران ئاماژە بەم ناکۆکی و شەڕانەکراوە بۆ نموونە.

دەرێم براینە برادەرینە زەینێ خۆ دەدەمە
بەینی بەحرکەو براغی
دەوەتانە سبەینان لەمن بەدووکەرێ شینە
دەرێم براینە برادەرینە
بەینی بەحرکە و براغی
زەینێ خۆ دەدەمێ
سبەینان لەمن بەدووکەرێ شینە
دەوەتانە وەکی ئەسمەر گاس دەکاتە مامەری
مارت گەلەک وێران بی هەستە لەخەوێ
زەینێ خۆ بدێ
بڕەکێ سوارێ دزەییان
ئەوە لەسەنگەران دانیشتینە
چاوەکەم چەند شیرین
دەکەنەوە مشاوەرە لەگە تەگبیرە
دەوجە وەکی وەسمەر گاس دەکاتە هەمینێ

یارەبی هۆردوو چاوت کۆرەبی
کەست لەمارێ بابان نەمینێ
دەتۆ بەسە کۆشکان و بارەخانان بکەوە
زەینی خۆ بدێ
ماینێ مەولودی حەسەنی
ئەوە دێتەوە لەسەرێ مەیدانێ
ئەوجە ئەی هاوار دەوەتانە بەخودای
سەر زینی کەوێ یە
قالّتاغی بەخینە

دیارە زۆربەی ئەو ناکۆکیەی نێوان خێڵ وتیرەو هۆزەکان لەسەر زەوی وزارو شوێنی کشتوکاڵی بووە، هەرکەسە ویستویەتی سنوری دەسەڵاتی فرەوانتر بکات وزۆرترین شوێن وزەوی بەپیت وفەڕ بگرتە دەست، بڕێکی تر لەناکۆکیەکان حەزی رەمەکی بووە، کەسانێکی زۆر لەئادەمیزاد لەسروشتەوە نایەوێ کەس لەخۆی بەهێزترو گەورەتر ببینێ یاخود ناوبانگی لەوچاکتر بێ، لەوانەشە

بەشێکی زۆر لەو شەڕو ناکۆکیانە لەژێرەوە دەستی میری و ڕژێمی ئەو کاتی عوسمانیەکانی تێدا هەبێ. دەسەڵاتدارانی ئەو کات هەولێیان داوە خێڵ وهۆزەکان لەناکۆکیدا بن تاوەکو بەئاسانی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکەدا بڕواو نەبنە هێزێکی دیار لەئاست فەرمان وداواکاریەکانیان بوەستن، بەڵکو گەرەکیان بووە بێ هێزو ناکۆک بن تاوەکو بۆ یارمەتی و بەتەنگەوە هاتن روو لەوان بکەن گوێڕایەڵیان بن، بەهەر شێوەیەک بێ(شێخ محەمەد ئاغا) پیاوێکی ئاین پەروەری دیاربووە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکانی خۆی سازوکۆک بووە، خاوەن تەلارو دیوەخانێکی گەورەبووە دیوەخانەکە شوێنی گردبوونەوەی خەڵک وداڵدەدانی لێقەوماوان بووە! دەڵێن(١٣) کوڕی هەبووە، یەکێک لەوانە ناوی(کاکل) بووە واتە کاکل شێخ محەمەد ئاغا، کاکلاغا هەر چەندە کوڕە گەورە نەبووەو برای لەخۆ گەورەتری هەبووە، بەڵام بەهۆی بوێری ولێهاتوویی دووای باوکی دەسەڵات وسەرۆکایەتی عەشیرەت دەگرێتە دەست لەیەکێ لەشەڕەکان لەگەڵ بلباسان(٣)براو وەک دەڵێن(٨٠) پیاوی لێکوژراوە، دوواتر حکومەت نێوانیان دەکاو هەردوو لایان هەریەکە بە(٦٠٠)قران سزا دەدا، کاکلاغەی شێمحەمەداغەی گەردی لەساڵی ١٨٣٠ هاتۆتە دنیاو ساڵی(١٩١٠) لەتەمەنی(٨٠)ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، چەند کوڕێکی هەبووە لەوانە(حەمید، مەجید، جەمیل)، لەدووای کاکلاغا(جەمیل)ی کوڕی دەبێتە راوێژکارو زمان زانی عەشیرەت، لەسەر ڕێوو ڕەسمی پێش خۆی دەڕوا، دەڵێن لەبەڕێوەبردنی کاروباری خێڵەکەی دا راوێژکاری هەبووە، سێ یەم سەرۆکی گەردیان بووە لەبەحرکە، جەمیلاغا لەگەڵ فەتاح ئاغای هەرکی، خدری پاشای دزەیی، تەحسین بەگی ئێزیدی، فارس ئاغای زێباری، حوسێنی مەلا، دارا بەگی داودی، میرانی قادر بەگ، هەموو بەیەکەوە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوونە لەسەردەمی مەلەکیدا.

لەدەقی دوو حەیرانەکەدا وەک ئاماژەمان پێ دا کەدەڵێ:

**وەکی دەشکێنن دەرکێ سەرایێ**
**دەوەتانە(کاکلاغە)ی گەردی**
**بابێ جەمیل ومەجیدی**
**دەردیننەوە لەبەندیخانێ هەولێرێ.**

یان دەڵێ:

**دەیانگرت قەراتەکەی پیرە هەولێرێ**
**وەکی دەیانکوشت ڕەشیدی باش چاوەش**

**دەریان دینا کاکلی بابێ جەمیلی**
**لەگە کۆمەرەکی قاتیلان**
**بەزەبری خەنجەرێ لەبەندیخانێ.**

لەناوەڕۆکی حەیرانەکان وەک دەرمان بری ناوی کاکلاغەو جەمیل ومەجیدی کوڕی هاتووە، وەکو دەست نیشانمان کرد، ئەو خێڵ وتیرەو هۆزانە ناکۆکی لەنێوانیان هەبووە، کاکلاغا لەگەڵ دزەییان نێوانیان ناکۆکی تێدەکەوێ، شەڕ لەنێوانیان روودەدا، بەهۆی ئەو ناکۆکیانە عوسمانیەکان کاکلاغەی گەردی ومەحمود ئاغای دزەیی دەگرن لەقەلای هەولێر بەندیان دەکەن.

هەندێک هۆی گرتن وبەند کردنی ئەوانە دەگەڕێننەوە بۆ یاخی بون وراوەستانیان لەدژی دەسەلاتی عوسمانیەکان لەوانەیە وابێ، ئەوانە باج وسەرانەیان نەدابێتە عوسمانیەکان ئەوانیش لەبری ئەوە ئاگری ناکۆکییان خۆش کردبێ و وەک نیشان دانی هێزو دەسەلاتیش جاروبار بەندیان کردبن، بەهەر هەرجۆری کاکلاغەی گەردی و مەحمود ئاغای دزەیی لەبەندیخانەی عوسمانیەکان لە قەلای هەولێر دەگیرێن، دزەییەکان هێزو تواناو دەسەلاتیان دەبێ وزەبر لەمست بوون، بۆیە گەورەی خۆیان مەحمود ئاغا رزگار دەکەن، کاکلاغا دەمێنێ، دوای ئەو رووداوە لەترسی پاشەڕۆژی خۆی داوا لەخزم و کەس وکاری دەکات لەبەحرکە بێن هێرش بکەنە سەر بەندیخانەو سەرای حکومەت وئازادی بکەن،ئەوانیش هەردوو کوڕەکەی جەمیل ومەجید ئاغا لەگەڵ خورشید ئاغای مامیان چەندین کەسی تر لەخزمانیان لەشکرێک گرد دەکەنەوە بەشەو هەلدەکوتنە سەر بەندیخانەو دەرگا دەشکێنن کاکلاغە رزگار دەکەن، ئەم شێوە هەلکوتانە بۆسەر دەزگاو دامەزراوی دەولەتی عوسمانی، وەکو راپەڕین ویاخی بوون دەکەوێتە بەرچاو، حکومەت بەراوەستان لەدژی دەسەلات لەقەلەمی دەدات، رووداوەکەش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەناو خەلک بلاودەبێتەوەو کار لەناوو ناوبانگی دەسەلاتی عوسمانی دەکات، بۆیە حکومەت بەمە تەنگاو دەبێ، دوو لەشکر لەموسل وکەرکووک کۆدەکاتەوە بەسەرۆکایەتی(قەلا ئاغاسی ودەولەت یار) دەلێن دزەییەکانیش هاوکاریان کردوون، لەشکری عوسمانی بەحرکە دەگرێ دیوەخان ومالی کاکلاغە ئاگر تێبەردەدەن لەشەڕێکی بەرگری خێرادا کاکلاغە وپیاوەکانی بەگوندی(دێرە) پاشەکشە دەکەن دەچن لای هەمەوەندەکان دەگیرسێنەوە، پاشان لەوێ ئاکنجی نابن دەچنەوە ناو خاکی ئێران ولەوێوە ئاودیو دەبن بۆ(شەمدینان) لای شێخ مەحەمەدی سەدیقی کوڕی شێخ

عوبێدوڵڵای نەهری ڕێبەری شۆڕشی ١٨٨٠ لەكوردستانی باكوور دادەمەزرێن شێخ مەحەمەد سەدیق لای سوڵتان عەبدولحەمید بڕیاری لێبوردنیان بۆ دەردەكات، بەمجۆرە دوای (٦) مانگ وەك دەڵێن لەئاوارەیی و دەربەدەری كاكلاغە دەگەڕێتەوە بەحركە بەم بۆنەیەوە خەڵك چاویان پاكژ دەكەنەوە ئەمەش نەریتێكی كۆنە بۆ دوورخستنەوەی بەلاو ئاشوب و شەڕ ئەنجام دەدرێت، ئەمە سەربردەی ئەو ڕوو□داوە بوو كەلە میانی شیتەڵكردنی دوو دەقی حەیران لێكمان دایەوەو خستمانە ڕوو، دیارە ئەدەبی میللی و فۆلكلۆری وەك ئاوێنەیەك بۆ ڕەنگدانەوەی ژیانی كۆمەڵگا، بەشێكی زۆر لەبەسەرهات و ڕووداوی لەم جۆرەی لەخۆ گرتووە، لەمیانی دەقە فۆلكلۆریەكان ئاماژە بەڕووداوەكان دەكرێ، كەواتە ئەدەبی میللی ئامرازی گوزاش كردن بووە بۆ دەربڕینی قسەی ناوەوەی دەروونی كۆمەڵ، بەهۆیەوە پەنجە درێژ كراوە بۆ ئەو پێشهات و گۆڕان و بارودۆخەی هەبووە، ڕووداوە گرنگەكان، بەسەر هاتە گەورەكان، ئەوانەی كە ناوەندی كۆمەڵ و خەڵكیان هەژاندووە، چونەتە ناو بەیت و لاوك و حەیران و جۆرەكانی تری گۆرانی و دارشتن و هۆنینەوەی ناوەرۆكیان ڕەنگیان داوەتەوەو تۆماربوونە، مانەوەو پێزانینی ئەو بەسەر هاتە دیرۆكیانە لەرێگەی ئەدەبی میللی، نیشانەو هێمای ئەوە بەدەستەوە دەدات كەوا ئەدەبی فۆلكلۆری لەقۆناغێك لەسەردەم و ڕۆژگاری كۆن ڕۆڵی سەرەكی هەبووە لەناو خەڵك. ئامرازی دەستی كۆمەڵ بووە بۆ پاراستنی خەسڵەت و داب و ئاكاری ئەو كات .

سەرچاوەكان

١- ئەحمەد حەیران، دیوانی حەیران بێژان، ١٩٨٨

٢- نوری یاسین هرزانی- عەبدوڵڵا خورشید، دابینكاری ڕیكخستنی كۆمەلایەتی لەكۆمەڵگەی گوندنشینی كوردەواری- تۆژینەوەیەكی ئەنترۆپۆلۆژییە دەربارەی گوندی بەحركە- گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، ١٩٩٨

٣- ئەحمەد حەیران قەفتێك لەحەیرانەكانی بەندبێژی میللی مستەفا حەسەن خەزنەیی، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١١)، ٢٠٠١.

# چەپکێ لەسەربردەکانی سەعید سەلیم دۆڵەبەکرەیی

ئامادەکردنی: جەمال گردەسۆری

## سەعید سەلیم کێ بوو؟

**ناوی تەواوی، سەعید سەلیم سەعدون، ناسراوبوو بەسەعید سەلیم دۆڵەبەکرەیی، لەساڵی ١٨٨٧دا لە گوندی میرەکان لەدایک بووەو لەساڵی ١٩٦١ لەگوندی پۆریجە کۆچی دوایی کردووە، ئەو زاتە پاکە یەکێکە لەشاعیرە میللییە هەرە بەناوبانگەکانی دەشتی دزەییاتی، کەم کەس هەیە لەکوردستان کەناوی ئەم زاتەی نەبیستبێ و ئەشقی گوێ بیستی شیعرە بەجۆشەکانی نەبوو بێت، وەک دەگێڕنەوە، مام سەعید پیاوێکی دەست کورت و نەدار بوو، بەڵام هەردەم شوکربوو، دەنگ نەرم و خۆش و نزمی باش دەزانی، هەتاکو مرد هەردەم مەجلیسی گەرم بوو، زۆربەی دانیشتنەکانی لەگەڵ پیاو ماقوڵان و هەروا زۆر برادەری مەلایان بوو، لەگەڵ لاوانیش لاو بوو، لەبووک گواستنەوەو تازومانان بانگی مام سەعیدیان دەکرد بۆ جۆش دانی مەجلیسەکەو سەربردەی خۆش و شیعری ناسکیان بۆ بێژێ، ئەم زاتە سەربردەی لەبن نایە بەمن و ئەم و ئەو بەڵام وا ئەمجارەش لەچەند کەسێکی نزیکی مام سەعید گوێ بیستی هەندێک لەسەربردەکانی ئەم زاتە بوویە منیش بە ئەمانەتەوە دەیخەمە بەرچاوی ئێوەی خۆشەویست، پشت بەخوا بەردەوامیش دەبم، سەربردەکان بریتین لە:**

---

دەگێڕنەوە، ڕۆژێک لەماڵی ئاغایەک دەبێ ئافرەتێک بەناوی دایەزێڕێ داوای لێ دەکات شیعر بڵێ، ئەویش لەم کات توتنی پێنەماوە بۆیە دەڵێ:

ئەستێو بەردو قاوە
لەناو کیسەم ڕەشەراوە
هیچ تەڕایم پێ نەماوە
بفڕم لۆ خاکی هەرتەلێ
خاکی هەرتەل بەسوسنە
هەموو مارەک پڕ توتنە
ئەوێندەرێ جێگەی منە
ڕەشە ڕەیحان گوڵی دەم زێ
توخوا چت گۆ دایە زێڕێ
دەتوخوا بڕۆ لای جاغی
لە بۆمن بینە بەرماغی
ئەگەر بەرماغیشتان نییە
قەمیشیش بی قەیدی نییە

هەروا دەگێڕنەوە ڕۆژێک میوانیان دێت کتری ئاو بۆ چا لێنان دەخەنە سەر سۆبەو لەهیکڕا کتریەکە بەردەبێتەوەو ئاوە گەرمەکە بەسەر پێی سەلیمی کوڕی دادەڕژێ، مام سەعیدیش لەسووی سوتانی پێی سەلیم بەشیعر دەڵێ:

ئاوی گەرم کورایە
پێی سەلیمی سوتایە
بەسندان بێ ئەو چایە

لەساڵی پەنجایەکان شێخ سەعد هەبوو بەڕێوەبەری تەجنید بوو لە وەرزی بەهاران دەهاتە گوندی دۆڵەبەکرەو هەفتەیەک لەوێ دەبوو، ئەو شێخ سەعدە پیاوێکی زۆر ئاقلمەند بوو هەردەم ئەشقی مەجلیسی سەیدان و مەلاو شێخان بوو، هەروا مام سەعیدی زۆر خۆش دەویست زۆر بەیەکەوە دادەنیشتن بەتایبەتی لەدیوەخانی گوندی دۆڵەبەکرە، دەڵێن شێخ سەعد کاتبەکی هەبوو ناوی حوسێنە فەندی بوو، سەری سپی بوو، ناوەندی سەری سۆر دەچۆوە چونکە ڕووت ببۆوە، ڕۆژێک حوسێنە فەندی ڕوو لەمام سەعید دەکاو بەگاڵتە پێی دەڵێ بەلاش لێرە دانیشتی، مام

سەعیدیش دەڵێ: چ بڵێم ،حوسێنە فەندیش دەڵێ: ئەتو دەتوانی شیعرەکمان بۆ بڵێی بەندەکان بە (س)دەست پێکات:

مام سەعیدیش دەڵێ:

سین و شین و صات و لات
سەرت سۆرە، سپی پات
سەت جار بەسەری برات

ئینجا مام سەعید رادەوەستێ و ، خەڵکەکەی ئەوێندەر دەڵێن دەبی شیعرەکە تەواو بکەی.

مام سەعیدیش دەڵێ:

دونێ جاشکەک ئەتوو گات.

دەبێتە پێکەنین شێخ سەعد دەڵێ: وەڵا حوسێنە فەندی هەقی خۆت وەرگرت، حوسێنە فەندیش بەبێ عاجزی و تووڕە بوون دەڵێ کوڕینە بەخوای هەقی خۆی پێدام.

هەر لە گوندی دۆڵەبەکرە، کابرایەک هەبوو مەولودە کۆریان پێ دەگوت گۆشت فرۆشی دەکرد، مەیلەو شاعیریش بوو، رۆژەکی لەکاتی گۆشت فرۆشتنی چاویی بەمام سەعید دەکەوێت بەشیعر دەڵێ:

**هۆی گۆشت هۆی گۆشت**
**گۆشتی مەولودە کۆری**
**پشتم کەتە گردەسۆری**
**بەرم کەتتە هەمزە کۆری**
**ناچمە گەڕەکی گۆشت نەخۆری**
**مام سەعیدیش بەشیعر پێی دەڵێ:**
**پیرە مێردی تڕ گەورەی تڕ بەراز**
**چی دی مەکە بانگەواز**
**کەس ناخوا گۆشتی لاواز**

هەروا دەگێڕنەوە لەساڵی پەنجایەکان لەگوندی دۆڵەبەکرە کابرایەک دەبێ بەناوی سوڵتان دوو ژنی هەبووە، رۆژێک لەگەڵ ژنەکان دەمەقاڵیان دەبێت، ژنەکان، سوڵتان دەردەکەن، ئەویش بەناچاری لەبن دیوارێکی بەکاوکۆت پاڵ دەکەوێت، مام سەعیدیش بۆلای دەچێت و کە بەم جۆرەی دەبینی و سەربردەی دەمە قاڵیەکەشی زانیوە چۆن بووە، بۆیە بەشیعر بە سوڵتان دەڵێ:

لەگەڵ تۆمە مامە سۆتە
دوو ژنت هەیە هەردووک جۆتە
هەرچار دەورت کاو کۆتە
ژنەکان باشن خەتای خۆتە

لەساڵی ١٩٥٦ مام سەعید هێسترەک و بارگینەک و مانگایەک و چەند مەڕەک و بزنەکی دەبێ، لەگەڵ چەند عەلبە گەنمێک هەمووی دەفرۆشی، لەگەڵ مەلا عوسمانی خوارزای پەستەکی دەکڕن، چەند مانگێکی پێ دەچێ خەڵک لەمام سەعید دەپرسن خێرو بێری پەستەکەتان چۆنە، ئەویش دەڵێ:

تێک ماندا نیرو کۆپەرانی

**پەستمان کڕی لەگەر عوسمانی هیچ قازانجی نەبووکەسیش بەزەرەری نازانێ هەر لەگوندی دۆڵەبەکرە لەساڵی پەنجایەکان ئافرەتێک هەبوو بەناوی گوستان خزمی مام سەعید دەبێ و خێزانی مام مەحمود مەرحەمی بوو، مام مەحمود شوانکارەی ماڵی حەمەداغەی دۆڵەبەکرەیی بوو، ساڵێک لەوەرزی زستان بەفرێکی زۆر دەباری؛ دەردێک دەکەوێتە ناو مەڕی حەمەداغەو مەڕێکی زۆری دەمرێ، رۆژێک مام سەعید بەپێش ماڵی حەمەداغە تێدەپەڕی پێستەمەڕەکی زۆر دەبینی گوستان خەریکی شوشتنیەتی مام سەعید روو** لەگوستان دەکات ودەڵێ:

گوستان
دێدەوانت لێ بوو بەکیستان
دەوجا چاکە پیستان

هەروا دەڵێن رۆژێک هەر لەگوندی دۆڵەبەکرە، منداڵێک کۆچک و کڵاوی لەسەر دەبێ بەپێش مام سەعید تێدەپەڕێ، مام سەعید منداڵەکە ناناسی لەیەکێک دەپرسێ ئەم منداڵە کێیە، ئەویش دەڵێ: پیرداودی کوڕی حەسەن لۆبیایە مام سەعید روو لەمنداڵەکە دەکات و دڵێ:

پیرداود جۆتە گونم بەلا چاوت
تاق و جۆت بێ شکارتەی باوت

**... ی سۆریەو پێراو**
**لەشیعرێکی دیکەش دەڵێت:**

هانایەت وەبەر دەبەم — هانایەت وەبەر دەبەم
هانای وەبەر خوای دەبەم — خالق جەلیلی ناوە
سەردەمەکی جاعێل بووم — سێ لیفکەم بەردەداوە
بەپێش ماریان دادەچووم — کیژ پێیان دەگۆتم لاوە
ئێستاش پیرو کووڕو ئەختیار بووم — وەک گۆچانی شوان پشتم چەماوە
چەند جاری من دەکۆخم — دەرێن دەردو رەشاوە
موی سپیم لێ بەددرکەوت — لایان وابی گراوە
کە پشتیان تێ دەکەم — دەرێن نەژنە نەپیاوە

لەساڵی ١٩٥٦وەک باو هەندێک لەفەرمانبەران و خەڵکی دیکە سمێڵیان دەتراشن مام سەعیدیش زۆری پێ ناخۆش دەبێت بۆیە دەڵێ:

هانایەت بە بەردەبەم — خالیق هانام بە بەرتۆ
شەمس و قەمەر هەرانت — دنیا بووە نێژی نیوەڕۆ
چەند زیندەوەران هەیە — یارەب بەقودرەتی تۆ
هەناسەی دێوو دەچی — خوایە هەرئەمری تۆ
دائیرەی حوکمەت تەواو — حەفت و هەشتەو ئەگەر نۆ
غالب سمێریان دەتراشن — ئەودیە مۆدەی ئەورۆ
دائیرەی حوکمەت قەیدی ناکە — شوان، جۆتیار ئەنگۆ لۆ

هەروا لەساڵی ١٩٥٦ شیعرێک بەسەرخۆیدا دەڵێ:

هەر خۆش بی سەعید سەلیم
بچییە بەهەشتی جەنەت و نەعیم
لەگەڵ ئۆمەتی مەجموعی موسلیم

هەر خۆش بی سەعید سەلیم
داخیل بە بەهەشتێ بی
هیچ کۆسپەی نەیەتە بەرێ

خوا سوابت بزانی
کیژو خوشک و خێزانی
قورتار بی بە ئاسانی

مام سەعید گەلێک شیعری ئاینیشی هەیە وەک دەڵێ:

یارەبی خوایە تۆ بەخەبەری
ساحێبی قیامەت و دونیاو مەحشەری
لەدینی موحەمەدی نەمان کەی بێ بەری
هەزار سەلاوات لەپێغەمبەری

لەسەر نوێژو زەکات دەڵێ:

بە ئۆمەر مەندان مەرقەدی لێژە
بەمەر قەدی شێخ مار لەدێ لێژە
واجبی سەرمان زەکات و نوێژە
هەر کەسێ عەمەلی پێنەکات زۆر هورو گێژە

دەربارەی ئەجەلیش دەڵێ:

فەقیرو وەزیر پاشاو گەدایە
رۆژت نەمینێ عومرت کۆتایە
دەرمان و دختۆر هەموو خۆدایە
ئەوجا خۆت هەرمەکێشە لۆکن دختوری
پشتی خۆت بەستە بەخواو بەپێغەمبەری

بۆ دژی غەیبەت و درۆ و وەسفی بەهەشت دەڵێ:

بەهەشت زۆر خۆشە
خۆزگەم بەو کەسەی
خوارو خێچ نییە
دوژمنی درۆیە
پێغەمبەر بەخۆی

جێی پیاوی چاکە
فەرزان ئەداکە
دڵی زۆر پاکە
غەیبەتان ناکە
شەفاعەت دەکا

خوداش بەروحمە روحمان پێ دەکا
دەربارەی سەربردەی ژیانی ئادەم و حەوا کە چۆن شەیتان گەنمی دەرخوارد داون، مام سەعید دەڵێ:

شەیتان پەیمانی گرت لەگەر ماری
خۆی قایم کرد لەناو زاری
لەناو بەهەشت خۆی کرد دیاری
چووە کن باب ئادەم و داک حەوای
گوتی من پیاوێکی ئەمینم
ئۆ بارینگۆ لەگەردەنم
لوقمەک بخۆن لەدار گەنم
لوقمێک بخۆن لەو تەعامە
سوبحانەڵلا چەند بەتامە
هەندی بەرو پشت کردن
بەنەعلەت بێ لەرێی بردن
داری گەنمی پێ دەرخواردن
پێشان حەوا هەرخەرەتا
لۆیە ژن هەنوکەش عیبرەتە
بێ عەقلیان لەملی شەتا

هەروەها مام سەعید گەلێک شیعریشی دەربارەی ژیانی جوتیاران و تووە وەک دەڵێ:

زەمانەکەی گۆڕایە* چیتکە مەکەن کەندو کۆ
دنیا بەبێ بەرەکەت هەروەکی چێری کەندۆ
لۆیە جۆخین چ ناکە بیستی چار دەبا تاپۆ
حوشریش لەوێ راوەستێ ئەویش دووی دەبا لۆخۆ
هەقی سەپان دیارە لێیان ناکرێ ئاین و ئۆ
تێلەکێش و شەغرەکێش لۆ ویش بپێون کاکۆ
ئەدی زەکاتی شەرحی ئەویش فەرزە لەسەرەنگۆ
هێشتان زیاتر دەڕوا ئاین و ئۆین و مرومۆ
ئەی قور بەسەر فەلاحی لۆی نامینێ نان و تۆ
جرە جرو سیاسەت تا دەگاتە وەحدەی خۆ
ساحێب ملکان غارب عەمباریان بویتە کادین بنی سەدەو چیمەنتۆ
دونیا لەبۆوان خۆشە مام سەعید لەسەری مەڕۆ
ئەمان چونکو ئیسلامین شوکرو سابیرین ئەنگۆ
برێن خوایە رەحمت پێ کردین حەمدو سەنایە لۆتۆ
دونیای حیز دێو دەڕوا قیامەت قۆڵەو نابڕێ

کێشکە بێ لۆ کوندە بۆ

سەرچاوەکان:
دانیشتن لەگەڵ ئەم بەڕێزانە - حاجی حەمەد عەلی دۆڵەبەکرەیی/ خەڵکی گوندی دۆڵەبەکرە بوو مێژووی لەدایک بوونی ساڵی ١٩٢٤ مخابن لە ١٩ ـ ١١ ـ ١٩٩٦ کۆچی دوایی کرد - سابیر ئیسماعیل ناسر خەڵکی گوندی دۆڵەبەکرە تەمەن (٥٩) ساڵ. - رزگار مەجید نەجم خەڵکی گوندی باوەقوب تەمەن (٣٣) ساڵ. - محەمەد فەتاح خەڵکی گوندی باوەقوب تەمەن ٤٥ ساڵ.

